# دیوانی هەوری



شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی

هەولێر – ٢٠١١

**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوكردنەوە**

**بەڕێوەبەرایەتی بڵاوكردنەوەی هەولێر**

**ناوی کتێب: دیوانی هەوری**

**شاعیر: شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی**

**نەخشەسازی: محمد فیصل زەنگنە**

**پیت چنین: رزگار حەساری**

**چاپی یەكەم – چاپخانەی رۆشنبیری هەولێر/ ٢٠١١**

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٠٥٠) ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە

## ( چوارینە )

باوەگورگوڕ گڵپـــە دەکاو جەرگی دوژمن دەسووتێنێ
لاوی مـــەردی را پـەڕیـوە خـوێنی گـەشـی دەرژێـنێ

دارو بـــەردی ئەم خاکـە وا گڕێکـی گرتـووە ئـەمڕۆ
تیشکی ئازادی وا هەڵات دوژمنی گەوج دەتـۆقێنێ

دیوانی هەوری بەرزنجی

شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی

## بۆ وێنەکەم



سەیری وێنـــــــەکەم **بکەن ئازیزان**
بۆ یـــادگـاری بـمـــێـــنــێ **لاتـــــان**

بزانن دونیا بۆ کـــەس نامێـــــــنێ
ئەوەی هاتــــــووە دەڕوا بێگومان

-----------------------

# پێشەکی و سەرنج

## کەریم شارەزا

هـەوری بـەرزنجی ناسـناوی شـاعیری کلاسـیکی کـورد (عوبێـد شـێخ لـەتیف بەرزنجی)یە لە ساڵی ١٩٤٤دا لە گوندی (کەڵور)ی سەر بە ناحیەی پردێ لە پارێزگای کەرکووك چاوی ژیانی هەڵێناوە، لە باوەشی بنەماڵەیەکی ئاینی و زانسـت و ئەدەبپـەروەر، پـەروەردە بـووە شـێخ لـەتیف-ی لـوتفی بـاوکی، شاعیرێکی کلاسیکی بە توانا بووەو لەتەکیەکەیدا لەگەڵ دۆست و میوان و موریدانی بەزۆری لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی دواوەو (هەوری) هەرزەکاریش لەوساوە لەو کۆڕو ئەنجوومەنانەی باوکی مێشك و هۆشی بە ئەدەبی پتەو راهاتووەو بنەمای دروست بوونی شیعری لەلا خوڵقاندووە و بەهرەی شاعیریی چەکەرەی کردووەو وردە وردە شیعری داناوە.

هەر چەندە پلەی خوێندنی (هەوری) شاعیر زۆر نییەو تەنیا قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە.

بەڵام لە رێگەی زۆر خوێندنەوەی سەرچاوەی ئەدەبی و رۆشنبیری خۆی پێ گەیاندووەو جگە لە کوردی کەزمانی زگماکی خۆیەتی فێری زمانەکانی عەرەبی و تورکی و تا رادەیەك فارسی بووەو لە ئەدەبیاتیان شارەزایی پەیدا کردووە. لـە سـەرەتای شـاعیرییەتیدا کەوتۆتـە بـەر کاریگـەریی شـیعرە کلاسـیکییە پتـەوەکانی نـالی و سـالم و کـوردی و شـێخ رەزای تاڵـەبانی و لـوتفی بـاوکی و خادیم و ئەمیش لەسەر رێبازی ئەو شاعیرانە شیعری کلاسیکی هۆنیوەتەوەو چونکە شاعیری هۆشیارمان لەوە گەیشتووە کە شیعری کلاسیکی راستەوخۆ لەگەڵ هزرو عەقڵ دەدوێ و لە بیری مەعقوول لانادات و ئەو جۆرە شیعرانە بە دوای راسـتیدا دەگـەڕێن و راسـتیش لای شـاعیر لـە هـەموو شـتێ جـوانترەو تەنانەت ئەندێشەی شاعیریش دەبێ لە خزمەتی راستی و حەقیقەت دابێ.

(هـــەوری)یـــش شـــاعیرێکی خامـــەڕەنگینی کـــوردی دڵـــسووتاوی شـــاری باوەگوڕگوڕی دڵی کوردستانە، ئەو شاعیرەی لە خۆی گەیشتووە کە شیعر هەر روخسار نییە، بەڵکو روخسار ناوەڕۆکەو لە سۆزو ئەندێشەی دەروون و زەینی شاعیرەوە هەڵدەقوڵێ. (هەوری) شاعیر هەموو جۆرە رەگەزێکی شیعری کوردی بـەکار هێنـاوە، هـەر لـە وەسـف و لاواندنـەوەو نیـشتمانی و ئـاینی تادەگاتـە شیعری فێرکردن و سیاسەت و نیشتمانپەروەری و لە شیعری وەسف گەلێك نموونەی جوان و ناسکی لەسەر مانگەشەو و بولبول و پەپوولەو کوردستان داناوەو بۆ روونکردنەوە با لە هەر یەکێکیان چەند دێڕێکیان لێ بخەینەڕوو، شاعیر لە هۆنراوەی مانگەشەودا دەڵێ:

مانگە شەوێکی زۆر خۆشە
دونیا چەن کپ و خامۆشە

نەسیمی سەحەر بە نەرمـی
رادەمـــاڵی تـیـنی گـــەرمـــی

لە هۆنراوەیەکی دیکەیشدا بە ناوی (بوولبول من و تۆ) بە دەربڕینی ناسکی پڕ سۆزی دەڵێ:

بولبول من و تۆ هەردوو خـــەمبارین
هەردوو وەکـو یـــەك دڵ بریـنـــدارین
من دەنـاڵـــێـنـم لە دەس ئـــەم ژینە
تۆش بۆ رووی گوڵان جەرگت برینە

تاکو دەڵێ:
من خەمی خۆم و گشت کوردم هەیە
تۆش پیشەت هەردەم ناڵەو گریەیە!!
هەر لە وەسفدا شاعیری هەست ناسکمان هەست و سۆزی بەرامبەر بە بەری بەیان رۆژگارێکی نیشتمانەکەی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

بەری بەیانە، دنیا رووناکە
ئاسمان وەك دڵی ئاشقان پاکە

سروەی بای شەماڵ دەمەو بەیانی
هاژەی رووبارو قاسپەی کەوانی

چریکەی قومری و ئاوازی بولبول
نەشئە دەخەنە ناو قووڵایی دڵ

شاعیر لە وشەی سووك و سادە، مانای جوان دەخولقێنێ و بە سۆزی دەروونی هەندێ شیعری جوان و ئاودراو بە هەستی جۆشدراو بە ئەندێشەی قووڵی پێشکەش بە خوێنەران دەکات.
لە هۆنراوەیەکیدا بە ناونیشانی (بێ دەستم بگرە) بەم جۆرە چەند دێڕە شیعرێکی ناسکمان پێشکەش دەکات و دەڵێ:
بێ دەستم بگرە یاری پەری روو
وەك بولبول و گوڵ پێکەوە هەردوو
دنیا بەهارە خۆشە ئەو دەشتە
رازاوەتەوە هەروەك بەهەشتە !

دوای ئەم پێشەکییەی هۆنراوەکەی دەکەوێتە وەسفی خوڕڕەی ئاوو چریکەی کۆترو قومری کە ئەو ئاوازانە خۆشترن لە دەنگی نای لە کاتی گوێ لێبووندا و دەڵێ:

خوڕڕەی رووبارو چریکەی قومری
خۆشترن لە نای کاتێ گوێ دەگری!

دەشت و دەر هەمووی فەرشی رەنگینە
نێرگـزی چاومەســـــت لـە پێکەنینە!!

شـاعیر لــە دەربــڕینی پێکــەنینی نێرگــز، وێنەیــەکی چەســپاوی شـیعری خوڵقاندووەو بە هەستی بینین و بیستن وەردەگیرێ.
شاعیر لە هۆنراوەیەکی دیکەدا بە ناوی (خەیاڵ دەفڕێ) بەم جۆرە دەربڕینی ناسکمان دەخاتە بەرچاو و دەڵێ:

خەیاڵ دەفڕێ لەگەڵ شەماڵ
بەرەو هەوارگــەی لێوی ئاڵ

ئەو رێگە دوورە دەبڕێ زوو
گەلێ بە شەوق و ئــارەزوو!!

تامەزرۆی گفتوگۆی یـــارە
ئەو یارە شـــۆخ و نازدارە!

شاعیر لە هۆنراوەیەکی تر بە ناوی (چەرخی زەمانە) هەستی دەروونی خۆی بەجوانی دەردەبڕێ و بیرمەندانە هێزی خۆی بەرامبەر زەمانە دەردەخات و دەڵێ:

چەرخی زەمانە شێواندی ژینم
ڕۆژ و شەو لە ناو مەینەت و شینم!

لە هەموو لاوە مەینەتی ڕۆژگار
وەك سەیل دەبارێ بۆ منی هەژار

وەك گەڵای پایز کزو ڕەنگ زەردم
لە ناو غوربەتی دووچاری دەردم!

شاعیر لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا بە ناوی (ئاسمان بۆ دیسان خەم دەبارێنێ) تاقیکردنەوەیەکی شیعریی کردووەو بە دەربڕینی پڕ سۆز لە باری ژیانی گەلە هەژارەکەی خۆیەوە دەدوێ و بەم جۆرە دەست پێدەکات و لە کۆچی ماڵ ئاوایی بارزانی نەمرەوە دەدەوێ:

ئاسمان بۆ دیسان خەم دەبارێنێ
جەرگی ئەم گەلە بۆچ دەسووتێنێ؟

دیسان تەم ومژ ڕووی ئاسمانی گرت
داروبەردو شاخ گشتی خەم دای گرت!

ئینجا لە دوای ئەم پێشەکیەی هۆنراوەکەی دەڵێ:

چرای ئاواتمان گەش بوو کوژاوە
چونکە بارزانی کـــــردی ماڵئاوا!

تـــازە تـا دنیـــا ڕۆژی تیـــا مابـێ،
پیاوی تر وەك ئەو قەت پەیدا نابێ!!

شاعیر هۆنراوەیەکی دیکەی پڕ لە هەستی ویژدانی بەناوی (ئازیز ئەم عومرە) داناوەو لە ئەرك و ناسۆری ژیانەوە دەدوێ و بە دەربڕینی ناسك و پڕ سۆز هۆنراوەکەیمان پێشکەش دەکات و لە سەرەتادا دەڵێ:

ئازیز ئەم عومرە پڕ لە جەفایە
پڕ لە مەینەتی و دەردو بەڵایە
ژیان سەرانسەر تاڵی وسوێرییە
هەمووی هەر خەم و کوێرەوەرییە!

تا کەسێ شادی دەبینێ جارێ
لە هەزارلاوە خەم بۆی دەبارێ!

شاعیر لە چوارینێکی شیعری ویژدانی دا لە (ژیان)ەوە دەدوێ و دەڵێ جگە لە خەم و خەفەت و ئازار چی تری تێدا نییەو لەگەڵ تێپەڕ بوونی شەوو ڕۆژ عومریش بەرەو پێش دەچێ بۆیە وا چاکە مرۆۋ هێندە خۆی بۆ سامانی دنیا خەفەتبار نەکات و دەڵێ:

چی هەیە لەم ژینە تاڵە، غەیری ئازارو خەفەت
ـنۆشەو تێپەڕدەبن، عومریش دەچێ بۆ ئاخیرەت

قەت لە بۆسامانی دنیا خۆت مەخەگێژاوی خەم
ـزقی تۆ دیاری کراوە، بۆی مەبە قەت ناڕەحەت!

شاعیر لە شیعری نیشتمانی و سیاسیشدا بە توانایەو نموونەی سەرکەوتووی لەم بوارەدا پێشکەش کردووین و هەست و سۆزی خۆی راستگۆیانە دەربڕیوە. شاعیر لە هۆنراوەیەکی دا بە ناوی (کوردستان) لەجوانی خاکی کوردستان ئەدوێ و لە قالبێکی سادەو کێشی سووکدا هەستی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

کـــوردستان خاکت جوان و دلگیرە
هـــە تا سەیری کەی زۆر بێ نەزیرە

شاخی سەرکەشی قەندیل وەها لگورد
تــا دونیا ماوە جێی فەخرە بـۆ کـــورد

گـــەلێ دلـــگیرە هەر وەك بە هــــەشتە
ئــــەم کەژوو کیوو ئــــەم گـــردودەشتە
شاعیر لە هۆنراوەیەکیدا لە ڕێگەی خەباتی خۆیەوە دەدەوێ و هۆنراوەیەکی سیاسی بە ناوی (ئەو ڕێیەی گرتووم)ی پێشکەش بە خوێنەرانی کردووەو دەڵێ:
ئەو ڕێیەی گرتووم لەسەری دەڕۆم
تـا دەمگـەێـنێ بە ئـاواتی خـۆم

چەن رێگە سەخت ودووروخەتەر بێ
هەموو گریان و شین و چەمەر بێ

با ژینم هەموو زیندان و خەم بێ،
هەموو رووی دنیا تاریك و تەم بێ،

من قەت ناگۆڕم رێبازی ژینم
یا مردن لە رێی یاخۆ دەیبنم!

هەوری لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا بە ناونیشانی (تا خوێن نەرژێ) لە سەردمێکی سەختو تارێکی نەتەوەی کورد، کە بە عەرەب کردن لە کوردستانی باشوور بەوپەڕی توندی دەستی پێکرد بوو، دەبینین شاعیر زۆر شۆڕشگێڕانە دێتە مەیدان و بە دوژمن دەڵێ:

تا خوێن نەڕژێ وەکو لافاو
دەشت و سارا نەکا پاراو

تا کەلەپچەو قامچی دوژمن
دانەڕزێنێ جەستەو گەردون

تا نەسووتێ رەزو باخات
وێران نەکرێ خاکی وڵات

بەڕاستی شاعیر وەسفێکی کوردستانی سەردەمی کۆتایی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی رابوردوو راستگۆیانە دەکات کە بەعسی درندە چی خراپەوە ئەوەیان دەرهەق کورد کردووەو زیاتر لەسەر هۆنراوەکەی دەڕوات و دەڵێ:

تا دێهات چۆڵ و هۆڵ نەبێ
ژن و منداڵ کلۆڵ نەبێ

تا بڵێسەی باوەگوڕگوڕ
زیاتر نەبێتە گڵپەو گڕ!

تا میللەت هەموو بە یەک دەنگ
نەدڕێنێ پەردەی شەوە زەنگ

دوای ئەو هەموو قوربانی دان و گڵپەو گڕەی باوەگوڕگوڕو یەکگرتنی هەموو چین و توێژەکانی میللەت بۆ دڕاندنی پەردەی شەوە زەنگی ژیانی میللەتی ژێر دەست، ئینجا میللەت دەتوانێ ئازادی بە دەس بێنێ و دەڵێ:
چۆن ئازادی بە دەست دێنێ
گوڵی سەربەستی دەڕوێنێ !

شـاعیر لـە هۆنراوەیـەکی نیـشتمانیی دیکەیـدا بـە نـاوی (کـوردێکم دەویّ) هەلومەرجی کوردی خەباتگێڕ دەستنیشان دەکات و دەڵێ:

کوردێکم دەویّ یەك روو و یەك دڵ بیّ
لەهەموو دەوریّ پاك هـەروەك گوڵ بیّ

کوردێکـم دەویّ مـەردو خـۆڕاگر
هەرگیز نەگۆڕیّ دایم سەرچڵ بیّ

کوردێکم دەویّ خەمخۆری گەل بیّ
لـە هـەموو کـاریّ ژیـر و ئاقڵ بیّ !

شاعیر لە هۆنراوەیەکی سیاسی دا لە تێکۆشانی خۆیەوە دەدویّ و هەندیّ جار نا ئومێدی نیشان دەدات بەڵام هـەر کۆڵ نـادات و شیعرەکەشـی بە ناونیـشانی (گەلیّ تێکۆشام)ەو بەم جۆرە دەست پێدەکات:

گەلیّ تێکۆشام بگەم بە مەرام
چ بکەم زەمانە یارمەتی نەدام

ئەم چەرخە بۆ من نەسووڕا جاریّ
دایم پەرێشان، هــەر دەربەدەر مام
زۆرم چەشت ساردی و گەرمی لە ژیان
ئەم ســەرو ئەو سەر زۆر جێـگا گەڕام

زۆر قسەی ساردی ناحەزانم بیست
لەسـەر قەومی خۆم زۆر ئازار درام

شاعیر لە شیعری ویژدانیشدا گەلێك هەست ناسك و ئەندێشە قووڵە و بەمانەش هۆنراوەی پڕ سۆزی خەڵقاندووە لەوانە هۆنراوەیەکی بە ناوی (دڵ دەناڵێنیٚ) لە باری دەروونی خۆیەوە دەدویٚ و لە چوار خشتەکی سەرکەوتوودا ئەو هەست و سۆزانەی خۆی دەردەبڕیٚو دەڵیٚ:

دڵ دەنـــاڵێنیٚ هەروەك ناڵەی نەی
رەنگم گـــۆڕاوە وێنەی زەردە بەی
لە دنیا جاریٚ قەت نەم کرد ئۆخەی
نەم خـەم و دەردە نازانم تاکـــەی ؟

هەزار داخ لە دەس زەمـانەی بەدخوو
هەر بە ئاهی سەرد تەمەن بە سەرچوو
رۆژیٚ سـەد ئازار بۆ من دێنیٚ زوو،
هەروەك لافاوە خوێـنی دڵ خوڕڕەی !

بەراستی هەوری شاعیری شیعری چوارینە، هەر چەندە لەسەر دەستووری (دوو بـەیت) نەڕۆیـشتووە کـە سـەردانی نیـوە دێڕەکـانی یەکـەم و دووەم و چـوارەم هاوشێوەو هاوسـەروان بـەڵام سـەرەڕای نیـوە دێـڕی سـێیەمی رەهایـە، کەچـی لێـرەدا شـاعیر سـیٚ نیـوە دێڕەکـانی سـەرەتای چـوارینەکانی کـردووە بـە هاوسەرواو نیوە دێڕی هەموو چوارینەکانیش دەچنە سەر یەك سەروا، بۆیـەش دەڵـێم شـاعیری چـوارینە چـونکە لـە ناوەڕۆکـدا پتـەون و هەنـدیٚ جـار بـیرو لێکدانەوەیەکی قووڵ لە خۆ دەگرن و لە چوارینی دیکەیدا دەڵیٚ:

گەردوون شێواندی تانوپۆی ژینم
کز و پەککەوتە بێ توانا و تینـــم!
فەلەك بێزارە لە ســەدای شینـــــم
زەمانە بۆمن قــەت نـەبوو بـــزەی!
باخـچـە ژیـانـم گـەڵای زەرد بـووە
بەخـتم ئـاوارەی چۆڵ و هەرد بووە
جەرگم کون کونی زام و دەرد بـووە
جەستەم وەك مــردوو بـڕاوە وزەی!!

شاعیر لـە هۆنراوەیـەکی ویـژدانی دا بە نـاوی (فەلـەك تاکـەی) گـەلێك هەسـت و سۆزی دەروونی خۆی هونەرمەندانە خستۆتەڕوو، با بزانین چی گوتووە؟

فەلەك تاکە بنۆشـم شـەربەتی خەم
هەتاکەی هەر بپۆشـم بەرگی ماتەم
زەمانێــکە بـە رۆژ و شــەو لە زارم
لەدەس ئەم دەردە دایـم بێ قەرارم

رەقیب بۆخۆی لەشادی و پێکەنینە
منیش پیشـەم هەموودەم هەرگرینە

شاعیر شکاتی ناگوزووری ژیانی خۆی لەلایە فەلەك دەکات و لێی دەپرسێ هەتاکە ی شەربەتی خەم بنۆشێ و بەرگی ماتەم بپۆشێ کەچی دوژمن نا حەزی هەر لە خۆشی و شادیدا بیت و دوا بە دوای ئەمەش دەڵێ:

لەچاوم ئەشکی حەسرەت وادەباریٚ
وەکو بارانی نیســـــان دێتە خواریٚ
لەژێر باری خەما سووتا وجوودم
خەم و ناڵەی دڵم بۆتە سروودم!

لە خوێندنەوەی دیوانەکەی هەوری و وردبوونەوە لە روخسارو ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی گەیشتینە ئەنجامێك کە بڵێین ئەم شاعیرە پێی خۆی لەسەر زەمینەی شیعری هاوچەرخی کوردی چەسپاندووە و شیعری واقیعی لەسەر باری دەروونی خۆی بەرامبەر بە رووداوە پڕ نەهامەتییەکانی زەمانە داناوەو چوارینی پڕ مانایشی داڕشتووەو ناوەڕۆکی پتەوو روخساری جوانی بۆ کردوون بە تان وپۆ و هۆنراوەکانی ئەم دیوانەی هەوریی بەرزنجی شیاوی خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنن.

هەولێر ٢٠٠٨/١٢/٥
گەڕەکی رووناکی

# ( هەژاری )

هەژاری دەردت کـــــــووشـــندەو ژانە
زۆر کەس لە دەســــــــتی تۆ پەرێشانە
دەردێکی یـاخـوا هیــچ مـاڵێ نەگرێ
شادی و پێ کەنین لـــــە ناوی دەبرێ
هەژاری تۆ چیــــــــت فرمێسکی زاری
برســـــــــیەتی و خەفەت دێنی بەدیاری
روو لـــە کێ بکەی ژینی تاڵ دەکەی
هەردەم دەروونی پــڕ زووخاڵ دەکەی
باوك لـە ئەولاد خـــــــۆی بێزار دەبێ
رۆژی بێ ئارام ، شـــــــــەو بێداردەبێ
هاورێ لە هـــاوڕێ دەکـــەی بەدوژمن
زۆر کەس دەبــەیتە باوەشـــــی مردن
چەن پیاوی مەردت کردووە سەرگەردان
لـــە برســـا زۆرت خســـتـۆتـە گـریـان
زۆرخانەی شادیت کردە جێگەی خەم
بویتـە هـۆی جـەورو ئـازارومـاتـەم
هـەژاری گـەلێ جـــــــــەورت بە مندا
وەعدەی من و تۆ لای زاتـــــــــــی خودا

کەرکووک – ١٩٦٥

## ( خونچە جوانەکەی )

خونچە جوانەکەی روو بە خـــاڵەکەم
ئەی پەری شـــێوە چاو غەزاڵەکــــەم
بۆچی ئەوەندە مەست و مەغرووری
بۆمن هەر بوویتە مایەی رەنجووری
وەك سێوی سەردەشت جوان وشیرینی
خـۆت چـارەو دەوای دەردو بـریـنی

هۆی گوشــادی دڵ بینایی چـــاوم
تۆی مایەی مان و هەم هێزو تـــاوم
تـۆزێ بـەزەیـی بـە حـاڵــــی زارم
کەمن پەروانەی دەوری روخســــارم
رۆژوشەودوچار هەروەکوومەجنوون
هەردەم پەشێوو خەمگین ومەحزوون
(هەوری) جەرگی تۆ کــون کون وزامە
بـە تـیـری عـەشــــقـی ئـەو دلارامە

# (زرەی زنجیری دوژمن)([1])

- لە دەوروبەری کۆتایی ساڵی ١٩٦٥ی زاینی بوو باروودۆخی ئەو کاتە زۆر ناخۆش و نائارام بوو بە هۆی نامەیێکەوە لە سەرەوە هاتبوو بۆ بەندییەکانی بەندیخانەی کەرکووک ئەو نامەیە گیراو دەس بە حەبس تا گەیشتە سەر لیژنەی ناوچەی کەرکووک هەرچی هەبوو نەبوو هەر هەمووی کەوتە ژێر دەستی پیاوانی رژێم ئیتر ئەوانیش بە گوێرەی ئەو راپۆرت و پسوولەو لیستانەی کە لە ژێر دەستیان بوو ئەو خەڵکەیان دەگرت و بەو هۆیەوە زۆر کەس پێوە بوو لێپرسراوی ناوچەی کەرکووک کاک محەمەد حەسەن زێباری و کاک بەکر عەبدولقادر بە برینداری دەستگیر کراو مامۆستا محەمەد سەعیدو مامۆستا ئیبراهیم حاجی سەعید محەمەد سەلیم و قادر غەریب و مامۆستای شاعیر سەبری بۆتانی و جەوهەر عەودل و شوکر حوسێن و حوسێن عەسکەرو دەیان کەسی تر لە سەربازو ئەفسەری حەسەنێن و کرێکاری و کاسبکارو هەندێ لە پیاوانی ئایینی وەکو جەنابی شێخ عەبدولجباری شێخ مستەفا و چەندانی تر منیش لە رۆژی ١٩٦٥/١١/٥ی زاینیدا بە هەمان هۆوە گیرام و لە دوای چوار رۆژ لێکۆڵینەوە رەوانەی بەندیخانەی سەربازی ژمارە یەک کرام لە کەرکووک کە ئەوسا لە تەنیشت بینایەی قشڵەی ئێستاوە بوو لە کاتی وەرگرتنمدا نائیب زابتی ئینزبات (یونس) ناوی بوو کابرایەکی ورگنی قەڵەوی سمێڵ زلی رەزا گران لە زاڵمیدا بەناوبانگ بوو بەبێ ئەوەی سێ و دوو بکا شەرێکی کێشا بە سەرما بەبێ هیچ هۆیێ دەس بە جێ خوێن بەسەرما هاتە خوارەوە، منیش هەردوو دەستم لە ناو کەلەپچەیەو هیچ دەسەڵاتم نییە، هەر بە زمانی خۆیان وتی (ورتنا ویا هدولە ترسیە یومیە جیب سجین و دی سجین) دوای ئەو بە هەر حاڵ یەک دوو سەربازی هەندێ سەرمیان پێچایەوە دوای نیزیکەی سێ مانگ ئێمەیان گواستەوە بۆ بەندیخانەی (معتقل) لە ناو سەربازگەی کەرکووک لەوێ جێگەو مەعمەلە کردن لەگەڵمان ناخۆش بوو هەر لەو ماوەیەدا چەند کەسیان هێنا بە هەمان هۆوە لە دادگای سەربازی کەرکووک لەلایەن زەعیم عەبدولقادر خەفاف کە سەرۆکی دادگای (امن لیوای) بوو لە کەرکووک دەیان وت لە بنچینەدا لە بنەماڵەی خەفافەکانی سلێمانییە بەڵام پیاوێکی زۆر چاک بوو فەرمانی خنکاندنی دابوو بە سەریانا تا بڵێی لە ژێر چاودێری و توندوتیژیدا بوون منیش بەو هۆیەوە ئەم چەند دێرە شیعرەم بەدزیەوە لە رۆژی ١٩٦٦/٦/٢ی زاینی دا لە سەر رووی یەک دوو سەرە پاکەتدا نووسییەوەو پاشان لەبەرم کرد و پیشانی مامۆستا (سەبری بۆتانی)م دا زۆری بەلاوە جوان بوو وتی وەڵڵاهی چاکە دەستت خۆش بێ لەو رۆژگارەدا ئەگەرچی ژیانێکی زۆر تاڵ و ناخۆش دابووین بەڵام هیوامان زۆر بەرز بوو لە ناو چەند ژوورێک دا لە ناویەک دروست کرابوو حەبوویە بە رۆژی نیوەڕۆ گڵۆپ بسووتێ چونکە زۆر تاریک و ناخۆش بوو دەنا هیچت بەدی نەدەکرد و لە ئەنگووست چاو بوو لەو کاتەدا دوو کەسی تریان هێنا پیرەمێردێک و کوڕێکی لاو خەڵکی دێی

زڕەی زنجیری کەلـــــەپچەی دوژمن

یا ورشــــــەی پەتی قەنارەی گەردن

لام نادا لەســـــەر ڕێــگەی ئـازادی

یەك تۆزقاڵ تەئسـیر ناکاتە سـەرمن

دوژمن بادەســـــتی خۆی بوەشێنێ

خوێـــــن بڕژێنێ وەك دەریـــای بێبن

ناتوانێ هەســـتی ئازادی بســـڕێ

بە گولله سینـــە گەربکا کـــون کون

میللەت بیەوێ ژینی ســـــــەربەستی

بەردەمی ئاگـــــرێ شـــوورای ئاسن

---

(عەنەب) بوون لە ناوچەی هەڵەبجە حەمە سەعیدو مام غەریب زۆر ئینسانی چاك و دڵسۆز بوون ئەم پیرەمێردە پیاوێکی زۆر ژیرو دونیا دیدەو قسەزان و نوکتەچی و ڕووخۆش بوو پیاوێکی بالأبەرزی لاوازی کەم هێز بەڵام کانگای زانیاری و وریایی و زیرەکی و شارەزایی بوو چیرۆکی زۆر خۆش و بەتامی ناو شانامەی لەبەر بوو سەر گوزەشتەو ڕووداوی ڕۆژگاری ڕابردوو قسەی نەستەق و شتی زۆر سەیرو سەمەرەی بۆ دەگێرانەوە وامان لێهاتبوو هەر خوا خوامان بوو زوو شەو بێت لە بەر چیرۆکی مام غەریب بە ڕۆژیش بە زۆری خوومان بە نووستن و زەنگیانە چنین دابوو بە ڕاستی تا بڵێی تابلۆی جوان و نایاب و شتی سەیرمان لەو زەنگیانانە دروست دەکرد من و برادەرێکی شۆرجەیی لە بنچینەدا خەڵکی دیی خالۆبازیانی بوو قادر غەریب-ی ناو بوو هەمیشە لەیەك دانابڕاین زۆر دڵمان بە یەك دەکرایەوە چەند کەسی تریشمان لەگەڵ بوو کاك حوسێن عەسکەر لە کوردی مەهاباد بوو نیشتەجێی گەڕەکی ئیمام قاسم پیاوێکی زۆر گاڵتەچی و قسە خۆش بوو بەم جۆرە هێنامان تا کۆتای ساڵی ١٩٦٦ی زاینی لەم ساڵە سەرکردایەتی پارتی لەگەڵ حکومەتی عێراق و بەرێز سەرەك وەزیران عەبدوڕەحمان بەزاز لەدوای وتووێـژێکی زۆر لە ئەنجامدا ڕێکەوتن و بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیران بڵاوکرایەوە لەو قۆناغەی ئەوسادا شتێکی زۆر بە سوودو چاك بوو بۆ میللەتی کورد لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە لە دوای نزیکەی بیست و پێنج ڕۆژێ ئێمە کەوتینە بەر لێبوردنی گشتی لەگەڵ ئەو برایانەی فەرمانی خنکاندن درا بوو بە سەریاندا لە ڕۆژنامەی ڕەسمی ناومان بلاوکرایەوەو هەر هەموومان دەرگای بەندیخانەمان لێ خرایە سەر پشت...

ئەو گەلەی گرتی ڕێگـەی ڕزگـاری
گەیشـــتە ئاوات وەك مـەردی مەزن

هەردەبێ بڕوا شەوگاری دەیجـوور
نەرچێ هەتاوی ڕۆژی سـەرکەوتن

ئـەم گەلـەش ڕۆژێ دەگـا بـە مـەرام
کۆتایی هەردێ زوڵم وخوێن ڕشـتن

هەوری) تۆیش لەگـەڵ برایانی خۆت
قـەڵای زۆرداران وێـڕان کـە لـە بن

## ( سەیری ئەو دێیە )

سەیری ئەو دێیـــە ماڵ لە پاڵ ماڵە
بە راسـتی جوانــە وا لەو قەد پاڵە
لەپەنای شاخێ زۆر بەرزو سەرکەش
چوار دەوری گــرتووە گوڵ و گوڵاڵە
دیمەنێ پڕ لــە سروشـتی جوانـی
هەمیشە جێگەی سیحری خەیاڵــە
دامێنی کـانی و چەم و دارســـتان
ئاوی دێتــە خوار وەك زیوی قاڵــە
ئاوازی قومری و کەو بــەتێکـــەڵی
لەلایەکی تر ســـۆزی شمشـــاڵە
ئێواران قاڕەی بـــەرخ و مەڕو کــار
هەتاکو بڵێی خـــۆش و زووڵاڵــــە
(هەوری) ئەم شوێنە وێنەی بەهەشتە
لابــەری خــەم و مــەیــنــەتـی تـاڵە

# ( مانگه شەو )

مانگه شەوێکی زۆر خۆشه    دونیا چەن کپ و خامۆشه
نەسیمی سەحەر بە نەرمی    را دەماڵێ تینی گەرمی
هەرچی گیانداری کە هەیه    ئەوەی لەسەر ئەم ئەرزەیه
دەنگ و وزەی هیچ نامێنێ    شەوگار سامی خۆی دەنوێنێ
هەموو دەچنه ناو لانەوە    بۆ پشوو بۆ حەسانەوە
تەنها هەر منی بێچاره    بە درێژی ئەم شەوگاره
خەو هیچ ناچێته سەردیدەم    لە ناو دەریای خەم گیرۆدەم
هەر ئەستێرەم ئاشنایه    دۆستێکی زۆر بە وەفایه
ناگای لە ناڵەو گریەمه    هەر ئەو بە دایم هاودەمه
شەوگارم دەروا بەو حاڵه    ئای کە ژیانێکی تاڵه
کاتێ کە رۆژهات شەو نەما    خەم کۆ دەبێ لە سینەما
هەزارو یەك دەردو ئازار    رووم تێ دەکا لە چوار کنار
ئیتر بەم جۆره رۆژو شەو    ژیانێ وەك تاریکە شەو
سکالای حاڵ لای کێ بکەم    کەمێ تیمارکا دەردەکەم
(هەوری) مەگەر زاتی خودا    یەك قەترەیێ رەحمەت بدا

# (گوڵ پێکەنی)

گــوڵ پــێــکەنــی بــەیــانی
لــەگــەڵ نــەغــمــەی گۆرانی
پــەپــوولــە کــەوتە فــڕیــن
لەسەر رووی لالەو نەسرین
نــێــرگــز چــاوی هــەڵهێنا
خشــڵی زەردی لـە ســەرنا
رووی خــۆی نــوانــد گولاڵە
لـەگـەڵ ســروەی شــەماڵە
قــومری بــە دەنــگــی خۆشی
گــولان زەوی داپــۆشــی
دەشت و دەر گشــت رازاوە
بەفرو شــەختە تــوواوە
کانی و ئاو کەوتە جەریــان
ژیــاوە بــاخ و بێســتــان
خوڕەی کانی و ئاوی چــەم
لابــەری ئـــازارو خــەم
ســەروەرە وەرزی بــوهار
دەشــت و ســارا لالــەزار
بولبول دەخوێنێ بە کــۆڵ
بە شــەوقە وەنەشــەو گوڵ
دونیــا خۆشــی و دڵــگیرە
تــەنــها (هــەوری) زویرە
١٩٦٧/٨/٥

# ( ئەی بولبول )

ـەی بولبولی زۆر هەژار  بێزاری دەستی رۆژگار
ـۆچ وامات و خەمگینی  خەریك شین و گرینی
ـەستە بەیانی زۆر زوو  کەخۆر لەئاسۆ دەرچوو
ـگەڕێی گوڵ و گوڵزار  لەناو چەم و گوێی روبار
ـەڕە لەم چڵ بۆ ئەو چل  بخوێنە لەسەر ڕوی گوڵ
گوێ خەجاڵەت دەمێنێ  ئەو دەمەی تۆ دەبینێ
ـەوێنی دێرینی گوڵی  تۆ هەردەم لەسەر چڵی
ـخی دڵت بڕژێنە  پڕ بە دەم بچریکێنە
ـە سۆزو ئاوازی خۆش  دڵی عاشق بێنە جۆش
ـخوێنە زۆر بە هەوەس  مەچۆ ناو کونجی قەفەس
خۆزگایە منیش وەك تۆ  ئازادە بووم سەربەخۆ
ـۆ خۆم بەخۆشی و شادی  تاوێ بە دڵ گوشادی
چەن رۆژم دەبردە سەر  لەگەڵ دۆست و برادەر

کەرکوك – ١٩٦٧/٩/٢٩

## (ئازیز دەردەکەم) ([٢])

ئازیز دەردەکەم ســـەخت و گرانە
گیرۆدەم لــە نــاو جـــەوری زەمانە
بێ حالـم لە دەس چەپۆکی رۆژگار
مەینەت دەبارێ وەك تەرزەی بوهار
زۆر پەرێشـــانم بـــە رۆژو بـە شەو
وجوودم بێ هێز بێ خواردن وخەو
وەك گەڵای پایز زەرد هەڵگـەڕاوم
رووی لـــە نەمانە تـــواناو تاوم
وەك مار پێچە خـۆم بەدەم دەردەوە
لـــەم بیـابـان و چـــۆڵ و هەردەوە
هەر ساتێ ژینم لا بە ســـــاڵێکە
دڵ چاوەڕوانی یەك هـــــەواڵێکە
وام لەسەر بازگەی دەشتی قلیاسان
هەمیشە ماندو کەوتوم سەرگەردان
تاوێ لە تەدریب تاوێ واجیـبـات
گوایە خزمـەتە بـۆ خـاکـی وڵات
بێ یارو ئەنیس بێ دۆستو هاوڕێ

---

[٢] - لە رۆژی ١٩٦٧/٩/١١ی .ز. بوو تازە لە کەرکووکەوە رەوانەی سلێمانی کرابووین لەنزیك دێی قلیاسان جێگیر بوو بووین بەلای سەرچنارداا بەڕاستی ژیانی سەربازی زۆر تاڵ و ناخۆش و نا ئارام بوو بە رۆژو شەو هەراسانمان نەبوو بە دەس مەشق کردن و واجبات و نیش کردنەوە، بەڵام تەنها ئەوەندە هەبو کە چەند هاوڕێیەکی دڵسۆز پێکەوە بووین ئەوەندەی ماوەمان هەبووایە نیتر هەر خەریکی نوکتە وتن و قسەی خۆش بووین و ناگامان لەو رۆژگارە نەبوو منیش ئەم پارچە شیعرەم لە رۆژی ١٩٦٧/١٠/٧ی.ز. لە سەربازگەی قلیاسان وتووە.

ـزانم هاوار بەرم بۆ لای کێ

کەس نییە تۆزێ یارمەتیم بدا

وەك برایی چاك کوا دەبێ پەیدا

ەرچی دەبینی خەمی خۆیەتی

ەس ئەم ژینە هەر ڕۆژۆیەتی

هیچ پەنا نییە بێجگە پەنای خوا

ئەگەر هەر لای ئەو پەیدابێ دەوا

ـسا دەخیلە ئەی پەروەردگار

تکەی بنالم لە جەوری ڕۆژگار

بارم گرانە دەردو ئازار بەس

شەو ڕۆژ فکرم وا لای یەم و بەس

هەوری) ڕزگارکەی لەم عەسکەرییە

پڕ لە ئازارو دەردی سەرییە

## (ئەی پەپوولە)

ئەی پەپوولەی رەنگاورەنگ     چەن جوان دەفڕی بەبێ دەنگ
لە کوێ گولێ جوان هەبێ     لەوێ دەکەویە ئاهەنگ
زۆر هێمن و لەسەرخۆی     دوور لە شەڕ و هەراو جەنگ
روح لەبەرێکی بێ وەی     تا بڵێی جوان و قەشەنگ
بۆ کوێ مەیلت بێ دەفڕی     باڵ رەنگینی شۆخ و شەنگ
هەمووکەس تۆی خۆشدەوێ     لێت ناگرێ رەخنەو نەنگ
خۆزگأیە منیش وەك تۆ     قەت دونیام لێ نابوو تەنگ
دونیا لای من زۆر تاڵە     ژیینم هەروەك شەوەزەنگ
(هەوری) هەمیشە خەمگین     دەبینی گێژو دەبەنگ

# ( ئەو كیژە )

ـەو كیژە گەلیّ ناسـك و جوانە
بۆمن سەرچاوەی شادیی ژیانە
بالاّی هەروەكو سـەرو چنارە
چاوی ئەسـتێرەی بـەری بەیانە
ڕوومەتی هەروەك گولاّلە سوورە
ـێوی ناسـكە زۆر ئالّ و جوانە
بەلەنجە وەكو كار ئاسكـی چینە
ئاشـنا بوونی گـەلیّ گرانە
یەك دیدارێكی بۆ منی هـەژار
ـەرمـانی دەردو ئـارامی گیـانە
گەر بێتوو ساتیّ لە چـاو بزر بیّ
دونیا لەلای من چەشـنی زیندانە
خۆزگە سەروە تی قاروونم دە بوو ([٢])
دەمـدا لە ڕێگەی ئـەودا هـەرزانە
لەجوانیو ناسكی قەت هاوتای نییە
مـانـەنـدی كەمـە لـەم دەورو بـانـە
هەزارانی وەك (هەوری) دەنـالّیّ
بە غەمزەی چاوی زۆر پەرێشانە.

[٢] - قاروون دەوڵەمەندێكی سەردەمی حەزرەتی موسا پێغەمبەر بووە بووە بە دوژمنی موسا، خواش ماڵ و سامانەكەی نوغرۆ كرد وە. ١٩٦٨/١٠/٤

## (ڕەواندووز)

ڕەواندوز خۆشە بـاخ‌وشاخ‌و دەشتی
ڕەواندوز هەروەکو باخی بەهەشتی
ڕەواندووز جێگەی پاشـــــای کۆرە
کوڕی ئازاو دلـێرو مـــــەردی زۆرە
ڕەواندووز کیژەکانی چەشنی حۆری
دەپۆشن بەرگی کوردی جوان‌وشۆری
ڕەواندووز مایەی شـادی و سروورە
کەخاوەن مـێژوویێ زۆرکۆن‌و دوورە
هەموو چوار دەوری باخ و دارســتانە
تریێ‌و هەرمێ وەکو هەنگوینی شـانە
ڕووباری هەروەکو جۆگەی بەهەشتە
لەسەردا دێی بەرەو ئەوکێوو دەشتە
هەوایێ فێنك و ســـــاردی بەهاوین
بوهاری پڕ لە لالەو بۆنی نەســــرین
چ خۆشە کۆڕەك‌و هــندرێن و بێخاڵ
پڕی گوڵزارو لالە لەدەشـت‌و قەدپاڵ
لە (کاولۆکان) هەتا ناوەنـدی شـاری
هەموو ڕازاوە گشت باخـچەو دیواری
لە ئاوی ساردو ســـــاقی هەر بنۆشە
هەتا باسی بکەی دڵگیر و خۆشـــــە
ئەتۆش (هەوری) خەمی دونیا بەباکە
لـــەمەودا ڕوو لـە گوڵـــزاری چیـاکە

ڕەواندووز – ١٩٦٨/١١/١٧

## (رشتەی ژیانم)(٤)

ـتتەی ژیانم تێکچوو سەر لە نوێ (٥)
ـر ـە کوێ و خاکی ڕەواندووز لەکوێ
ژیانێکی هەموو دەم ســەخت و ناخـۆش
لە(حامیە)کەوتووم وەك گێژو ســەرخۆش
ـە ڕۆژ ئیش کردن و تەدریبە پیشـــەم
ـە شـــەو بێدارو خەو ناچێتە دیــدەم
کە ئینزار لێ دەدا زوو کـــــاکە (هندال)
دەبێ خێرا لەبەر کـــەی بەرگ و پۆستاڵ
ـە یـشان بانگ دەکا بۆ چایی و شۆربا
ـحەر چوار لاوە جوندی دڵی وەکو با
لەدوای نانی بەیانی گشـــت بە تــەرتیب
دەبێ ئامـــــادە بی بۆ مەشق و تەدریب
ـیتر ئەم بەزم و ڕەزمە بــــــەردەوامە
کە وەستانت نییە وەك بەردی دامـــە

---

ـە پـرچە شیعرە باسی دەوری ژیانی سەربازیم دەکا کاتێ کە لە ( حامیە )ی رەواندووز بووم زۆر حاڵ و گوزەرانم نـاخوش ـ تـاـ ـوو وەرزی زستان و ناوو هەواییکی گەلێ سارد هەمیشە لە جیاتی باران هەر بەفر دەباری شـەختەو زقـووم عـەردو ـەـتو ـەستا بوو دەشت و شاخەکان کراسی سپی زیوینی لەبەر کرد بوو ئەوەندە جوان بوو هەروەك بووکێکی شۆخ و شـەنگ حیر ـعنوعند دڵ پێ گەش دەبۆوە، زۆر بە کەمی وشکاییت بەدی دەکرد هەموو شتێ سـپی دەکـردەوە سـەرەرای ئـەم هـەموو ـدـو ـەرمایە ئەم بەفرو تۆفانە دەبوایە هەموو بەیانیانی ریش بتاشی و پۆستاڵ بۆیە بکەی، جل و بەرگ پاك و ریـك و ـیـ ـی ـبەینانیشی لە ژێر تـارمەی قـاوشەکان مەشقیان پێ دەکردین لێپرسراوی وەحدەکەمان ناوی ( هنـدال ) موکەلـەف ـەنکی عیمرە بوو لە باشووری ولات، پیاوێکی بالابەرزی رێك و پێك زۆر حەزی لە گورج و گۆلی سەربازی دەکـرد، بـەلام ـیـد ـەربـەزە کوردەکانی خۆش دەویست و رێزی دەگرتن لە کاتی نووسینی ئەم پارچە شیعرە لە ١٩٦٨/١٢/٢٦ لە حامیـەی ـچـوـوز کاك عەریف بەکر خەڵقی سلێمانی بوو پێکەوە دانیشتبووین وتی ئەرێ شێخ عوێند ئەوە چییە تۆ هەر خـەریکی ـەـرکی ـشتەو شیعر نووسینی ئەوە تۆ چۆن وەرز نابێ ئەوەندە دەنووسی.

ـتـە ـەیتی یەکەم لەسەر وەزنی (١٠) برگەییە بەلام ئەوانی تر هەموو (١١) برگەییە تا کۆتایی شیعرەکە.

برا بەم جۆرەیە شـێوەی ژیـــــــانم
چ سودێکی هەیە لەم ژینە مانـــــــــم
وەکـــوو گیانێکی بێ رووح وایە ژینم
هەموو عـالـەم بە قەد یەك جۆ دەبینم
بە لەحزە شـــــــادی نابینی لە لای من
دڵم پر خوێنە جەرگم گشــــتی کون کون
ئیتر تەئسـیـری کوا ئاوازی بولبول
وەیا سـەیری وەنەوشەو نێرگزو گوڵ
ئەگەر دونیا سـەرانســـــەر لالـە زاربێ
وەیاهەرچوار فەســـڵ چەشنی بوهاربێ
بە تۆچی (هەوری) وا دوری لەخۆشی
هەمیشـــە تۆ کە بادەی خەم دەنۆشی

## (چاوەکەم ئەمڕۆ)

چاوەکەم ئەمڕۆ من زۆر خەمبارم
وەرە بڕوانە شێوەی رووخسارم
هەمیشە کزو پەشـــــێوو زەبوون
لەم ژینە گەلێ پەســــــت و بێزارم
بێتۆ شەو خەفەت لە دەوروبەرمە
بەجۆ کەس نەبێ بە حـــاڵی زارم
سەرەڕای هەموو ئەم دەردو خـەمە
کەچی بێ مەیلە شــۆخی نــازدارم
ئەو ڕۆژەی بۆمن مایەی شادی بوو
هەروەک گوڵاڵـــەی وەرزی بوهارم
کەچی بێوەفا دەرچوو لەراست من
دەرهــەق بــە ئــاهی دڵەی هەژارم
هەتای بۆوەسڵی یاری خونچەروو
ئەبێ گــیـــرۆدەی نـــاو شین‌و زارم

## (چیرۆکی مام ڕێوی) ([6])

ڕێوی هەبوو زۆر فێڵبـــــاز و گەڕ
لەگەڵ شێرێکا بـــــوو بە برادەر
شـــێرە هەموو ڕۆژ نێچیری دەگـــرد
دەگەڕاوە لای ڕێـــوی دەســـتو برد
خۆی تێری دەخوارد ئەنجا لەدوایی
ڕێـوی تـــاویـــدا زۆر بە ئـاســایی
وای لێهات ڕێوی تەواو مەغروور بوو
کلکی زل، پشتی پانو ئەستوور بوو
لەســـەر کـــەنداڵی بەیانیانی زوو
ڕێوی وەســـــتا بوو دڵ پڕ ئارەزوو
کاتێ کە ڕوانیو ســێبەر خۆی بینی
خۆی هاتە پێشچاو زۆر بە سەنگینی
وتی من وەهـــــــا بە هێزو توانام
لەم دارســـــــــتانە هەروەکو ئاغام
بۆچی هاوڕێیەتی ئەم شـــێرە بکەم
نۆکەری ئیتر ناکەم بە پیـــــــــشەم([7])
نیوەڕۆ کاتێ شـــێر گەڕایـــــــەوە
گەلێ ماندووبوو پـــــــاڵی دایەوە

---

[6] - لە ڕۆژی ۱۹٦۹/٥/۷ لە سەربازگەی چەمچەماڵ وتراوە

[7] - نۆکەر، خزمەتکار

وتی مام ڕێوی هەســـــته لەو شوێنه
وەك بـرا تـۆزێ پشـــــتم بخـورێنـه
ڕێوی به دەنـــــــگی بەرزەوە وتی
شێر من قەبوڵ ناکـــــــەم مەینەتی
ئاراستەم نەکەی ئەم جــــۆره ئیشه
منیش شێرێکم وەك تــــۆ هەمیشه
شەوێ من بۆ ڕاو دەچـــم ڕۆژێ توو
[illegible] بەسەر چـــوو دەوری رابردوو
شێر وتی باشـــــــه لەمڕۆ به دواوه
مــن ڕازیم بـــــــەوەی بڕیارت داوه
دە ڕێوی هەســـتا بەیـانی زۆر زوو
کاتێ کەوا خۆر لـــه ئـاسۆ دەرچوو
ناچار کەوته ڕێ زوو به دەست و برد
دەیوت من بۆچی وا خۆم دووچارکرد
[illegible]ـتی بوو به تووش کـاروان و بارێ
[illegible] ڕێچکـه ڕێوه دەهـــاتـه خوارێ
چەن کەڵەشێرێ لەسـەر پشت هێستر
ڕێـــوی کـه بیـنـی تـــاوی دا ئـیـتـر
[illegible]نجی نیشـــته ســەری بەتەکان
[illegible] کوتەکی چاکیـــان پێگەیان
ڕێوی قوچاندی به دەشـــــت و هەردا(٨)
دوو لاقی تری بۆ خــــــۆی کرد پەیدا

---

[illegible]: رایکرد

گەیشتە لای شـــێر خێرا زووبەزوو
ڕەنگ هەڵبزرکاو پەشـــێوو ماندوو
هەر لە دوورەوە وتـــــــی بە قوربـان
برا بچووکی تۆم وەکـــــــوو جاران
من کردم دەخیل تۆ مەیـــــکە کاکە
چونکە بێ گـــومـان تۆ دڵت پاکە
هەر کەس وەك ڕێوی لە خـۆبایی بێ
دەبێ ئاخیری هەر ریســــــــوایی بێ
ئەوەی لە تــواناى خۆی بچێتە دەر
بێگومان هەروەك ڕێــوی دێتە سەر

## (بیٚ دەستم بگرە)

ی ـحســـتم بگرە یـاری پەری روو
ـمت بولبول و گولٚ پێکەوە هەردوو
دونیا بوهارە خۆشـە ئەو دەشــتە
رازاوەتەوە هــەروەك بــەهــەشـــتە
حێرا بپۆشە بەرگــی ســوورو زەرد
ـ ـنٚ دەربێنە کـــەمی داخــو دەرد
رووبکەینە سارا ناوگـــولٚ و گولٚزار
لامــان نــەمێنیٚ مەینـــەتی رۆژگار
حوڕەی رووبارو چریکەی قومری
خۆشترن لەنای کـاتیٚ گویٚ دەگری
سەیری دیمەنی ئەو دەشـت وکێوە
ســڕی قـودرەتی یـەزدانـی پێـوە
ـحشت ودەر هەموو فەرشی رەنگینە
ـێرگزی چاومەســــت لە پێکەنینە
لە نــاو ئەو مێــرگ و مێــرخوزارانە
پۆل پۆل خەریکی شایی وسەیرانە
هەوری) ئەم بەزمــە هەتا ئێــوارە
بەبیٚ راوەستان هــــەر بەر قـــەرارە

## (برادەر وەرە)

برادەر وەرە دەستی یەك بگـرین
بۆ بەرژەوەنـــدی یەکتری بمرین
بۆ سەربەخۆیی خاکی نیشـتمـان
فیداکەین سەرو روح و ماڵ گیـــان
چەندەها ساڵە گشت دەناڵێنین
هەموو زامارو جگەر پڕ خوێنین
هەردەم لە شـین و گریـان وزارین
هەراسانی دەس پەنجەی رۆژگارین

برا فرسەتە با هـــــەموو هەستین
دەمێکە لەناو مەینەتـــــا مەستین
با هەڵکەین چرای روونـاکی بۆ کورد
تیمارکەین زامی سەختی دەست وبرد
بێ فەرق و تەمیز هەموو بەیەکدەنگ
بدڕین پەردەی تاری شـــەوە زەنگ

١٩٦٩/٥/١٦

## (دڵ لەبەر عەشقی)

[illegible] عەشقی ئەو بەڵــــەك چاوە
[illegible] بە شەو خــــەم دەوری داوە
باڵا بەرز و جوان هەر وەكــوو نەمام
لە حەسرەت دووری شــێواوم تەمام
[illegible] و شەنگە كوڵمەی سورو ئاڵ
[illegible] كـە و انی چاوی گەش و كـاڵ
بەیەك نیگاهی جەرگی لەت لەت كرد
عەقڵ و شعوورو سەبری هەمــوو برد
[illegible] ـەكەی وەك خونچەی ســـوورە
[illegible] عشــق مأیـەی ســــروورە
وەك تەیری غەریب كەوتمە نێوداوی
گەردن بلووری و ئـەگـریجەی خاوی
[illegible] هەژار هەر جێگەی خــەم بوو
[illegible] ـازار و ئـێـش و ئەلــەم بوو
جاریّ لێم نەدی گفتوگویّ شـــرین
یا وشەییّ خۆش دەم بـەپێكەنیـــن
[illegible] تا مـــــاوە ژینت لەدونیا
[illegible] بنۆشـە بۆ خـــــۆت بە تەنیا

## (بۆ جوانه مەرگیٚ)([9])

خونچەییٚ گەش بووم لەباخچەی ژیان
رەشەبای گەردوون زوو هەڵمی وەران
ئەی فەلەك یاخوا ماڵـــــت ویٚران بیٚ
جەرگی هەزاری وەك منـــــت برژان
چەن تووله نەمام لاوی خـــیٚر نەدیو
رەگ و ریشـــەیت لــــەبن هەڵتەکان
زۆرت به ناحەق خەڵتــانی خویٚن کرد
ماڵی چەن کەست بەهەوەس سـووتان
چەندی نازدارت پەراگـــــــەندە کرد
ژیانی هەموو هــــەر ئـــــازارو ژان
چەن پیاوی زاناو زیرەك و هۆشـــیار
ناڵەی دەروونی وەك هەوری نیســـان
(هەوری) هەر وایە رەوشتی گەردوون
هەتا سـەر بۆ کـەس نـەبووە بیٚگومان

[9] - ئەم پارچە شیعرە بۆ جوانە مەرگیٚ وتراوە لە ١٩٦٩/١١/٧

## (چرای ڕووناکی)([10])

ـى باوكى كوردانە — چرای ڕووناکی ژیانە
ـتى هەژارو بێ كەسە — بۆ کورد ئەومان هەبێ بەسە
ـو ڕێ پیشاندەرە — هەموو کاتێ هەر ڕابەرە
ـو جێگەی فەخرە بۆ کورد — لە هەر کوێ بن درشت و ورد
ـسالە ئەم کەڵە پیاوە — بێوچان پشووی نەداوە
ـجی داو کوێرەوەری — بۆکورد کێشای دەربەدەری
ـوەوە تا باپیرەی — ئەمە بووە کارو پیشەی
ـی بە گشت عالەم ناساند — تەوق و قەیدی دیلی پساند
ـی کوردی قوڕ بەسەر — خواردنی بوو خوێنی جگەر
ـگی زۆر تووش و نەهات — کاتێ بەسەر کوردا کە هات
ـەرژا سەر برا — چەندێ بە ناحەق سەر برا
ـوە قەت نەڕژاوە خوێن — مەگەر ڕۆژی قەتلی حوسێن([11])
ـیەی حەمدی خوداوە — ئەوانە هەموو سڕاوە
ـکە ڕۆژی شادییە — میللەت هەمووی لە خۆشییە
ـۆزەو دونیا گوڵزارە — شایێ و سەیران و بوهارە
ـێ کە کورد گشتی یەکە — خاوەن سوپاو هێزو چەکە

---

ـە میژوویەکەی یانزەی ئازاری پیرۆزەوە ئەو ڕۆژەی کە مزگێنی سەرکەوتنی بە هەموو کوردی جیهان بە ـی عێراق بە تایبەتی ڕاگەیاند لەو ڕۆژەدا لە هەموو لایەکی ئەم وڵاتە بوو بە شایی و خۆشی و ناهەنگێڕان ـیەتی و تەبایی و خۆشەویستی باڵی بەسەر ئەم وڵاتەدا گرتەوەو ئاسۆی ڕوناکی لەمیللەتی کورد بە دەر کەوت ـعر وەیەم بەو هۆیەوەو لە ۱۹۷۱/۳/۲۳ی ز. وتووە.

ـیە کە ئیمامی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلی تیا شەهید کرا لەلایەن سوپای یەزیدی کوڕی مەعاوییەوە کە لە ـەتە کەربەلا بەو ڕۆژە دەوترێ (عاشورا).

پێشمەرگەی مەردو بەشەرەف
ئاگادارە لــــە چوار تەرەف

دوژمن لەکوێ دەسـتی بێنـێ
رەنگ و ریشـەی لەبن دێنێ

بە رۆژو شەو بۆ کوردسـتان
گشـت ئامادەن بەبێ وچـان

خەوو خواردن و ئیسـراحەت
هەموو دانـاوە بۆ میللەت

بژی کــوردو رۆڵە ی مەردی
هەم مێژووی جوانوبێگەردی

بە خوێنی شـەهیدی نـەمر
ئەم حقووقەی کرد مسۆگەر

بمێنێ بـارزانی بۆ کورد
وەکوو لوتکە چیای هەڵگورد

## (کوردستان)

کوردستان خاکت جوان و دڵگیره
هەتا سەیری کەی زۆر بێ نەزیره
شاخی سەرکەشی قەندیل و هەڵگورد[12]
تا دونیا مـــاوه جێی فەخره بۆ کورد
خۆ پیرەمەگروون پیری زەمـــانە
سەرچاو دوژمن بووه بەتـــانە
رووباری گەورەو دەشـــــتایێ زۆره
دیمەنی جوانی بە هــــــەزار جۆره
هەموو بستێکی ئەم خاکە جوانە
پـــاراوی خـــوێـــنی پیـــرو لاوانە
بۆیە گوڵاڵەی وا رەنگی ســـــووره
بۆ دڵی خەمگین مایەی ســـرووره
هەموو وەرزێکی زۆرخۆش و جوانە
یەك لەیەك زیاتر دڵ بۆی حەیرانە
پایز روخســـاری زەردی دڵـــگیره
بۆن نمەی باران چەشنی عەبیـــره
زســـتان کە بەرگی ســـپی بۆ شیوه
هەر دەڵێی بووکەو خشڵەکەی زیوه
بوهاری هەموو هەر گوڵستانــــە
سەیری دیمەنی مایەی ژیانــــە

---

١٢ - قەندیل و هەڵگورد دوو چیای سەرکەشی کوردستانن.

هاوینی هەمـــــوو پڕ رزق و میوە
هەژار کراسی شــــادی پۆشـیوە
روو لەکوێ بکەی جێگەی سەیرانە
هەموو کـانیاوەو هـەر دارسـتـانـە
گەلێ دڵگیرە هەروەك بەهەشـــتە
ئەم کەژو کێوو ئەم گردو دەشــــتە
بەڵام داخەکەم چی بکەم بێ کەسە
سەدەها ساڵە دیلە و ژێر دەســــە
خاکەکەی کانـگای ئاڵتوون و زیوە
بۆیە نا حـــــەزان خوێنیان مژیوە
پێویســتە ئـەمـڕۆ ئاگاداری بـــن
لە کەیدو شەڕی بەدکاری دوژمـــن
(هەوری) شیعرەکەت گـەلێ جوانە
دیارییە و پێشکەش بە لاوەکـــانە

١٩٧٠/٤/١١

# (کاکی بۆرجوازی)

جۆنی کاکی بۆرجوازی ... ئەمە لەم ژینە رازی
گەلێ بە دڵتە دیارە ... هەردەم وەکو بوهارە
مودك سەرمایەداری ... نە زۆر رووت و هەژاری
ژیانی مام ناوەندی ... هەموو کاتێ ئەفەندی
زانی گەرما چییە ... ئاگات لەسەرما نییە
ە خەم و خەفەت دووری ... هەردەم شادو مەسروری
ەرۆژ پیاسەی بازارە ... بەشەو یاری و قومارە
کرینی گەراج و دووکان ... سووك دەهاویتە گیرفان
ەیەر دەخۆی دەخەوی ... هەتاکوو خۆر دەکەوی
موەك رەنجبەری هەژار ... ژیانی پڕ لە ئازار
ایم ئارەق دەرژێنێ ... تا نانێ بە دەس دێنێ
ناوەستێ رۆژ و شەو ... تا چاوی دەچێتە خەو
هەوری) بۆ خۆت بناڵە ... چیت داوە لەم خەیاڵە

## (یادی یەکی ئایار)([١٣])

پیرۆز بێ جەژنی چینی کرێکار
جەژنی رەنجدەران سەپان و جوتیار
لە هەموو جیهان سەرانسەر تەواو
شادی و سەیرانە لە یەکی ئایار
دڵ ئازادییەو خۆشی و پێکەنین
گوورزێ گرانە بۆ سەرمایەدار
بەداس و چەکووش بەزۆری بازوو
بەرهەم دەهێنن بۆ گەلی هەژار
هەرساڵی جارێ ئەم جەژنە خۆشە
گشت یادی دەکەین لەدەشت و لەشار
بشەکێ ئاڵای چینی زەحمەتکێش
لەکارگەو کێڵگەو لەسەر ئیشوکار
بڕوخێ قەڵای سەختی زۆرداران
ناوی نەمێنی لە سەر رووی رۆژگار

[١٣] - بەبۆنەی جەژنی کرێکارانی جیهانەوە ئەم پارچە شیعرەم لە ١٩٧٠/٥/٢ی.ز وتراوە

## (چەن ساڵە)[١٤]

چەند ســــاڵە کوردی دڵ پڕ لە ئاوات
لە تێکۆشـــــــان بوو بۆ بەرزی وڵات
زۆر خوێنی ڕژان لەم ڕێیە سـەختە
هەر بەردەوام بوو لەهەوڵ و خەبات
زۆری دی ڕۆژی تووش و تەنگـــــانە
بەڵام ڕاوەستا بە عەزم و سوبــــــات
سەردەمێکی زۆر ناو گێژاوی خەم
کەس نەبوو کــەمێ یارمەتی بدات
قەت کۆڵی نەدا لەڕێی تێکۆشـــــــان
گەلێکی بینی ڕۆژگـــاری نەهــــــات
کۆت و کەلــەپچە و پەتـــی قەنارە
شانازی پێوە دەکـــرد وەك خەڵات
جوامێری و مەردی هەردەم دیاربـــوو
مێژوو شاهیدە بە بەڵگە و ئیســـپات
زۆر تەقەلای دا دوژمـــنی نامــەرد
کە بێهوودەبوو وەك ڕێوی هـــەڵات
چەن نسکۆی گەورە هاتە ڕێی کەچی
وەك مـــەردی دلێر گـــەیی بـــە ئاوات

[١٤] - بە هۆی جەژنی نەوروزو یادی ئازاری پیرۆزەوە لە ١٩٧١/٣/٢٢ وتراوە.

مۆژدەتان لێ بێ ئـــــەی برایانم
ئەمڕۆکە ڕۆژی ئازادی هــــــەڵات

نەورۆزو ئازار دوو بووکی کــــوردن
بۆمـانیان هێنا مــزگێنی و خــــەڵات

دەورانێ گەلێ خۆش و گوشــــادە
لە هەموو شوێنێ لە شـارو دێهات

(هــەوری) ئـەمڕۆکـە ڕۆژی شــادییە
لای هەمو کوردی وەك جەژنــی بەرات

# (رۆژی گەل)

ـەی گەل هەموو گەورە و بچووك بەرانبەر هێزی چاو چنووك
جینی چەوساوەی کرێکار ئەی رەنجبەرو پالاو جوتیار
ـوەستتن وەك مەردی دلێر بۆ مافی خۆتان وەکوو شێر
ـە ژیاندا یەك نەفەسیٚ مل کەچ مەکەن بۆهیچ کەسیٚ
ـەرمایەدار لۆرتی و ورگزل ئۆبالی ئەم گەلەی لەمل
حوی بەرگی چاك نانی چەور خەلکیش لە ناو دادو جەور
ـارەی زۆرو ژنی جوان گەشە هەروەك دار ئەرخەوان
ـوری نادا لە برای خۆی یەك زەرە سوودی نییە بۆی
هەژاریش رەنگی سیس و زەرد دەروونی پڕ لە داخ و دەرد
ئەنجا تۆش ئەی برای هەژار هەموو بەیەك دەنگ و قەرار
مەعلوومە کە مەردو ئازای بڕووخێنە کۆشك و سەرای
ـەو ملهوڕی گێژی دەبەنگ ژینی لیٚ بکە شەوە زەنگ
تۆلەی چەن سالاٚن لەمەوبەر لە گازی پشتی بێنە دەر
تا دەرکەویٚ تیشکی سەرکەل بوهاری لالەزاری گەل
زەردە خەنەی لێوی منالٚ نەمێنیٚ شین و نالە نالٚ
ئەنجا بدەن پشوو وچان بەرەو ژیانێکی یەك سان
میللەت بە خۆشی و ئازادی رۆژگاری بڕوا بە شادی
ئاوەدان بیٚ ئەم ولاتە جێگەی شانازی و ئاواتە
(هەوری) تۆش بگرە فەرمانت لەگەلٚ دۆست و هاوڕێیانت

١٩٧١/٩/١١

## (بەو نیم نیگاهەی)

بەونیم نیـگا هـــــــــەی دڵ بریندارە
ڕۆژوشەو هەردەم لــــــــــەشین و زارە
تۆزی ناســــــــرەوێ زامی دەروونم
سارێژ بێ لە خـــــەم زۆر بێقەرارە
هەردەم گیرۆدەی جەوری دونیای دوون
دەردو تـــالأوی ئـــەم ڕۆژگــــــارە
وەك گوڵی تینوو ســـیس و ژاکاوم
ژیــن و ژیـــانـم وەك زەهـــری مارە
لێوی یــــــــــــا قووتت قووتی ژیانە
ڕووی بێگەردت وەکـــــــــوو گوڵزارە
دونیا لەلای من چەشـــنی زیندانە
چونکە لێم دوورە ئەوچاوبە خومارە
(هەوری) بەم جۆرە بۆچـــی خەمگینی
وەرە ســـــەیرانی ئـــــەم لالـــەزارە

١٩٧/١١/٢٧

# (سەرمایەداری)

ـــــەرمایەداری دڵ ڕەق  بێ ڕەحمو هۆش و ئەحمەق
کەم هەست و بیرو شعوور  لە کرداری چـــــاکە دوور
ـەکو دار(بی) بێ ســەمەر  بێ کـــــەڵك و ڕێز و هونــەر
ـەرخەمی خۆیەتی و بەس  ئاگـــای نییە لــە هیچ کەس
گەر دنیا گشــت وێران بێ  نوقمی دەریـــای تــۆفان بێ
ـ زیـــــڕەی منــداڵ و ژن  لە دەس نـــامــەردی دوژمن
ـ ناڵــەی ڕووت و هەژار  یاخۆ چەپـــــۆکی زۆردار
ـۆژی هــەزار کەس بمرێ  گــــــەزێ کفنی پێ نەبــڕێ
ـ گوللەی پیاوی بەدخوو  بە نـــاحەق بــێ سێ و دوو
هــەزاران کەس بــــکووژێ  بێ گونــــــاه خوێنی بڕژێ
یا پەیـــدا نەبێ یەك نـــان  لەسەر ڕووی هەموو جیــهان
لای ئەوی وەك شـــأیــیە  شتی وای مەبەســـــت نییە
هەر ڕێك بی ئیشو کـــاری  پڕۆژەی دەشـــــت و شـاری
پارەی بــۆ دێ بە فــەردە  مێردەزمەی ســـــەر عـەردە
گیرفـــــــانی وەك جەواڵە  قەت تێر نــــــــابێ مەحاڵە
مەگـەر ئەو ڕۆژەی بمـرێ  مەرگ هەناســــەی لێی ببرێ
هەوری) بەسیە گفتــوگۆ  کێ گوێ رادەگـــــرێ لـە تۆ

کەرکووك – ١٩٧١/١٢/٧

## (ئەی پەری شێوە)

ئەی پەری شیوە ئەی روو بە خەندە
وەکوو سەر خێڵی ناوجافو زەندە
جاروبار ئەگەر چاوێ هەڵبڕێ
ئیتر سارێژە گشت زامی بەندە
باڵای بە وێنەی سەرووی رەوانە
لای من زۆر شۆخو جوانو پەسەندە
ئەبرۆی هەروەکو کەوانی راوچی
زوولفی بە لوولی داوو کەمەندە
دڵ موبتەلایە بە نیگای چاوی
ژیانم هەمووی ئازارو بەندە
دامێنی تەڕ کرد ئەسرینی چاوم
بڕوانە هەروەك ئاوی ئەڵوەندە
هەردەم لە عەشقی رووی وەك دێوانە
(هەوری) هەمیشە لەو دەشتو کەندە

١٩٧٢/١/٥

## (نەورۆز بەخێربێی)

نەورۆز بەخێربێی ئەی جەژنی شادی
تۆی مایەی خۆشی و بەزمی گوشادی
هەر ســـــاڵێ جارێ لە ئەوەل بوهار
تۆ پەیدا دەبی بۆ کـــــوردی هەژار
نە تەنها بۆ کورد بۆ هـــەموو گـــەلان
مایەی شانازی لەسەرووی جـــیهان
لەشکری سەرماو ســــــاردی نامێنێ
بوهار خێمەی خۆی لێ دەچـــەقێنێ
گوڵ و وەنەوشـــــە لە خاك دێتە دەر
زەردو سوورو شین هەموو دەشـتودەر
پەپوولەی رەنگین لەم گوڵ بۆ ئەوگوڵ
بۆ خۆی دەفڕێ بە ئـــــــارەزووی دڵ
قەترەی ئاوونـگ وەك دانەی گەوهەر
چریســـکە دەدا لەم سەر بۆ ئەوسەر
بولبول دەس دەکا بە شین و هاوار
نەغمەی بە ســۆزی بۆ گوڵی بوهار
نەورۆز ئەی رەمـــزی ئازادی و سروور
تۆ فەخری بۆ کورد هەتا نەفخی سوور

نەورۆزی ١٩٧٢

## (ڕۆژی بەیانی)([١٥])

ڕۆژی بەیانی زوو لە خـــەو هەڵسام
چـاوم هــەڵــبڕی کەمێ حــەپەسام
ڕوانـیـم زەلامــێ زل ڕاوەســـــتاوە
دەمو چــاوی خـۆی وەك دز پێچاوە
وتم ئەی برا بڵێ چیـــــــت دەوێ
وتی هەژارم قەزات لێم کــــــــەوێ
زۆرم برســـییە و هەم مـاندوو هیلاك
یــارمــەتـیــم بــدە وەك برایی چاك
منیش فەرمووم کرد وتــم ئەی برام
وەرە دانیشـــــە چــەن کاتێ لەلام
یارمەتیت دەدەم بەســـــەر چاوانم
هەرچیت پێویست بێ ڕوحی ڕەوانـم
دەرمـانی دەردت شەرت بێ پەیاکەم
ئــەوەی بــۆم بکــرێ درێغی ناکەم
چونـــکە تۆ دیــارە کە لێ قەومـاوی
بۆیــە بــەم جــۆرە کــزو دامــاوی
(هەوری) تــا ماوی ئــەتۆ لــە ژیان
بۆ سوودی گشتی هەوڵـدە بێوچان

---

[١٥] - ڕۆژێ بەیانی زوو گوێم لە دەنگی دەرگا بوو کاتێ چووم و ڕوانیم پیرە پیـاوێکی هــەژارو لاوازو ڕەنــگ زەرد هەڵگــەڕاو بەرگی شڕی پۆشیوە زمانی بە خەڵکی دەوری هەولێری دەکرد پرسیم فەرموو خاڵە چیت دەوێ وتی کاك گیان پێویـستم بــە یارمەتی هەیەو زۆریشم برسیە منیش دەست بەجێ بردمە ژوورەوەو نـانیان بــۆ نامــادەکردو یارمەتیـشم داو زۆر بــەڕێزەوە بەڕێم کرد بینینی ئەم پیاوەە بوو بە هۆی وتنی ئەم پارچە شیعرە لە ١٩٧٢/٧/١٢.

# (ئەو ڕێیەی گرتووم)[١٦]

[illegible] گرتووم لەسەری دەڕۆم
[illegible] بە ئاواتی خۆم
چەن ڕێگە سەخت و دوورو خەتەر بێ
هەموو گریان و شین و چەمەر بێ
[illegible] حورم تەواو گیرابێ
[illegible] دوژمن تەنرا بێ
یا ژینم هەموو زیندان و خەم بێ
هەموو رووی دونیا تاریك‌و تەم بێ
[illegible] بم هەر رۆژ لە شوێنێ
[illegible] خۆشیم نەمێنێ
یا دەس نەکەوێ بە گولله نانێ
بکەومە کێشەو دەورو زەمانێ

---

[illegible] ئەماڵەی ئێمە جموجۆڵی سیاسیمان زۆر بوو دەورێکی تایبەتی خۆمان هەبوو لە ڕیزەکانی بزووتنەوەی [illegible] ئەم هەڵس و کەوتانەی ئێمە ناحەزان و داخ لە دڵان هەستان بە ڕێکخستنی پیلانێکی نامەردانە [illegible] ترساندن و چاوشکاندمان ئەوە بوو لە شەوی ١٩٧٢/٨/١٢ی.زاینی چەن کەسێکیان ئامادە کردبوو کە [illegible] و لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کەرکووك-ەوە داڕێژرا بوو بەسەر پەرشتی باهیر ناوێك و چەند [illegible] ‌ڕاو. لە پاشان هەر هەمووی دەرکەوت لە سێڵاوە ماڵی ئێمەیان دایە بەر گوللەی کلاشینکۆف بۆ ماوەی [illegible] بەردەوام بوو لەبەر ئەوەی ستارەی خانووەکەمان زۆر بەرز بوو هیچ جۆرە زیانێکی بە ئێمە نەگەیاند [illegible] ئەنجام ئەم دەستدرێژییانە کچێکی سلوای مەلا مەحمودی حاجی عەزیزی ( عەمدۆنی ) شەهید بوو. بوو [illegible] بەزمییانە، ئەم ڕووداو بوو بە هۆی وتنی ئەم پارچە شیعرە، لە ١٩٧٢/٨/٢١ی.ز.

ماڵی خۆم وەکو کونجی زیندان بـیّ
ژیـانـم هەمـوو ئـازار و ژان بـــیّ
چوار دەورم بــــگریّ ناحەزو دوژمن
رۆژو شـــــەو بەلاّ بباریّ بۆ مــــن
گوللەی نامەردان من ناترسیّنـــــیّ
هەرگیز ناتـوانیّ رام چەڵــــەکیّنیّ
من قەت ناگــۆڕم ڕیّبازی ژینـــــــم
یا مـــــــــردن لە ڕیّی یاخۆ دەیبینم
(هەوری) بۆ قەومی خۆت تیّبکۆشە
روو رەشـــی تەنها بۆ خــۆ فرۆشــە

## (تەڵێ لە زوڵفت)

ـحێ لە زوڵفت نـــــادەم بە دونیـــا
ـیـم بۆچیە گەر تـــــۆ نەبی تیـــا
ژیــان بــەبێ تۆ وەك مــــــردن وایە
هەروەك ماسیێ دوور بێ لـــــە دەریا
ـبت خەندەت نادەم بە گـــەنجی قاروون
ـب لالـــەزاری رووی هـــــەموو دونیا
کەڕووی تۆ دەرکەوت مانگ دادەمێنێ
شـــەوقی نامێنێ لــە دەشـــــت و چیا
ـوەسفی ناسکیــــت بە کـــەس ناکرێ
ـى خســـــتۆتە ناو دەریای خولیـــــا
هاودەمم تەنهـــــــا بۆتە شین و زار
رۆژگارم وەکوو پەرچەمــــــــت سیا
ـحاســـینی تۆ دوورچـــاری خەم بووم
ـکشکێ نەمـــــدیبای بریا ســـــەد بریا
چۆن رەقیب دێڵێ بە ئـــــاوات بگەین
تـاکەی بـەم جـۆرە من و تـــــۆ جیا
ـعوری) لەعەشقی شەمعی روخسارت
ـە یـادی فـەرهـاد هـەردەم بە تـەنیا

## (موبتەلایە دڵ)

موبتەلایە دڵ بە یـــەك تیری نیگات
ئاهی سەردم وا بە جاریْ گەیی لات
خۆ تۆ ناپرسی لە حـــاڵم خونچە دەم
من بە ناچاری کە دێمە خـــاك و پات
چەندە موشتاقم لە بۆ دیداری رووت
ئەودەمە کوا ماچی کەم خاڵی گۆنات
زۆر دەمێکە چاوەڕێم ئەی نـــەونیهال
هەر لـــە ئێوارە هەتاکوو رۆژهـــەڵات

دڵ وەکوو بولبول هەمیشە وا لە زار
بۆ گوڵی رووتە کە ئاهوو شینەکات
رۆژو شەو هەردەم لە دەرگانەت ئەسیر
هەر لەبەر تەعنەی رەقیب ئەمڕۆ هەڵات
(هەوری) دایم وا لە ناو لێشاوی خەم
تووش بووە ئەمڕۆ لەرێی هاتونەهات

١٩٧٣/٩/١٥

## (بولبول من و تۆ)([17])

ـ من وتۆ هەردوو خەمبـارین
ـ وەکوو یەك دڵ بریـنـدارین
من دەنـاڵـێـنـم لـە دەس ئەم ژینە
تۆش بۆ روی گـوڵان جەرگت برینە
ـ نییە شەو هەتا سـەحەر
ـ بەردی ناحەز با خـەبەر
ئەمـن گیـرۆدەم بـە جـەوری رۆژگـار
تۆش بە پەرۆشی بۆ خونچەی بوهار
ـ یـاوی بـەدکـار ئـازارم دەدا
ـ عشقی گوڵ وەك شێتۆشەیدا
من خەمی خۆمو گشت کـوردم هەیە
تۆ پیشـەت هـەردەم نـاڵـەو گریەیە
ـ گەندە هەروەکوو سـەرخۆش
ـ ینی بـەجۆش و خـرۆش
من هیوام وایـە بـە ئـاوات بـگـەم
تۆش لەسەر چڵان بخـوێنی هەردەم
ـ سـایەی رۆژی روونـاکی
ـ پێکەوە دوور لەخەمناکـی

ـ ۱۹۷۳ی زاینی بوو ئەندامی دەستەی کارگێڕی مەکتەبی نیقابەی بیناو مەشاریع-ی کـەرکووك بـووم لەگـەڵ عرف و سەید حەکیم و محەمـەد فـەرەج و چـەند برادەرێکـی تـری ئـەمری گـرتنم دەرچـوو لەلایـەن ئـەمنی خۆشبەختانە ئاگادار بوومەوە بە پەلە خۆم گەیاندە دێی چیمەنی گەورە بـۆ مـاڵی ( مـەلا سـەید ئەحمـەدی موەن دوانزە رۆژێ مامەوە ئەم هۆنراوەیەم لە ئاوایی چیمەنی گەورە لە ۱۹۷۳/۱۰/۱۹ وتووە رۆژێ لە ناکـاوێ سەید محەمەد خۆی کرد بە ژووردا و وتی ئەوا برادەرانی خۆمان ئیشەکەیان بۆت پینە کردووە ئەنجا لەگـەڵ گەرامەوە بۆ کەرکووك.

## (خەیاڵ دەفڕێ)

خەیاڵ دەفڕێ لەگەڵ شـەماڵ
بەرەو هـــەوار گەیی لێو ئاڵ

ئەو رێگــە دوورە دەبڕێ زوو
گەلێ بە شـــەوق و ئارەزوو

تامـــەزرۆی گفتو گۆی یارە
ئەو یارە شـــــۆخ و نازدارە

چەن وەختــە هەر چاوەڕوانە
دەرکـــەوێ ئەو خـــەرامانە

بەڵام هـــەر نـــائومێد ماوە
خەم هات و شـــادی پێچاوە

بۆیە لەگەڵ شــــنەی شەماڵ
دەگەڕێ لە بــــاس و هەواڵ

عەودالی وەصـــــڵی دولبەرە
کە روی وەك شوعلەی ئەختەرە

لای نەماوە ســــــەبرو قەرار
رۆژێ لێی بۆتە شـــــەوی تار

(هەوری) بۆ ئەو زولفو خاڵە
گەلێ پەشـــــــێوو عەوداڵە

١٩٧٤/٢/١١

## (ئێمە منالی کوردین)

ئێمە منالــــــی کوردین
گەرچی بچکۆلەو وردین

خێرا دەچـین بۆ مەکتـەب
بۆ وەرگـــــرتنی ئەدەب

رێزی مامۆســـــتا دەگرین
فێری زانیــــاری دەبین

هەمـــوو ژیرو هۆشیارین
هەمـووەدم چاوەنوارین

هەوڵەدەین بـۆ نیشـــتمان
شـەو و رۆژ بەبێ وچان

خاکی شـــــیرین و جوانە
جێگەی شـــێری زەمانە

گەوهەرە خــــاك و بەردی
بیپارێزە گـــــەر مەردی

پێویستە هەموو هەوڵدەین
هەتا رزگاری دەکـــــەین

هەمـوو بڵێین بـە یەك ئان
سەروەری بۆ کوردستان

کەرکووک- ١٩٧٤/٥/١٥

## (گوڵی زەرد)

گوڵــی زەرد هێـزی گیــانـم
ئەی رەونـــــــەقی ژیانم

چەن وەخـتە لـە دووت وێـڵم
پەراگــــەنـدەی ناو خێڵم

تۆ نەبی مـن زۆر پەســـــتم
پەشێوە ســــۆزو هەستم

بە تۆوە خۆشــــــە ژیـان
خۆشەویستی لای هەمووان

هەر تۆی هیوای سـەربەستی
بۆ دوژمن مــایەی پەسـتی

کورد بە تۆوە خــۆش حاڵە
ئەمرۆ خاوەن کـــــەماڵە

رەنگت وەك شوعلەی بێگەرد
خۆتی رابــەر گــوڵی زەرد

رۆژگـــــارت خۆش و دڵگیـر
بۆ گەدا هــــــوو بۆ ئەمیر

(هـــەوری) هەر چاوەڕوانـە
بۆ ئەو دەورو زەمـــــانە

کەرکووك- ١٩٧٤/٥/٢٧

## (بوهار به خێر بێ)

بوهار به خێر بێ بەڕاستی جوانی
هەر تۆی کە مایەی خۆشی ژیانی
دەشت ودەر هەموو رازاوە بەگوڵ
گشت ژیایەوە چیمەن و کانی
شادی دەخەیتە ناو دڵ و دەروون
هەر خۆت لابەری دەردو خەمانی
لە هەرلا دەنگی بولبول و قومری
کە دەچریکێنێ بە نەغمە خوانی
بۆنی نێرگزو وەنەوشەو شەوبۆ
شەماڵ دەیهێنێ دەمەو بەیانی
بەراستی وەرزێ خۆش و دڵگیری
پڕخۆشی وشادی بەزم وسەیرانی
خەم و خەفەت و ناخۆشی و تاڵی
لای کەس نامێنێ جێگەومەکانی
عالەم خەریکی شایی و ئاهەنگە
بە چەپڵە رێزان بەستەو گۆرانی
(هەوری)ش ئەمرۆکە کەدڵ گوشادە
رۆژگاری دەڕوا بە شادومانی

## (یادگاری لە مەهاباد)[18]

ڕۆژێ لـــــە ئێـران چـوومـە مـەهـاباد

بەڕاستی دڵــــــم زۆر خۆش بوو گوشاد

شارێکی خۆش و گــــــەورەو دڵــگیرە

ئـاوو هـەواکـەی زۆر بـــــێ نەزیـــرە

خانوو کۆشکی جوان هەموو ڕەنگاوڕەنگ

ســـەد ســاڵ لـــەوێ بی دڵـت نابێ تەنگ

شــــەقام و جادەی هەمـــــــوو رازاوە

باخچەو ســـــاحەکان بە گـوڵ تەنراوە

کـۆگـاو دوکـانی بـــــــە هـــەزار جـۆرە

هەرچیت پێویست بێ لەلایـــــــان زۆرە

دانیشــتوانی مەردو ســـــــینە پاك

ئاگاداریان بێ حـــــــــەزرەتی لەولاك

[18] - بۆ یەکەم جار لە حاجی ئۆمەرانەوە بە نیازی گەشتی پێنجوێن لەگـەڵ کـەریمی حـاجی زەهـاو کەوتینـە ڕێ بـەرەو شارۆچکەی خانە ( پیران شهر ) کە دەکەوێتە نزیکی سنوورەوە پاش ماوەیەکی کەم گەیشتینە ناو شار لە دوای نان خواردن و حەسانەوەیەکی کەم ئە نجا بەرەو شاری ( نەغەدە ) لەوێشەوە بۆ شاری مەهاباد کەوتینە ڕێ، لە ڕۆژی ١٢/٦/١٩٧٤ی.زاینی لە شاری ناوبراو لامانداو نزیکەی دوو سێ ڕۆژێ ماینەوەو زۆر شوێن لە ناو شار گەڕاین چـوینە مەیـدانی چوارچـراو چـەن جێگەی تری ئەم شارە دڵگیرە، بەڕاستی وەسفی ئەم شارە بۆ خۆشی و جوانی و دانیشتوانی بۆ مـەردی و پیـاوەتی و چـاکە لەگەڵ غەریباندا ناکرێ، بەتایبەت لەگەڵ ئێمەی کوردی عێراقی بە ڕێکەوت چووینە گەرماوێ ناوی ( حەمامی بلوور ) بوو سەیرم کرد ئەوا کاك مەلا تەها فەتاح لەوێیە خۆی شتووەو خەریك بـوو خـۆی لەبـەر دەکـرد. نـاوبراو هاوڕێیـەکی زۆر خۆشەویستم بوو خەڵکی شاری هەولێرە ئیتر ماوەیەکی زۆر پێکەوە بـووین و باسـی رابردوومـان دەکـرد، هەنـدێ گاڵتـەو سووحبەتی خۆشمان کرد وتی ئەوە ( شێخە شێتە ) لێرەش لێمان پەیدا بووی لە پاش ماوەیەك دابڕاین ئەم پارەچە شیعرەم لە ١٦/٦/١٩٧٤ی.زاینی لە مەهاباد وتووە.

دەرهەق ڕێبوارو هـــــــــەژاروغەریب
زۆر میهرەبانن بـــــــــەڕێز و نەجیب
چەن ڕۆژ مامەوە ناو دۆســــــت و برا
چوومە زیارەتی مەیدان چوارچـــــرا
بەدەستەو نەزەر وەســــــــتام بەکزی
هەر بیرم دەکرد لـــە یـــــــادی قازی
کە چۆن ئەم زاتە خـــــۆی و یارانی
بۆ بەرزی وەتەن بوون بە قـــــوربانی
قەت لەیاد ناچێ پێشـــــــەوانی نەمر
کە چۆن بە ناحـەق دوژمـــــــنی کافر
خونچەی هیوایـان بە ناحەق پســـاند
فەخری ئێرانو گشت کوردیان خنکاند
چرای ئاواتی کـــــــورد کوژایەوە
بەڵام ڕێبازی وەك خۆی مـــــــایەوە
هەتا ئەم ڕۆژە شـــــــەوقی بمێنێ
لەناو دڵی کورد یـــــــادی دەمێنێ
(هاوڕێ) ئەم ڕۆژە لـــــــە ژیانی توو
خۆشترین ڕۆژە تا مـــــاوی زیندوو

## (ئەی چۆلەکە) ([19])

ئەی چۆلەکەی بەستەزمان ... هەژاری بێ لانە و بان
چەن بچکۆلەو هەژاری ... بێ کەس و ماڵ وسامان
بە وریایی و ژیری خۆت ... تۆ دابین دەکەی ژیان
بە درێژایی رۆژ و ساڵ ... هەوڵەدەی بەبێ وچان
ئافەرین سەد ئافەرین ... نەکەی کۆڵدەی لە ژیان
ئەمڕۆ ژیان زۆر سەختە ... هەستە بکەوە جەولان
بفڕە لەم دار بۆ ئەودار ... بگەڕێی باخ و بێستان
دونیایێ پان و بەرین ... شاخ و دەشت و بیابان
بۆ کوێ بچی دەتوانی ... کەس نییە بخاتە زیندان
تۆ سەربەست و ئازادی ... نەوەك من بارت گران
لەهەر شوێنێ کەخۆش بێ ... لەوێ رابوێرە ژیان
کوێ دانەوێڵەی زۆر بوو ... بۆ خۆت و بۆ بێچووەکان
ئەنجا لەوێ بەبێ خەم ... بۆخۆت دروست کە هێلان
(هەوری) ئەم تەیرە جوانە ... خاوەن هەستە وەك ئینسان

---

[19] - لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤ دابوو رۆژگار لەگەڵ خێزانم و منداڵەکانمدا گەیاندمی (ئۆردوگای سەولاوە) لەو کوێستانەی دەوروبەری (سنە) کەشو هەوایەکی زۆر ساردو سەرما دەشت و چیاکان هەموو هەر سپی دەکردەوە بەفر تەواو زەوی داپۆشی بوو هەندێ چۆلەکەش لە برسان هەر هاتووچۆیان دەکرد منیش بەو هۆیەوە ئەم شیعرەم لە رۆژی ١٩٧٤/١٢/٢٣ی. زاییـنی وتووە.

## (ئێوارانێ بوو)[20]

ئێـوارانی بوو لـــه وەرزی بـــوهار
بوهارمان لێ بووبەشین و زینهـــار
هەواڵی گەیێ زۆر تـــاڵ و ناخـۆش
هەزاران مەرگ لە ناویـــا روو پۆش
نەخانوو ســـــووتان نە باوك مردن
نەزەرەری زۆر لـــــە ماڵ لە گەردن
نە وەكوو فیراق بەیــنی دڵـــــداران
نەوەكوو سۆزو ناڵـــەی هـــــەژاران
هیچی ناگاتە ئەم ئێشـــە ســەختە
روی كردە ناوئەم كوردە بەدبەختە
كاتێ كە وتیـــــان شۆڕش نەمـاوە
لە هەر چوار لاوە ئیـــــنزار كـراوە
بڕیـــار دراوە دەبـــــــێ نەمێنــێ
چیتر لەمناوە خوێـــــن نەڕژێنــێ
نەگبەتی هاتویەخەی كوردی گرت
تەم و خەفەتی رووی ئاسمانی گرت

---

[20] - ماوەیەك بوو منالەكانم لە پێنجوێنەوە گەیاند بۆ ئۆردوگای ( سەولاوە ) لە مەحاڵی شاری سنەی كوردستانی ئەو دیوو ماوەیێ بوو دەمویست خۆم بگەڕێمەوە بۆ پێنجوێن. كەچی ئێوارانێ لە دوای نوێژی مەغریب لە پڕێكـا وتیـان ئـەوا كـاك جەلیلی كوڕی مام ئیسماعیل دەروێش هات منیش خێرا چووم بە بەخێر هاتنی سەیرم كرد خەڵكێكی زۆر دەوری لێداوە وتم ئەوە چییە وتیان دەڵێن بڕیار دراوە دەبێ شۆڕش نەمێنێ. ئێمە بەم هەواڵە تاڵ و ناخۆشە زۆر نارەحەت و دڵگـران بـووین رۆژی دوایی تر ئێمەیان گواستەوە بۆ ئۆردوگای ( كامێران ) لەنیزیك شاری كرماشان ئەم پارچە شیعرەم بە هۆی ئەو رووداوە دڵتەزێنەوە لە ١٩٧٥/٣/٢٧ ی.زاینی. لە شارۆچكەی كامێران وتووە كە لەوپەڕی دڵتەنگی و ناخۆشیدا دەژیاین.

هەموو دەگــریا چیا و دارســتان

بوهارمان گۆڕا بـــەچلەی زستــان

هـــــاژەی لێبڕا رووبــــارو کـانی

بولبول بـــە ناڵەوشین و گــــریانی

خەفەت دەس بەجێ هاتــە کایەوە

شــادی بارەگای خۆی پێچــایەوە

لــە هیچ کـەلێـنێ روونــاکی نەما

هەموودوچار بوین ناودەردو خــەما

کورد هەمووکەوتە شــیوەن و رۆڕۆ

جەرگی برژاوی لێ دەهـات بۆنسۆ

ئەودارەی چەن ساڵە بەخوێن ئاودرا

بە دەســـتی نا مەرد لە رەگ دەرکرا

(هەوری) شادی کورد تێپەڕی تازە

ئــومێدی ژیـــــان ئیتر مەخوازە

# (چەرخی زەمانە)([٢١])

چەرخی زەمانە شـــــــێواندی ژینم
ڕۆژوشەو لەناو مەینەت و شـــــــینم
لەشکری خەفـــــەت باڵی شکانم
کزو زەبوونم زۆر پـــــەرێشـــانم
لە هەمـــوو لاوە مەینەتـــــی ڕۆژگار
وەك سەیل دەبارێ بۆ منی هـــــەژار
قامەت چەماوە لەبـــەر دەردو خەم
شـــادی باری کرد نەما زۆرو کـەم
وەك گەڵای پایز کـــــزو ڕەنگ زەردم
لە نـاو غوربەتی دووچـــاری دەردم
هەر ڕۆژ لەشارێ هەرتاو لەشوێنێ
خـەم دەوری داوم نیمـە کە لێینێ
خزم و ناســـــیار هاوڕێ و بـرادەر
گشت لێم پەنهانە هەی خاکـم بەسەر
وەك تەیری غەریـب لە ڕەو دابڕاو
کزەی دەروونی بـەردەکـا بە ئاو

[٢١] - کاتێ کە بە ماڵەوە ڕۆژگار گەیاندبوومییە شاری (کامیران) کە لە نزیکی (کرماشانە) لەگەڵ چەن هاوڕێیەکی دڵسۆز هەموو پێکەوە وەك برا دەژیاین حاجی مەحموود تۆبزاومیی ئیسماعیل دەروێش و ئامیق سەعدون و محەمەدی مەلا سابیرو جەوهەر محەمەد دزەیی و یەحیای شێخ عەلی و چەندانی تر لە دۆست و ناسیار کە ڕۆژگارو یەکبوونی بیروباوەر هەموومان پێکەوە بەستابوو کە بە هیچ جۆرێ نامان توانی لەیەك دابڕێن گیروگرفت و کەم و کوڕیمان زۆر کەم بوو تەنها ئەوە نەبێ کە لە وڵاتی غەریباتی بووین هەمیشە هەر یادی زێدو مەنوای خۆمان دەکردەوە، دەنا هیچی ترمان کەم نەبوو هەموو پێویستی ژیانمان دابین کرابوو. کامێران -- لە ١٩٧٥/٤/١٥ی زاینی وتراوە.

ئەی خودا بەس بێ جەفاو دەردوخەم

تاکەی بەم جۆرە دڵ پڕ لە ماتەم

رزگارم بکەی لەم ژینە تاڵە

گەلێ بێزارم سەد تف لەم حاڵە

خەمو مەینەتی زەمانەی بەدخوو

بەرۆکمان بەردا بڕوا زوو بەزوو

شادبم بەدیدار دۆستو کەسو کار

بگەشێمەوە وەك لالەی بوهار

دڵم زۆر تەنگە لەم (کامیرانە)

هەرچەندە زۆری کەکورد زووبانە

بگەڕێمەوە بۆ ناو خاکی خۆم

بەسە گەڕانو سوڕان وەکو دۆم

ئیتر بە شادی چەن رۆژی ژیان

خودا بیگۆڕە ئەم دەورە بۆمان

## (نیشتمان)

نیشتمان ئەی قیبلەگای من — ئارەزوو شەوق و نیگای من
پاکە زۆر ئاوو هەوای تۆ — خۆش و دڵگیرە نەوای تۆ
خاکەکەت رەنگین و جوانە — هەروەکو بووکی جیهانە
دەوڵەمەند پڕ خێرو بێری — خاوەنی رۆڵەی دلێری
زۆرجوانە شاخ و دەشتی تۆ — بەڕاستی وەك بە هەشتی تۆ
سەیریکە جۆگەو رووبارت — خۆشە گشت گۆشەو کنارت
یاخودا هەر ئاوەدان بێ — دوور لە مەینەت کامەران بی
ئەگەرچی ناحەزانی توو — وەك گورگی هار دایم هەموو
دەمیان لە ناو خوێنی تووە — ویژدان و هەستیان مردووە
بەڵام ئەی نیشتمانی جوان — هەر دەگۆڕێ دەورو زەمان
رۆژێ دەبێ لاوانی تۆ — رەوشەن دەکەن چاوانی تۆ
هەر دەردەچێ تیشکی هەتاو — تاریکی لا دەبا تەواو
هەزار خەمم لا میوان بێ — وەیا دەردم بێ دەرمان بێ
تۆ هەمیشە هەر لە یادی — بۆ (هەوری) مایەی گوشادی

١٩٧٥/٦/٢

## (هەژار لە داخت)[٢٢]

هەژار لە داخت زۆر بێ قـــــەرارم
بۆ تۆ رۆژو شەو لـــــە شین وزارم
هەر چەن دەتبینم کـــزو زەبـــوونی
گیرۆدەی دەستی دەردی نەبـــوونی
کز و پەشێوی وەك گـــوڵی ژاکاو
بێنازو خۆشی هەردەم دڵشـــــکاو
بێبەش لەشادیو خۆشـی ئەم ژینە
دەردو بەڵاو خـــەم بۆی لـە کەمینە
ئافرەتی رەنگ زەرد منداڵی دامـاو
جلوبەرگی شڕ هەم فرمێسکی چاو
رۆژگاری هەموو بەهەناسـەی سەرد
دڵ و دەروونـــی پـــڕ لـە زام و دەرد
هەرچەند منداڵێ هـــــەژار دەبینم
ئاگر بەر دەبێ لـە شـــــادی ژینم
خۆزگایە موڵکی دنیام گشت دەبوو
هەمووم دەبەخشی لە بۆ شادی توو
(هـــەوری) بێگومان مرۆڤی هەژار
زۆر خۆشەویستە لای پەروەردگار

---

[٢٢] - لە دوای گەڕانەوەم لە ئێران لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕێگەوبانی سلێمانی بووم بە ( مراقب عمل ) ڕەوانەی پـرۆژەی رانیە- قەڵادزە کرام ئەم پارچە شیعرە لە رانیە لە ١٩٧٥/٨/١١ی. زاینی وتراوە.

## (بەری بەیانە)

بــەری بەیــانە دونیــا روونــاكە
ئاسمان وەك دڵی عاشــقان پاكە
سروەی بای شەماڵ دەمــەو بەیانی
هاژەی رووبارو قاسپـــەی كەوانـی
چریكەی قومری و ئاوازی بولبول
نەشـــــئە دەخەنە ناو قوڵایی دڵ
كام دڵ كەگەلێ پەست و خەمگین بێ
وەیــــــا گیرۆدەی نیگای شیرین بێ
لەو كاتە خۆشــــە دێتــە پێكـەنین
وەك مەل دەفڕێ لەئاســـــمانی ژیـن
ئاگـــــای لە جەورو تـــــاڵی نامێنێ
خەندەی گوشادی هێــرش دەهێنێ
دەكەوێتە نــاو دەریــــــای خۆشی
بەجارێ دەكوڵێ هەست و خرۆشی
روخـــساری وەكو لالەی دەشت ودەر([23])
دەگەشــسێتەوە وەك گۆنای دولــــبەر
(هــەوری) خەیاڵی دەفڕێ بێ ئازار
هەروەك پەپولەی ناو گوڵ و گوڵزار

رانیە – ١٩٧٥/٨/٢٩

---

[23] - لالە - گوڵێكی سوورە

## (ماوەیێ زۆر بوو)([24])

ـ ـمیێ زۆر بوو لـــــە دوورە وەتەن
ـ ـمە گیرۆدەی نـــــاو داووکەمەن

هەزاران سوپاس بۆ پـــــەروەردگار
کە رزگـــــارم بوو لەجەوری رۆژگار

ـ کـــرماشان بووم هاتمە سلێمـــانی
چەـ رۆژ لـــەوێ بووم بە شادمـــانی

لەوێش نـــەوەستام چووم بۆ رانییە
جـــێگەی وادڵـــگیر لەهیچ کوێ نییە

ـ خەکەی ئاسۆس لەگەڵ کێومڕەش
ـیمەی رەنگین زۆر جوان و سەرکەش

ئاوە ساردەکەی کانییەکەی قوڵـــــە
سەیرانگای کیژی چاو پڕ لە کلـــــە

قەیســەری جوان و جـــادەو بازاڕی
هەموو شـــت زۆرە گەر تـــۆ کڕیاری

لە دائیرەی (تورق) بووم بە مـــوراقیب
دوور بووم لە وتەی ناحەزو رەقـــیب

---

- لە دوای گەڕانەوەم لە ئێران لە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگەوبانی سلێمانی بە یارمەتی چەن برایەکی دڵسۆز بە ( مراقب عمل ) دامەزرام لەسەر ئارەزووی خۆم پرۆژەی ڕێگەی رانییە- قەڵادزەم هەڵبژارد لە رۆژی ١٩٧٥/٥/٢١ چووم بۆ رانیە بینیم بە زۆری خەڵکی کەرکووکن لەوانە کاک مەحموود شێخ سەلمان بەڕێوەبەری پرۆژەکە کاک عەبدولوەهاب مەلا سادق و کاک تاهیر مەحموود و کاک حوسێن رەسووڵ مام عەلی کتکەیی و مام نادرو کاک حەسیب و چەندانی تر کە هەمووی هاوڕێی خۆم بوون بەڕاستی ماوەی چەن مانگی زۆر بە خۆشی ژیانمان دەبردە سەر چەن برایەکی خەڵکی رانیە و چوارقوڕنەشمان لەگەڵ بوون کاک حوسینی مام ئاغا پیاوێکی مەردو بە غیرەت بوو، کاک مستەفاو کاک زاهیرو کاک مەولوود مەولانیان پێ دەگوت زۆر سوحبەتچی بوو کاک جەمیل ناسراو بوو بە جەمیلە شێت زۆری تری گاڵتەمان لەسەر ئەو پیاوە بوو. چوار قوڕنە- ١٩٧٥/٩/١٥ی.ز.

چەن کەسیَ لێرە هەموو وەك براین
هەردەم بە شادی زۆر ڕێك وتەباین
شەوورۆژ هەموو هەر بەقسـەی خۆش
گاڵتەونوکتەی قۆر هەروەك سەرخۆش
وەختوکات چۆن دیَ ئێمە نازانین
دائیم بە خۆشی زۆر شـادوومانین
کاك عەلی کتکە هەم حوسین رەسـول
چەن کەسی ترهەن بەرێزو مـەعقوول
وەهاب سادق و زاهـیر مـام عەولاّ
جەمیل-ە شێتو مـەولان نـاقۆلاّ
هەمیشە فشەو گاڵتـەجـاریيە
ئیتر مەپرسـە بـەزم و یاریيە
خوایە بنێری شـادی یەکجـاری
خۆشی بخەیتە نـاو کوردەواری

## (گەلێ بێزارم)([25])

گەلێ بێزارم لـەم ژینە تـــــــــاڵەم
کوا ناڵەی ئەی دەگا بەناڵــــــــــەم
ڕۆژی هەزاران دەرد یەخـەم دەگـرێ
مردن خۆش ترە گەلێ لـــەم حاڵــەم
بێزارم لە دەس ئینســـــــانی نامەرد
هەناو ئەم دەورە لە قڕەو گـــــــاڵەم
گەرچی دەمبینی ڕەنگم گەش وسوور
بـەڵام لـــە دەروون بـــە وێنەی ژاڵــەم
زۆر کوێرەوەریم لـــــــەم ڕۆژگارە دی
بەفیڕو ڕۆیی ڕەنجی چـــــەن ساڵەم
ئێســـتاکەش مانم هەروەك نەمـــانە
بێ جێگەو ڕێگە لەو باسك‌و یاڵـــــەم
(هەوری) ناوەستێ ڕەوڕەوەی ڕۆژگار
هەر دێنە بەرهەم ڕەنجـی چەن ساڵەم

---

[25] - لە دوای ئەو پیلانە گلاوەکەی کە ناحەزان سازیان کردو شۆڕشی کوردی پێ لە ناوبرا ئـەم میللەتـە هـەژارەی هـەموو ئاوارەو دەربەدەر کرد منیش لە ئە نجامی ئەو بارودۆخە نالەبارەو لەدوای کوێرەوەرێکی زۆر لە دوورە وڵات و غەریبایـەتی گەڕامەوە بۆ نیشتمانی خۆم بە یارمەتی چەن برایەکی دڵسۆز لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕێگەوبانی سلێمانی بە چـاودێری کرێکاران دامەزرام و لەسەر ئارەزووی خۆم ڕەوانەی پرۆژەی ڕانیە- قەڵادزە کـرام هـەر چـەندە هـاوڕێی چـاك و دڵـسۆزو مەردانەم زۆر لەگەڵ بوو بەڵام هەر چەندم دەکرد لەو شاری سلێمانییە تەننها ژوورێکم بـۆ پەیـدا نـەدەکراو خانووەکـەی خۆمیش لە کەرکووك کرێچی داگیری کردبوو لێم و منیش لەو بەینە زۆر شپرزە بـووم و جێگەیـەکم دەس نـاکـەوت و ژیـان و گوزەرانم زۆر ناخۆش‌و تاڵ بوو سەرەڕای ئەوەش لەو کاتەدا ئەو دێهاتـانەی سەر سنووریـان دەگوازرستە خوارەوە ئەو خەڵکە دەهات و دەچوو ئەوەندەی تر بارم گران دەبوو خەم رووی تێ دەکردم . چوارقوڕنە ١٩٧٥/١٠/٢.

## (مام هۆمەر)

مام هۆمەرێ بوو هەژار        ڕۆژێ دەستی دایە دار
گوایە دەغڵی خورا بوو        عەقڵی لە لا نەما بوو
تاوی دایە ناو گەڕەك        هەڵیگرت بوو كەتەك
بانگی كرد ئەگەر پیاون        وەرنە پێش بۆ وەستاون
چەن كەسێ ڕجای لێكرد        قسەیان بەری نەگرد
گۆبەندێ وای نایەوە        بەدی دەنگی دایەوە
هەموو بەربوونە ناو یەك        گەیی بە شەڕە كوتەك
چەن كەسێ سەری شكا        جلوبەرگی گشت دڕا
تا هەندێ هات لەولاوە        مام هۆمەریان پێچاوە
بردیان بۆ خزمەت ئاغا        بەبێ دەنگی ڕاوەستا
ئاغا وتی مام هۆمەر        ئەوە چیتە ئاخر شەر
لەلای خۆی تۆ ڕیش سپی        تاكەی هەر خەریك بەدی
تۆ كوا لە ڕیز شەڕ ماوی        بۆ چ ئەوەندە نا پیاوی
ئەم گۆبەندەت دامەزراند        دڵی چەند كەست شكاند
پێم بڵێ چییە جەزات        هەندێ ئازارت بدات
بۆ وەی هەتا بمێنێ        ئێتر ناو كەس نەهێنی
جارێ بڕۆ هەر ئێستە        لە ڕێوە هیچ مەوەستە
سێ عەڵبە گەنم بێنە        لێرە هەڵی ڕژێنە
بۆ میوانی دیوەخان        ئەنجا بڕۆ لە پاشان
پانزە بار دار بهێنە        خێرا هیچ دامەمێنە

ـو نەوەی جاریکی تر    ئـارژاوە نەکەی چیتر
ـدە هۆمەری بەستەزمان    هەستا بە هەڵەداوان
ـەختیارو هەناسە سوار    هەم بێ هێزو دەردەدار
گەنمی پێواو باری کرد    گەیاندێ جێ دەستوبرد
ـدرەری بوو بە دەقات    بی لەوەی دەنگی دەرهات
بـاجی توورەیی داوە    پاشگەز بوو لەو رووداوە

.١٩٧٥/١١/٣

## (وەرزی بوهار)

چەن خۆشە وەرزی بوهـار
لابەری خــــــەم و ئازار
جیهان وەك بــووك رازاوە
هەموو بە گـــولْ خەملاوە
تۆ بروانە ئەو دەشــــــتە
هەروەك باخی بەهەشـــتە
سەیری نێرگزو بەیبـــوون
خۆشی دەخـــەنە دەروون
ئاوازی قومری و بولبـــول
دیمەنی وەنەشــــــەو گول
کزەبای نەرمی شەمـــالْ
لە خوڕڕەی ئـــاوی قەدپالْ
سۆزی بلوێری شــــــوان
هەم قاسپە قاســـپی کەوان
زۆر خۆشە ئەم دەنگـــانە
وەك ئاوازی کەمـــــــانە
چریسکەی کانی وەك زیـو
دێتە خوار تا ئەو سەرشیو
کیژۆڵەی چاو ئەســـتێرە
کــــــە دەچن بۆ بەر بێرە
زۆر بەنازو لەنــــــجەولار
هەروەك پۆری گویْ رووبار
بالآی بەرزو پەرچەم خـاو
بۆنی مێخــــــەك و گولآو
زرەی بازنگ و گــــــوارە
مەپرســــــــە لەو نازدارە
توورمەو هەوری لەمـــلی
چاوانی پـــــــــڕ لە کلی
یەك نیگای ئەم چـــاوانە
مایەی خۆشـــــــی ژیانە
مرۆڤی کزو دلْ تــــــەنگ
دێتە سەربــــەزم وئاهەنگ
ماوەی چەن کـاتیْ لە ژین
زۆر بە خۆشـــی و پێکەنین
خەم و مەینــــەت و تاڵی
گشت دەڕوا لــــە خەیاڵی
لەم وەرزە خۆش و جوانــە
(هەوری) زۆر شـــادومانە

سلێمانی - ١٩٧٦/٤/٣

## (ئەم مۆدەی)

ئەم مۆدەی ئەمڕۆ لەم شـــــارە باوە
نیوەی ئەم خەڵکـــــەی لەرێ لاداوە
ئەو جل و بەرگەی لەبـــەری دەکەن
ئاگر لـــــە جەرگـی لاوان بەر دەدەن
لاق و قۆڵی رووت ســــینگ و مل والآ
زۆر شــۆخ و جوانـــــە ناو قەدو بالآ
هێند بە لـــــەنجەولار دەڕوا بەرێدا
ئەختیاری سەد ساڵ بۆ دەبێ شەیدا
تیری موژگانی جـــــەرگ و دڵ دەبڕێ
دەکەوییە داوی نـــــاکاو لــــە پڕێ
ئەو لێوە ئـــــــاڵە هەروەك گولاڵە
ئەو کولمە گەشـــــە ئەو چاوەکاڵە
کاتێ بیـــەوێ کـــــە خۆی بنوێنێ
خوێنی هەزاری وەك مــــــن بڕژێنێ
نازو ناسکی خۆی ئاشـــــکرا دەکا
گولاڵە و نەسرین شـــــەرمەزار دەکا
دووچارت دەکـــــا بە دەردو مەینـەت
مەلەوان دەکەی ناو دەریـــــای خەفەت
ئیتر کە تووش بووی چـــارت مەحاڵە
ئازاری عیشق شـــــــەرابی تاڵـــە

هەزاران وەکوو فەرهـــاد و مەجنوون
بە تیری عیشق گشت بوون سەرنگوون
زۆری وەك لاس و مەمـــی بۆتانی
لەرێی ئەوین دا بوون بە قوربـــانی
هەزاران کەسی لە ژین ریســـوا کرد
تووشـــــی ئازارو دەردو بەڵا کرد
وریا بە تیری نیگـــای چاو کاڵان
دووچارت نەکا بە شـــین و گریان
(هەوری) تۆش دوربە لە کۆڕی جوانان
فریـــووت نەدەن پەری رووخساران

سلێمانی- ١٩٧٦/٧/٥

## (که دوایی هات)

که دوایی هات شەوەزەنگ
دونیا بەبێ سروەو دەنگ
تەنها خوڕەی ئاو نەبـــــێ
جار جارە گـوێت لێ دەبێ
کەخۆر دەرچوو لەدەمکەل
چەن خۆشــە نەغمەی مەل
بولبول بە ســــۆزو ئاواز
گولّ چاو هـــەڵدێنێ بەناز
ئاونگ لەسەر رووی گولاّن
زۆر جوانـــە دەمەو بەیان
گولاّلە زۆر گەش و ســوور
دەدرەوشـــێتەوە لە دوور
دەشتودەر هەموو رەنگین
لالەو وەنەشـــەو نەسرین
تێکەڵ دەبێ رەنگاو رەنـگ
پەلکە زێڕینەی قەشـەنگ
لەگەڵ تیشکی خۆرەتـــاو
زۆرجوانە قەترەی خووناو
شەماڵ کە دێ لەســــەردا
لـــە قۆپنەی گولاّن دەدا
عەترو نێرگــــزو شەوبۆ
دەماخ دێنـــــەوە سەرخۆ
زۆر خۆشـــە وەرزی بوهار
ناو چیمەن و گـوێ رووبار
(هەوری) بەتۆ چی خۆشی
تۆ بادەی خـــەم دەنۆشی

## (دەڵێن)

دەڵێن عیسای پڕ عەقڵ و هونەر
جارێ دەڕۆیی روو لە دەشتودەر
یەکێ تووشی بوو وتی بە قوربان
روخسارت کزو پەشێوە سەروەر
فەرمووی لەداخی ئینسانی ئەحمەق
بۆیە بەم جۆرە رێم گرتۆتە بەر
دووبارە وتی ئەی مەردی مەزن
تۆ مردوو لە خاك دەهێنیتەدەر
سەیرە رادەکەی لەدەس بێ عەقڵی
فەرمووی کە دەڵێم ئەڵلاهو ئەکبەر
هەموشت بۆمن دەس بەجێ دەکرێ
تەئسیر ناکاتە مێشکی پیاوی کەر
لەگەڵ مرۆڤی ئینکارو نەزان
هەرگیز رۆژگارت مەدە بە هەدەر
مەحاڵە سوودت لێوە دەس کەوێ
غەیری ئازارو خەم و دەردی سەر
بێهوودە وەختی خۆت مەچوێنە
(هەوری) تۆش دوربە لەپیاوی بەدفەڕ

١٩٧٦/٩/٧

## (کەو)

ـەی کەوی گەردن بە خاڵ ئەی چاوڕەشــی دەنووك ئاڵ
ـقت زۆر ســـوورو جوانە هەروەك گـــوڵاڵەی قەد پاڵ
ـطلیکی زۆر روح سووکی لە دەشت بی یا لە نـــاو ماڵ
ـبەینان زوو دەخـــوێنی لەگەڵ ســـروەی بای شەماڵ
ـسەر شاخ و پەنای بەرد خۆشـــتر لە دەنگی شمشاڵ
ـاوازت زۆر بە ســــــۆزە لە ناو بەری خـــــــەمی تاڵ
ـۆر خۆش و دڵ بزوێنـــە دەروون دەکـــــاتە زووخاڵ
ـەگەرچی دەنگ و رەنگت زۆر کـاریگــــــــەرو زووڵاڵ
بەڵام ئێـــوەش وەك ئێمە خۆخۆر لەدووی یەك عەودالْ

کەرکووك- ۱۹۷۷/۱/۹

## (ئازیز دەپرسی)([26])

ئازیز دەپرسی حاڵ و ئەحـــــوالّم
لە جەوری رۆژگار دایم دەناڵـــــم

رۆژ و شەو هەردەم وام لەم کارگەیە
لەم دەشتە چۆڵە وەك جێی بازگەیە

هیچ ئاگام نییە لە دونـــــیای کۆن
نازانم شەوو رۆژم دەروا چـــــۆن

من و چەند کەسێ لێرە وەك بـــرا
پێکەوە دەژین بێ قرەو هـــــــەرا

هەردەم لەناو ئیش سەرقاڵ‌وماندوو
نایێتە یادم دەورانی پێشـــــــوو

مام رەشید ناوێ ئێـــستا وا لێرە
پیاوی زۆرچاکە بە کەڵکـــو خێرە

لەلای قوومەکە شـــەوان دوو بە دوو
کەدەچریکێنێ وەك کۆتری یـــاهـوو

هەتاکوو شەوگار دووبەشـــی دەڕوا
ژیانی ئێمەش بـــــەم جۆرە دەڕوا

پاشان لێی دەنووین تـــاکو بەیانی
هەردوو پێکەوە وەك بـــرای گیانی

---

[26] - ماوەیەك لە سلێمانی لێپرسراوی کارگەی کاشییەك بووم لەگەڵ نورەدین محێـدین سـەمین خـەڵکی گونـدی قوتـانی کەرکووك بوو، هەروەها مام رەشید ناوێ کە لە بنچینەدا خەڵکی دەوری چەمچەماڵ بوو نۆبەتچی کارگەکە بوو شـەوان زۆر خۆشمان رادەبوارد، مام رەشید بەستەو مەقامی ( قەتارو ئەڵلا ومیسی ) بۆ دەوتین بەڵام دەنگ و ئاوازی زۆر خۆش و بـەتام بوو تا نیوە شەو نەدەنووستین ، ئەم چەن بەیتە لە یادگاری ئەو شەوانە لە ١٩٧٧/٢/١٢ ، وتراوە.

وەکو کوندەبوو لـــەو دەشتە چۆڵە
کە جێگەی پیـــاوی لات و کلۆڵـــە

حەز جارە نەبێ ڕۆژنامـــــە دەکڕم
ـە کات بێ ئیشی چاوی تـــێ دەبڕم

کەمێ دەبیســـــم ڕووداوی جیهان
باقی شپرزەم بـــــە ئەرکی ژیـــان

و، باشـــــــە بۆ خۆت بژی برادەر
ـووربی لەگێــڕەو کێشەو دەردەسەر

نیزیکی پیـــــاوی نامەرد نەکەوی
قەت نەکەی ســـەری بۆ بکەی نەوی

هەوری) تا ماوەی ڕوو لە خوداکە
دەرمانی دەردت لــــەوی داواکە

## (بەینێ بوو) ([٢٧])

بەینێ بوو سەرقاڵ ئیش و رەنجدان بووم
دووچاری ئەرك و بەزمی ژیـــــان بووم
بەڕۆژ و بە شـــەو هەر لـــە کاسبی
دەمویست کەوا زوو ببمـــە چەلەبی([٢٨])
وەك خونچەی بوهار پڕ شـەوق و سروور
هەردەم بە شادی رەنگم گـەش و سوور
نامزانی رۆژگار چـۆن دێت و دەڕوا
دەردو خەم چییە لـە کوێیە و کـوا
رۆژێ لەناکاو مـــام خەفــــەت بەتاو
دەهات لــــە بۆ لام خێرا بە لێشــــاو
وتی چەن رۆژە لــــە دووت دەگەڕێم
ئەوە تۆ لە کوێی لــــە دەورت گەڕێم
خۆ هاوڕێی یـــەك بووین من و تۆ پێشان
ئەی بۆچی ئێستا خۆت کـردووە پەنهان

[٢٧] - تازە لە کەرکووك کارگەیەکی کاشی-م دانا بوو کەمێ بووژابۆوە ژیانم رۆژێ لەگەڵ چەن هاوڕێـیەکم دانیشتبووم لـە ناکاوێ برادەرێکی کۆن کە پێشتر هەمیشە پێکەوە بووین خۆی کرد بە ژووراو دیار بوو کەمێ پەشۆکاو بوو وتی کـوڕە ئـەوە خەریکی چیت ئێستا چەن کەسێ لە جەماعەتی ئیستیخبارات هاتنە لای من و هەواڵی تۆیان دەپرسی و ئـەمری گرتنـت هەیە خێرا چارەی خۆت بکە من ئەوا پێم راگەیاندی ئیتر ئارەزووی خۆتە منیش ئیتر دونیام لە پێش چاو تاریك بـوو دەس بەجێ چووم بۆ لای کرێکارەکان وتم کاك شەهاب چاوت لەئیشەکە بێ من دەڕۆم چەن رۆژێ خۆم بزر دەکـەم ئـەویش وتـی خێرە خۆ هیچ نییە منیش مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە ئیتر ناوبراو منی گەیاندە لای ناسیاوێکی خۆی کە هاوڕێیـەتی لەگـەڵ پیاوانی ئیستیخباراتدا هەبوو ئیتر بە هەزار ئەمبەرو ئەوبەر و پارەدان و دەس ماچ کردن ئـەمری گرتنەکـەیان لەسـەرم لابردو لەدوای زیاتر لە مانگێ پەراگەندە بووم ئەم شیعرەم بەو هۆیەوە لە ١٩٧٧/٩/١٨ وتووە.

[٢٨] - چەلەبی – دەوڵەمەند.

بەینێکە بوویتە بـــە هاورێی شـادی
مەستی ناودەریای خۆشی وگوشادی
ـچ لە یادت چوو شـــــــەوو رۆژ دایم
ـتی تۆم دەگـــــــرت زۆر توندوقایم
لە دەربەدەری و لـــە بەندیخـــــانە
لە رۆژی تەنگی و سایـــــەی بێگانە
ـە نەخۆشـــی داو کـــــاتی هـەژاری
ـوەختی تـرس و برســــــیەتی وزاری
هەر لەگەڵتا بووم لـــە رۆژی نەهات
لێت دانابڕام بەیەك لـــە حزەو کات
ودە ئێســــــــتاکەش هەروەکو جاران
ـیمەوە بۆ لات دەســتم بە دامـــــان
من بێتوو هەرگیز هەڵناکـــەم تاوێ
تۆ نەبی ئیتر زینـــــدەگیم نـــاوێ
من دۆســــــــتم لەگەڵ مرۆڤی وەك توو
چونکە تۆ یـەکڕای ناگــــۆڕی زوو زوو

## (كاك سەردار)

كاك سـەرداری نا بەڕێز بەد ئەتواری شەرەنـگێز
سـەر داری یا بن داری بۆچ ئەوەندە لاسـاری
قەت چاکەت لەدەس نایێ شەنە کەی بە هەر بـایێ
خوا غەزەبـت لێ بگرێ بەسیەتی مردووت مـرێ
بۆچ وا لـە دین بێبەری تاکەی وا گێل و کـەری
خێرو شـەڕ هیچ نازانی هەمیشە سـەرگەردانـی
هەردەم غەیبـەت و درۆ پیشـەی تۆیە رەنجـەڕۆ
رەوشـتێ چاك نازانی هەردەم تۆ لـە تێکدانی
گێچەڵاوی و شـەڕفرۆش هەروەکو گێژو سەرخۆش
بە توولی عومـرت هەموو کرداری چـاکت نەبوو
قەت نەبوو تـۆ تـەبابی بڵێن رەحمەت لـە بابی
تاکەی وا چـەوت و گێڕی بەسـیەتی ئیتر خوێڕی
رۆژێ دێ مشـتێ خـۆڵی بۆچ ئەوەندە کڵـۆڵی
چەند رۆژە ئـەم ژیـانە هەژار بۆ خـۆت بزانـە
ئیتر روو لـە خوداکـە وەرە سەر رێگەی چـاکە
بگۆڕە رێگـەی ژینـت روو بکـە لای ئاییـنت
وەربگـرە تـۆزێ ئەدەب گەر هەتە ئەسڵ ونەسـەب
فرسـەتە تەوبـەکە زوو تا تەمەن لە دەس نەچـوو
وەکوو خـەو وایە ژیـان زوو دەچی بەرەو نـەمـان
کەمێ بۆ دونیـاو ئـەولا سوود وەرگرە بـەڕەڵڵا
هەر خوانـاسین تەواوە باقی بڵقی سـەر ئـاوە

کەرکووك- ١٩٧٧/٩//٣١

## (قەڵەم بنووسە)([29])

ـمـ بنووسە چەن دێڕێکی جوان
ـــــــك و بەتام بۆ نەوجەوانان
چەن پارچە شیعری شاعیرانی کورد
لێرە تۆمار کە وەك مەردی مەیـــدان
ـینتەوە لە دەوری رۆژگـــــار
ـخشێنتەوە وەك خونچەی بەیان
ئەو هەڵبەســـتانەی شیرین وجوانن
هەرگیز پیر نابـــێ ناو کۆڕی یـاران
ـیویسـتە رێزی ئـــەدەب بگیرێ
ـەدب بەنرخــــە لەلای میللەتان
گەرچی لە وڵات ئـــێمە جێـــماوە
چونکە گیرۆدەین بـــە دەردی گران
ـە هیوام ئیتر لەمڕۆ بـــــە دواوە
-ووربین لەخەمو مەینەتو گریان
وڵاتمان ئـازاد بـــــەرەو پێش بڕوا
بۆمان بمێنێ کوردســــتانی جوان
ـەر ئاوەدان بێ پڕ خێر و خۆشی
وەك وڵاتانی ســـەر رووی جیهان

---

[29] - بەهۆی کۆکردنەوەی چەن پارچە شیعرێکی شاعیرانی کوردو نووسینەوەی لە ١٩٧٧/١١/١ی. زاینی وتراوە.

## (دەنگی نالەی ئەم گەلە)

دەنگی نالەی ئەم گەلە دێتەگوێم وەکو زەنگە
بەخوێنی لاوەکانی ئــەم خاکە وا گوڵ رەنگە
گەردی بێزاری و خەفەت روخساری پۆشیم تەواو
تۆ سەیری ئەم خەڵکەکە وەك هەیکەلی بێ دەنگە
هەموو کەوتون پەرێشان ژن و منداڵ ونەختیار
کوردە تیماری دەردی خۆت کە خێرا درەنگــە
دەستی یەك بگرن هەموو گەورەو بچووك بەجارێ
ئەم ژێر دەستییە تاکەی براینە گەلێ نەنـــگـــە
شادی و ئاشتی نەماوە لە ناو بستێ لەم خاکە
کوندەبوی شوم دەخوێنێ دایم مەیلی لەجەنگە
زانستی ئەمڕۆ تەواو ئەم جیهـانەی گـــرتەوە
راپەڕە خۆت رزگارکە دەســـا لەم شەوەزەنگە
بە تـــەنها قەومی کوردە بەم جۆرە رەنجەڕۆیە
(هەوری) گەلێ غەمگینە لەم ژین و وەختە تەنگە

کەرکووك – ١٩٧٧/١١/٢٨

## (نازەنین)

ـمنينه نەو نيهـــاله خونچـــه دەم
ـىو بەخەندە وەك گـــولّى باخى ئيرەم([30])
بە ژن و بالاّى جوانە هەروەك شەنگەبى
نازكو ناز پەروەرو شـــــيريـن قەدەم
ـەرچەمى ئاوريشمى خاو دوو ليّوى ئالّ
ـه نيگاى عاشـــق كوژە مانەندى شەم
تۆ لە جينسى ئـــادەمى ياخـود پەرى
هيّندە شۆخى وەك گولاّلەى باخ وچەم
شيرين و لەيلا و زولـــــەيخاو خاتووزين
تۆ لەوان زيّباترى بە خــــوا قەســـــەم([31])
باسى جوانيت ناكرىّ ئەى روو بە خالّ
كەى دەتوانى شەرحى كا پەنجەو قەلّەم
جارىّ نەت پرســى لە حــــالّم دولبەرا
(هەورى) دايــــــم موبتەلاى ئازارو خەم

كەركووك – ١٩٧٨/١/٥.

---

[30] - باخى ئيرەم – باخيّكى يەجگار خۆش بووە دەلّيّن شەدادى كورى عەوص دروستى كردووە.

[31] - زيبا – جوان.

## (تۆ دەتەوێ)

تۆ دەتەوێ سـەرکردە بی
له جێی ئەو پیاوە مەردە بی

باری بە تـۆ بـار ناکرێ
نەکەی دوایـی روو زەر دەبی

کارت هەرگیز سـەرناگرێ
هەتا لەسـەر ئەم عەردە بی

هەتاکوو مـاوی بەم جۆرە
لە نـاو ئازارو دەردە بی

دەمێکە کورد تۆ دەناسـی
پێویسـت ناکا ئازور دەبی

گەر رێبازی خـۆت نەگۆڕی
رۆژێکـت هەیە وردە بی

چاك وایە خۆت دوورە پەرێز
بگری نەکـوو گیرۆ دەبی

سەرکـردەیی زۆر زەحمەتە
تۆ دەبێ بۆ گشـت بـەندەبی

نەکوو بۆ گیان رووت و هەژار
هەڵمەت بەری وەك جـەردەبی

کەرکووك – ١٩٧٨/٤/٣

## (یاخوا زەمانە)[٣٢]

ـ حــوا زەمـانە هەر بارت خــوار بێ
حــــــمرگ و دەروونت پڕ لە ئازار بێ
هەردەم زەلیل و گیرۆدەی خـــەم بی
شەووڕۆژ غەرقی دەریای ماتـــەم بی
جونکە تۆ دایم هەر جەورەنوێنــــــــی
ـۀی هەزاران دڵ دەڕەنجێـــــــــنی
زۆردۆستی گیانی لە یەك جیادەكەی
بازاری نامەرد زوو ئەحیـــا دەكەی

---

- لە سالی ١٩٦٣ی زاینی ئەوە بوو باروذۆخی ئەو كاتە زۆر ناخۆش و نالەبار بــووو هێرشـێكی رەشـبگیری زۆر گـەورەی ـرەواو بێ رەحمانە كرایە سەر میللەتی كورد، خەتـابارو بێ خەتـایان هەر دەگرت و رەوانــەی بەندیخانـەكانی باشـووری ـ لاتیانی دەكرد لەو ئەسنایەدا رۆژێ دەوری گەرەكی رەحیماوا یان گرت و ماڵ بە ماڵ دەگەڕان و ئـەو خەڵكـەیان دەگـرت و كەم كەس لە دەستیان رزگاری دەبوو لەو كاتەدا من و چەن كەسێ لە تەكیەكەی بـاوكم لــە ژوورەوە دەرگامــان داخرابــوو و خومان مات كردبوو ئیتر كەس بەلای ئێمەدا نەهات و لە پاشان بە هەر حالێ بووخۆم گەیاندە مزگەوتەكەی مەلا محەمـەد ـمین لەگەڕەكی تەپەی مەلا عەبدوللا دوو سێ هاوڕێی فەقێیم هەبوو لەوێ لەوانە مەلا سـەید مـارف كـە لــە بنـچینەدا خەڵكی دەوری مەهاباد بوو، بۆ وەرگرتنی زانیاری ئاینی هاتبۆ ئێرە زۆر یەكترمان خۆش دەویست و هاو بیرو ڕێبــازی یـەك بووین نیزیكەی بیست و سێ رۆژ لەلایان مامەوە لە رۆژدا لە مزگەوت خۆم دەشاردەوەو بە شـەوانیش زۆر بــە خۆشــی رامـان دەبوارد رۆژێ لە دوای نوێژی عەسر كەمی چوومە ناو حەوشی مزگەوتەكەزەلامێ خۆی كرد بە حەوشی مزگەوتەكـەدا، سـەر بە هێزی حەرەس قەومی بوو ناوی صالح یاسین بوو كوردی چاك دەزانی و منی دەناسی وتی ها شێخ عوبێد ئەوەچی دەكـەی ئێرە، وتم نوێژی عەسرم كرد و وا تۆزێ لێرە دانیشتوومە ئەو رۆیی ئیتر مەلا سەید مارف وتی شێخ عوبێد هەستە بتبەم بۆ مزگەوتی ئەرسەلان لە گەڕەكی شاترلوو لەوێ برادەی چاكم هەیە ئەوی باشترە بۆ تۆ لێرە چونكە لــەوێ كـەس نانتاســێ ئە نجا لەگەڵ سەید مارف دا چوومە مزگەوتی ناوبراو نۆ رۆژیش لەوێ بــووم ئــە نجا كـەمێ بـاری وەزعەكـە هـێمن بـۆوە خەڵكەكەش كەوتە جموجۆڵ كردن منیش گەڕامەوە بۆ ماڵ بەلام ئەوەی كەڵكی هـەبوو گـیرا بـوو رەوانـەی بەندیخانـەی ( موسەیب ) كرابوو لە باشووری ولات ئیتر تا ماوەیەكی زۆر بە كەمی خۆم دەردەخست لەم رۆرژانـەی دوایــی لــە ١٩٧٨/٦/١٠ چووم بۆ پرسەی ناسیاوێ لە مزگەوتی ناوبراو لە دوای خوێندنەوەی سورەتی فاتیحـە سـەیر ئـەو جێگـەو ژوورەم دەكـرد لەگەڵ سەید مارف و فەقێیەكان پێكەوە ئەو ماوەیە دەژیاین لەوێ ئەو یادگارییـە خۆشـانەم هـەموو دەهاتـەوە یـاد وەك شریتی سینەمایی هەموویم لەبەر چاو بوو ئەو قسانەی سەید مارف لە كاتەدا لە گوێـچكەكانم دا دەزرنگایـەوە ئـیتر زۆر كاری تێ كردم بوو بە هۆی وتنی ئەم پارچە شیعرە لە یادی هاوڕێی خۆشەویستم سەید مارف لە ١٩٧٨/٦/١٠ی زاینی .

هاوڕێی دێرینم مەلا ســــــەید مـارف
پیاوێکی بە دین زۆر زاناو عـــــــارف
چەن ساڵە یادی قەت لـە بـیر ناچێ
خەمی دوورێکەی لـــە دڵ دەرنـاچێ
نازانم ئێستا ئەحـــــــــواڵی چـۆنە
خەریکی چییە لـــــــەم دونیا کۆنـــە
ئەگەر مردووە ڕەحمەت لـە گـــۆڕی
شادبێ بەوەسڵی بەهەشت وحـــۆری
ئەگەر ماویشـــە لە چـــــەرخی ڕۆژگار
هەمیشە گەش بێ وەك خونچەی بوهار
هیچ خەمێ ڕێگەو بەردەمی نەگـــرێ
ئەو ژینەی ماوییە هەتاکوو دەمـــــرێ
(هەوری) یادگـــاری زۆرە لـــــەلای توو
با هەر بمێنێ لـــە نـــــــاو دڵ زیندوو

## (فەصڵی خەزان)

ڕەنگم وەك فەصڵی خـــەزان زەردبووە
ـڵ و دەروونـــــم پڕ لـــە دەرد بووە
کزو مەلوولم وەك تەیری قەفـــەس
هەر دەناڵێنم بێ شەوق و هەوەس
ـرمێسکی چاوم بەخـــــوڕ دێتەخوار
هەروەکوو تاوی بـــــارانــــــی بوهار
شەربەتی شادیم زووخاوی جەرگە
ژیانێکی تاڵ هەردەم وەك مـــەرگە
ـەکونجی خەڵوەت سینەم بوو کونکون
قەت جارێ شـــــــادی نەگەیی بە من
کەوتۆتە لیژی گلۆڵـــــــەی بەختـم
بە تاڵی ڕۆیی گشت کاتو وەختـم
خودا بنێری چەن ڕۆژی شـــــــــادی
کەمێ هەڵمژم هـــەوای ئـــــــــازادی

١٩٧٨/٦/٢٨

## (ئەی مایەی سروور)[٢٢]

ئەی مایەی سروور ئەی شاگوڵی زەرد
ســـاف وەك بلوور زۆر جوان و بێگەرد
تۆ وەرە بڕوێ لە نـــاو دڵـــــی کورد
بۆچی تۆراوی تۆ لە ســــــاراو هەرد
تۆ گەلێ کێشات جەورو جەفاو خەم
وێڵ و دەربەدەر بە هەناســەی سەرد
زۆر کەس هەوڵی دا رەگــت دەربێنێ
بەڵام خۆی فەوتا لووتی دا لـــــە بەرد
رەنگی تۆ گەش هەر گەشــــــاوە بێ
خودا رووی رەشکا دوژمنی نامەرد
رۆژێ دێ بێ خەم بۆ خــۆت و دەڕۆی
سەربەست و شادی دوور لەخەم ودەرد
هیچ کەس ناوێرێ دەستت بۆ بێنێ
بە پشــــــتیوانی تاکی تەنیای فەرد

---

٢٢ - ئەم شیعرە بە هۆی بیرەوەرییەکی نەتەوایەتییەوە لە ١٩٧٨/٨/١٧ وتراوە.

## (شەماڵ تۆ وەرە)

ـــەماڵ تۆ وەرە تیمـارکە دەردم
ڕوناکی بخە ناو سـیمای زەردم
وەك بـرایەکی زۆر دڵســـۆزو چاك
چارەو دەوایێ تاکـــــوو نەمردم
تەگبیری بکە بۆ حــــاڵی زارم
کەمێ بڕوانە هەنـاســەی سەردم
شێواوە تەواو ڕەنگ و ڕوخســـارم
دایم وەك مەجنوون لەدەشتوهەردم
ژیانم گشــتی کوێرەوەری و خەم
تەنها هەر لەبەر ئەوەی کە کوردم
جەورو خراپەم نەبـــــووە بۆ کەس
هەتاکوو بڵێی پاك و بێگــــــــەردم
خودایە هــانام هێنـــا بۆ لای تۆ
پەنا هەر خۆتی تەنیـــای فەردم

١٩٧٩/١/٤

## (ئاسمان بۆ دیسان) ([٢٤])

ئاسمان بۆ دیســـان خەم دەبارێنێ
جەرگی ئەم گەلە بۆچ دەســووتێنێ
دیسان چ قەوما وا لەشکـــــری خەم
خاکی ولاتی داگیر کرد ســـــەرجەم
دیسان تەمومژ رووی ئاسمانی گرت
دارو بەردو شاخ هەمو خەم دایگرت
رووبار لە سەردا زۆر توند دێتە خوار
ئەویش وەك ئێمە نەیمـــــاوە قەرار
ئای لەم زارییە لەم زامە ســـەختە
چونکە ئەم ئێشە زۆر لە ناوەخـتە
فەلەك هەی بێداد هەی پشــتت شکێ
ئێمەت خستە زار دوژمن هـــەڵپەڕکێ
چرای ئاواتــمان گەش بوو کوژاوە
چونــکە بارزانی کـــردی ماڵئاوە
قازیو شێخ مەحموود دوایێ بـارزانی
جەرگی کورد ئەمڕۆ بوو بە بوریـــانی
دەستی شـــــکاوم بۆ ئەم شـــێرانە
لەدنیا دەرچـــــوون زۆر بەمـــەردانە
تازە تا دونیا رۆژی تیـــــــا مابێ
پیاوی تر وەك ئەو قەت پەیـــدا نابێ

[٢٤] - ئەم پارچە شیعرە بە هۆی کۆچی دوایی خوا لێ خۆشبوو جەنابی بارزانییەوە لە ١٩٧٩/٣/٢٨ وتراوە.

ـیەی بەجێهێشت بۆ جەوری ڕۆژگار
ـۆ بن چەپۆکەی ژێر دەســـتی ئەغیار
بێکەس ماینەوە چوار دەورمان گورگە
پەنامان تەنهــــــا خودای بزوورگە
ـنَ دەنــــالێنیَ زۆر بیَ قــــەرارە
ـۆبەدی بەخـــتی کوردی هــــەژارە
هەر ساتیَ خەمیَ یەخـــەمان دەگریَ
هەر ڕۆژی پیاوی گەورەمـــان دەمریَ
من زیاتر نالێنم لــەم وەخـــتە تەنگە
هەر کەس لەم ڕۆژە کز نەبیَ نــەنگە
چونکە کورد بەرەو ڕۆژی ڕەش دەچیَ
ئامانجی دوژمـــن وا بوو جێی بەجیَ
(هەوری) تۆ هیـــوا مـــەبڕە لە ژیان
ڕۆژیَ دیَ کوردیش دێتـــەوە مەیدان

## (تا خوێن نەڕژێ)

تا خوێن نەڕژێ وەکو لافاو — دەشت و سارا نەکا پاراو
تا کەلەپچەو قامچی دوژمن — دانەرزێنێ جەستەو گەردن
تا دڵۆپەی فرمێسکی چاو — بێ ئیختیار نەڕژێ بەتاو
تا نەسووتێ رەزو باخات — وێران نەکرێ خاکی وڵات
تادێهات چۆڵ و هۆڵ نەبێ — ژن و مناڵ کلۆڵ نەبێ
تا بڵێسەی باوەگوڕگوڕ — زیاتر نەبێتە گڵپەو گڕ
تا بوهار زەرد هەڵ نەگەڕێ — گوڵ لەتوونیا هەڵ نەوەرێ
تا بولبول و قومری وهەڵۆ — گشت نەکەونە شین و رۆڕۆ
تا دوو کەڵی خەم و گریان — تەواو نەگرێ بەری ئاسمان
تا میللەت هەموو بەیەك دەنگ — نەدڕێنێ پەردەیی شەوەزەنگ
چۆن ئازادی بەدەس دێنێ — گوڵی سەربەستی دەڕوێنێ

کەرکووك — ١٩٧٩

## (سوێند بێ)

ـوێند بێ بەزاتی پاکی کردگــــار
ـوومم به نووری رەسوڵی نـــازدار
به قەتڵی ناحەق حەزرەتی عوســمان
به هەموو حرووف ئایاتی قورئـــــان
ـ خوێنی پاکی حوسەینی مەزڵوم
ـعبزەی لێوی منداڵی مەعســـــوم
به سۆزۆ دەروون حەزرەتی یەعقووب
بەزامی سەختی حەزرەتی ئەیـــووب
به بەرەکەتی ئیســـــمی یا وەدوود
به نەغمەو سەدای حەزرەتی داوود
به فرمێسکی چاو جگــــەر برژاوان
بەناڵەو کزەی هەمـــــــوو داماوان
هەتا هەناســـــــەم مابێ لە گیانم
بجوولێ خوێنی دەمـــــارەکانم
گیانم دەبەخشـــــم بۆ تۆ ئەی وەتەن
بۆ چیاو دەشت و بۆدارو چـــــەمەن
(هەوری) به شادی تۆوە گوشادە
تۆ کز بی ئەویش خەیلی بەربادە

# (کوردێکم دەوێ)

کوردێـــکم دەوێ یـەك روو یەك دڵ بێ
لە هــەموو دەوری وەك پەڕەی گوڵ بێ
کوردێکم دەوێ مەرد و خـــۆ راگر
هەرگیز نە گۆڕێ دایم سـەرچڵ بێ
کوردێکم دەوێ خەمخۆری گـــەل بێ
لە هەموو کاری ژیرو ئاقڵ بـــــــێ
کوردێکم دەوێ ئاشـنای خەم بێ
لەگەڵ خەفەتدا هەردەس لەمل بێ
کوردێکم دەوێ کردەوەی چـــاك بێ
نەك سودی نەبێ‌و هەر قسـەی زل بێ
کوردێکم دەوێ سەرو ماڵی گشت
هەموو قوربانی یەك مشتی گڵ بێ
کوردێکم دەوێ بۆ میـــــللەتی خۆی
هاواری وەکوو ناڵەی بولبـــــول بێ
کوردێکم دەوێ گەردێ لـەم خاکە
بۆ چاوەکانی وەك سورمەو کل بێ
ئەوەك وەك (هەوری) ئەرکی سەرشانی
بە پشت گوێ بخاو هـەردەم غافڵ بـێ

١٩٧٩/١١/٢٥

## (زۆردارێکی زل)

ـردارێکی زل وەك نەهەنگ | بێ دین و بێ هۆش و دەبەنگ
ـەندێ جار دەهات و دەچوو | کردەوەی چاکەی قەت نەبوو
ـەر و وشکی هەر دەسووتان | بوو بە مایەی شین و گریان
ـونیای وەها کرد تارو تەنگ | لای خەڵکی بوو بەشەوە زەنگ
ـشکی کرد کانیو سەرچاوە | کێڵگەو چەم و رەز سووتاوە
ـەر خەڵکە رووت و کلۆڵە | رەوی دەکرد وەك ریشۆڵە
ـەما خۆشیو شادی و یاری | رۆژو شەو هەر خەم دەباری
ـوڵم و جەورێ وەهای نوان | کەس نەیما تۆزقاڵێ ژیان
ـە زۆرداری وێنەی کەم بوو | ئاوی سەربەرەو ژووردەچوو
جەورو غەدری دنیای پرکرد | ژینی خەڵکی تەواو شڕ کرد
چەن پیاوی مەردو بەغیرەت | وەك شێر بووبە هێزو هەڵمەت
ـێستا گیرۆدەی ناو داوە | هەر چوار دەوری لێ گیراوە
هیچ چارەو دەرمانی نییە | ئەم ژینە کوللە مەرگییە
با پێکەوە یەك هێزو دەنگ | لە رۆژێکی وا تووش و تەنگ
ـراپەڕین گشت هەڵمەت بەرین | ئەم نامەردە لەناو بەرین
کۆت و زنجیرو دیواری | بشکێنین گشت بە یەکجاری
ئەنجا بژین زۆر بە شادی | هەڵبکەین چرای ئازادی
ئاوەدان کەین ئەم وڵاتە | کە تووشی پەنجەی نەهاتە
رەگوریشەی پیاوی بەدکار | نەمێنێ و بڕوا بۆ دوواجار

١٩٧٩/١٢/٩

## (ئەم چەرخە)

ئەم چەرخە کاری گشت بەدرەفتارە
هەمیشـــــە جێگای ئێش و ئازارە
هەموودەم دۆستی پیاوی ئەحمەقە
دوژمنی گیانی کەسی هۆشـــیارە
هەتاکوو جارێ شــــادی دەبینێ
هەزاران کەرەت دڵ برینـــــــدارە
دەردو مەینەتو خـــەم بەلێشاوە
دەورانێ پڕی لە شـــــین و زارە
بۆ کەس هەتاکو ســـەر وەفای نییە
ڕۆژی بە شادی چـــەند ڕۆژخەمبارە
ڕۆژو شەو بەشـــی دەردو مەینەتە
شادی بە ئاستــەم جارو بار دیارە
(هەوری) هەموو دەم گیرۆدەی جەورە
بۆیە بـــــــەم جۆرە لە ژین بێزارە

١٩٨٠/٢/٣

## (خۆش ئامادی)

[illegible] ئامادی ئەی یاری خۆم      دەمێکە چاوەڕێی ئەتۆم
[illegible] بێی شۆخی نازدارم      لالە روو خونچەی بوهارم
[illegible] مانگ لە ناکاو هەڵاتی      روونـاکی رێگەی نەهاتی
[illegible] نە ناوچوو دڵ گوشادە      لەشکری خەفەت بەربادە
[illegible] شکۆفەی لالەو نەسرین      هۆی گوشادی و پێکەنین
[illegible] ی و خۆشی ئامادەیە      دەردو مەینەت گیرۆدەیە
[illegible] دڵ گەیی بە ئاوات      ئەوا یاری ئازیزی هات
[illegible] ی مایەی خۆشییە      ئاهەنگ و بادە نۆشییە
[illegible] دڵ گەلێ مەسرووره      (هەوری) لەخەم خەیلی دووره

## (چەن ماڵە کوردێ)

چەن ماڵـە کوردێ کۆچەر — دەگەڕان لـە دووی لەوەڕ
لەلای مـــەڕو ماڵات بوون — دایم دڵ پڕ ئـاوات بوون
زۆر خۆشیان دەبردە سەر — لە ساراو لە دەشتو دەر
لەبن دەوار لە کوێســتان — رایان دەبوارد ژ یـــان
باعەی بەرخ و قـاڕەی کار — خۆشتر لەسەد عودو تار
ئاوازی قومـری و بولبول — خۆشی دەخـەنە ناو دڵ
بۆنی کەنێـرەو بەیبـوون — وەك دەرمانن بۆدەروون
کانی و کـانیاو رووبـار — لەســەردا کە دێنە خوار
لابــەری دەردو خـــەمن — بۆ دڵ وەکوو مــەرهەمن
بوهارێکی شــین و جوان — شاخ و دەشـت و بیابان
گشت پڕ لالە و گــوڵزارە — هەتا لە چـــاوان دیارە
ماســـت و پەنیرو کــەرە — بەرهەمی بـــزن و مەڕە
بێجگـــە لە تــۆراخ و دۆ — درێژ نەکـــەم گفتوگۆ
زۆر خۆش و بـــە لـەزەتە — خوا نەبڕێ ئەم نیعمەتە
هەر بـــژی کـــوردەواری — بمێنێ دەشـت و شاری

١٩٨٠/٤/١٧

# (خاڵە ڕەحمان)([35])

ماندووە خاڵە ڕەحمان     دێت و دەچێ بەبێ وچان
وەستێ بە ڕۆژ و شــەو     تاکو چاوی دەچێتە خـــەو
بەرچاوی گرتـــووە     دین و ویژدانی بـــــردووە
ماندوو هەناسەسـوار     ڕاناوەستێ وەك گورگی هار
سەری ناوەتەجـەرگی     ژینی شڕو کولـــــە مەرگی
ڕەنجدانە بـــەم ڕۆژگارە     زۆر لە ژینی خۆی بێـــزارە
خۆی لەهیچ کەس ناگەێنێ     بەرێکەوت کەس نـادوێنێ
خێرو پیاوەتی نـــــازانێ     لە درهەمێ هەتا نانـــــێ
ژی هەزاران بـــــکوژێ     خوێنی لەو نـــــاوە برژێ
سەدان لە برسا بـــمرێ     کەس نانێکی پێ نـــەبڕێ
ئاگـای لە دونیا نییـــە     لای ئەوی هەر ئاسایـــــیە
بلێی بێسـوودو کەڵکـــە     بەگێری وەك داری پەڵکـــە([36])
تەنها لە نفووس دا پیـــاوە     بەهاوولاتی نووســـــــراوە

---

[35] - ئەم پارچە شیعرە دەربارەی ڕەوشتی زاتێ لە ١٩٨٠/٦/٧ وتراوە

[36] - پەڵك- جۆرە دارێکە بە زۆری لە گوێی چەم و ڕووبار شین دەبێ، بە زۆری دارەکەی چەوت و گێرە

# پشیلەی هەژار[٣٧]

پشـــیلەی هەژار بۆچ دەمیـــاوێنی
بێگومان دیارە برسی و بێشـــوێنی
وەرە پێشەوە ســـــڵ مەکە لەمن
دەزانـــــم بۆ تۆ کـە زۆرە دوژمن
پارچەیێ ئێســـك یەکدوو لاتـەڕاف
بۆ تۆم داناوە بە نیەتێکی ســـــاف
هەر چەندە کە تۆ چـاکی وبێ زیان
کەچی بەر بەردت دەدەن منـــاڵان
تۆ ســـوودت زۆرە بۆ ئێمەی بەشەر
بەدەست مشکەوە کەوتووینە خەتەر
جاروبار راویان دەکەی وەکو شێر
خۆ دەشارنەوە مشکی کوت وکوێر
هەروەك پڵنگی چـــاپـووك و زیرەك
بۆخۆت دەگەرێی ناومـــاڵ و گـەڕەك

[٣٧] - بەیانیێ سەیرم کرد پشیلەیەکی سپی جوان لە بان دیواری حەوشەکەوە زۆر لەسەر خۆی دێ و پاشان وەستاو دەیویست خۆی بهاوێتە خوارەوە کەچی لە شوێنی خۆیدا راوەستاو هەردوو چاوە جوانەکانی بڕیبوو لە من سەیری دەکردم و جاروبار لەسەر خۆی بە نەرمی دەی میاواند هەروەك مرۆڤێکی ژیرو هۆشیار چۆن داوای روخسەت دەکا بۆ شتێ ئەویش لەسەر هەمان شێوە دیار بوو برسی بوو، بەلام سڵی لەمن دەکردەوە کە بێتە خوارەوە تێگەیشتم کە زۆر برسیەتی نیتر هەڵسام هەندێ خواردنی کە بەو بخورێ لەلایە دەس شۆرمکە بۆ داناو خۆم رۆییم بینیم بە خێرایی کشا بۆ لای و زگی خۆی تێر کرد بوو بە هۆی وتی ئەم پارچە شیعرە لە ١٩٨٠/٧/١٨ی.زاینی.

لە هەموو شوێنێ هەردەم حـازری

ئەرکت زۆر سووکە جێگە نـاگری

[illegible] پێـشەوە لووت قنجی چاوکاڵ

[illegible]ـستی خۆتی ڕەونـەقی ناوماڵ

یارمەتی دانـی تۆ زۆر پێویسـتە

بەڕاسـتی لای من گەلێ مەبەستە

[illegible]ـی لـە دونیا کردەوەی چاکە

[illegible]ـوشـتی پیاوی دڵپاکـە

## (کوردستان خۆشە)

کوردستان خۆشە خاکە جوانەکەت
شاخی سەرکەشی هەورامـانەکەت
چەن جوان و خۆشە شـاری مەهاباد
دەشتی شامات و کرماشـــانەکەت
شارەکەی ســـنە هەم بانەو سەقز
هەتا ناوەندی لوورســـــتانەکەت
لەوێوەش هەتا جەزیرەو بۆتـــــان
دیار بەکرو ماردین شاری وانە کەت
ئەنجا وەرەوە بۆ دەوری زاخــــۆ
عەقرەو دهۆکی بادینـانـــــەکەت
جا بەرەو حەسـەکەو شاری قامیشلی
ڕەونەق و بینای چـــاوە جوانەکەت
سـەیری هەولێر و دێهـاتی دەوری
سـەرچاوەی ڕزق و دەغڵ و دانەکەت
هەتا دەگاتە ســــــەر ئاوی پردێ
وەکوو بەهەشتە ناوچەی شوانەکەت
شاری کەرکـــووك و باوەگوڕگوڕی
یاخوا هەر بـــژی پشـــتیوانەکەت
سلێمــــــانی و دەوروبــەری بمێنێ
جێی بەروبوومە بازیـــــــانـەکەت
خانەقی لەگـــەڵ مەندەلی و کفری
هەتا نیزیکـــی دەربەند خانەکەت

بەرهەمی زۆرو پڕ خێـــــر و خۆشی
سەرانسەر دەشتی گەرمــــیانەکەت
شارەزوور هـــەتا دەوری پێنجوێن
وەك زیوی سافە کوێســــتانەکەت
وەسفی جوانیو خۆشـــــی ناکرێ
ئەو ناوچە هەتـــــا مەریــوانەکەت
خاکی تۆ هەموو بـــەردی گەوهەرە
هەروەك بەهەشتە نیــشتمانەکەت
کوردە دەخیـــــــلە ئاگـــاداری بە
دەسا هەروەکو دڵو گیـــــانەکەت
نەمانی ئەوی نـــــەمانی تــۆیە
دوایی بێ کەڵکە تۆ گریانەکـــــەت
سەدان دێهاتو ناوچـــەو شاری تر
زۆر گەورە و پانە کوردســـتانەکەت
چی بکەم لێرەدا ماوە کەم مــــاوە
تەواو کەم باسی داســتانـــەکەت

کەرکووك – ١٩٨٠/١١/٣

## (عەجایب دولبەرێکی)

عەجایب دولبەرێکی شۆخ و شەنگە
گەلێ بێ وێنەیــە ئەم حۆری رەنگە
قەدو باڵای وەکوو سەرووی رەوانـــــــە
هەتاسەیری بکەی جـوان و قەشـــــەنگە
دوو چاوی وەك ســتارەی بەربەیانە
برۆی مانەندی شـمـشێری فەڕەنگە
لەهەر کوێ دەرکەوێ وەك مانگی چواردە
ئیتر ئەو عالەمە گشـــــــــتی دەبەنگە
دڵم کەوتۆتە ناو بازاڕی ســـــەودای
نەجاتی زەحمەتە لەم گێژە تەنـــگە
ئەوەندە تووندو مەغرووره هــەمــوو دەم
کەمەیلی هەر لەسەر ئاشـــووب و جــەنگە
دەمێکـــــــە دڵ لە دووری موبتەلایە
بەبێ ئەو ئـــــــەم ژیانە شەوەزەنگە
بەســـــــەرچوو نەوجەوانیم تازە رۆیی
تیمـــارکە دەفعەیێ دەردم درەنــــــگە
دەمێکە من دەنۆشــم شەربەتی خەم
بەسە چیتر مەناڵــە (هــەوری) نەنگە

١٩٨٠/١٢/٢٧

## (نازانم چەرخی)

ـ نم چەرخی پیســـــی بەدکردار
ـــۆ نازاری دڵ بۆچی کـــــەوتەکار
دیســـــان وا جەورو ئـــازار دەنــوێنیٚ
سەر لەنویٚ ماڵی کـــــورد دەروخێنیٚ
ـیســــــان نازانم زەمانەی بەدخوو
ـۆچ وا لەم کوردەی شیٚواند زوبەزو
دیســــــان بە ناحەق خوێنی دەڕژێنیٚ
جەرگی کورد وەکو تەنوور دەسوتێنیٚ
ـیسان لەشکری خەم هێرشی کرد
خۆشیو گوشادی هەموو لەناوبرد
دیسان رەشــــــــەباو رەهێــڵەو تۆفان
خونچەی ژیانی کـــــوردی هــەڵوەران
هەوری) ئەم دەورە چەن نالەباربیٚ
ئەم گـــــەلە دەبیٚ رۆژی رزگار بیٚ

١٩٨١/١/٥

# سیاسەتی ئەتماعی ئینگلین[٣٨]

سیاسەتی ئەتماعی ئینگلیز بووکەکورد بەشبەش بووە
بۆیە بەم جۆرە کە رۆژگاری هەمـــــوو هەر رەش بووە
بۆ یەکەمجار بوو کەوا ئەونە وتی هێنایە وجوود
عارەبی هێنایە کەرکووك دیارە کـاریٚ غەش بووە
کورد گەلیٚ قوربانی دا لـــــــەم ڕێگەیە سوودی نەبوو
کێشەییٚکە تاکو ئەمـڕۆ بـــــــاجی خوێنی گەش بووە
ژێر چەپۆکەو لانەوازو بیٚ نەوایــــە ئەمڕۆ کورد
دەوری خۆشی هەرنەدیوە رۆژی تـاڵ‌وهەش بووە
سیاســەتی چەوتی وڵاتی غەربـــــە ئێمەی کرد بە پەن
کورد دووچاری نەگبەتە بۆ دوژمنـــان دوو شەش بووە
میللەتێکی زۆر دلێرو زیرەك و هۆشـیار و مەرد
حەیفە یەکیەتی کەمە نامن دەڵێم هەر نەش بووە
غەیری ئیســـــــتیعماری زۆردار فارس و تورك وعەرەب
بۆ زەلیلی کورد هەموو دەم کردەیــــان هاوبەش بووە
قەومێکی راستگۆو نەجیبە کردەوەی مەردانەیە
تا لەرویی ناحەزانی دیارە رووی هەرگەش بووە
(هەوری) گەرچی ئەم گــــــەلە دووچاری باری زیللەتە
خۆ زەمانە شـــاهیدە لاوانی هەر ســــــــەرکەش بووە

[٣٨] - لە نە نجامی نا نومیدی گەلی کورد و بێبەشکردنی لە مافی نەتەوایەتی خـۆی لــە ناومراسـتی حـەقتاکان بـە هـۆی سیاسەتی چەوتی نـامرۆڤانەی دەولەتە زل هێزەکانی رۆژئـاوە ئەم پارچە شیعرە لە ١٩٨١/١/٢٩ی. زاینی. وتراوە.

# (وەسفی شاری هەولێر)

هەولێر شـــارێکی زۆر خـۆش و کۆنە
ســـەیری مێژوو کـــەی دەزانی چۆنە
قەلا بەرزەکەی لـــــە دوور دیـــارە
جێگەی هەوارگەی چەن شەهریـــارە
چەندەها ســـــــــاڵە دروست کراوە
ئاوەدان بووە هـــــــەر پـارێزراوە
منارەی چۆڵی زۆر دەوری دیـــــووە
زۆر رۆژی خۆشی وســـــەختی بڕیوە
شـــەڕو ڕووداوی داراو ئەســـــکەندەر(٣٩)
چەند ڕووداوی تر زۆر تووش وخەتەر
چەن خۆشی وتاڵی و گـــــرانی گەورە
یەك لەدوای یەك هەتا ئـــــەم دەورە
چەند پاڵـــەوانی مەردو بە جـــەوهەر
چەن پیاوی وەکـــوو سوڵتان موزەفەر(٤٠)
ئێستاکەش هەولێر جێی بەچکەشێرە
لاوانی مەردو ئـــــــــــازاو دلێرە
تا دونیا ماوە هـــــــەر بژی هەولێر
سەربەرز بمێنیٚ بۆ کــــــوردی دلێر

١٩٨١/٣/٧

---

٣٩ - دارا – داریوش کوودومان کوڕی داریوشی یەکـەم بـووە دوا پاشـای هەخامەنـشین بـووە ئەسـکەندەری کـوڕی فلـیپی مەقدۆنییە لە ٣٣١ی پێش زایندا پەلاماری هەولێری داو لەوێ داریوشی شای ئێرانـی بەزانـدو دەوڵـەتی هەخامەنـشینی رووخاند.

٤٠ - سوڵتان موزەفەر لە رۆژگاری سوڵتان صلاحەدینی ئەیوبی حاکمی هەولێر بوو.

# (جان دەبرژێ)

جان دەبرژێ وەك كەبـــــابە
دڵ دەناڵێ چوون روبـــــابە
تیغی ئەبرۆت جەرگی لەتكرد
جامێ بێنە لەو شـــــــەرابە

لەو شـــــــەرابە تۆزێ تێكە
دڵ بریندارە دەمێــــــــــكە
موبتەلاو دووچـــــاری دەردە
هەر دەمەی تـووشی خەمێكە

خەم دەباریێ بـۆم هەموو دەم
كەوتمە نـــــــاو ئاهوو ماتەم
جەرگی برژاندم زەمـــــــانە
loولی دام گێــــــژاوی خەم

رۆژگـــــــار زۆر لێم بە قینە
ئاگری ســـــــــینەم بەتینە
دێتە خوار فرمێسكی چاوم
رۆژو شەو پیشـــــــەم گرینە

ئاهی سینەم زۆر بە جۆشـــە
نـــــالە نـــالم وەك نەخۆشە
وەك گوڵی بێ ئاو كەساســم
هەموو ژینم ســــــــیا پۆشە

وەخت و كاتم گشتی ماتــەم
خۆشی نابینم بە ئاســــــتەم
وام لە ناو گێژاوی مەینـــەت
شەو دەنــــــالم رۆژم هەر خەم

رێگەیی دوورم لە پێشــــــــە
زامی ســـــەختم زۆر بە ئێشە
(هەوری) شـێواو حەزینـــــە
گشتی جەوری خزمو خویشە

١٩٨١/٤/١٧

## (دیسان هاتەوە)([41])

ـیسان هاتەوە خەم وەکوو تۆفان
ـتاگوڵێ تری ئێمە ی هەڵوەران
مەرگی ناوادە زوو گەیێ سەری
خوێنی ڕژاندو بڕی جگەری
ـوحی هەڵفڕی بۆ باخی جینان
ـۆ لیقای باری ڕۆیی بێگومان
دونیای نەدیبوو هێشتا منداڵ بوو
جوان و بە ئەدەب خاوەن کەماڵ بوو
ـۆر خۆشەویست بوو لای کەس وکاری
بەتایبەت لەلای دایکی هەژاری
بەبێ کەس کوشتت لە ناو غەریبی
دوور لە خزم و کەس بەبێ تەبیبی
لە ڕۆژی جەژنی قوربانی پیرۆز
بوو بەقوربانی بۆ گەل و بۆ هۆز
ئەو رزگاری بوو گەیشتە حزوور
ئێمەی بەجێهێشت دەرون وەك تەنوور
(هەوری) داواکە لە زاتی باری
سەبووری بدا بە کەس وکاری

---

[41] - ئەم پارچە شیعرە بە هۆی شەهید بوونی عەبدوڵڵای مەلا سەید ئەحمەدی فەیلەسووف لە ڕۆژی ١٩٨١/١٠/١٩ی زاینی وتراوە.

## (قەسەم)

قەسەم بە گۆڕی مردگم      شتێك ئەڕات هاوردگم
گەلێ خۆش و بە لەزەتە      لای کورد چاترین نیعمەتە
فرێی بدە لە ئاو و دۆ      ئەنجا هۆشت بێنە سەرخۆ
ئەم مەتەڵە زوو هەڵێنە      ژیری خۆتمان بۆ بنوێنە
ئەم شتە بزانە چیە      بیرکردنەوەی گەرەك نییە
لەناو کوردا زمستانان      دەینێنە ئاو بۆ سبەینان
سێ مانگەی زستان تابوهار      زیاتر دەیخوا پیاوی مەردار
ڕەنگی چەرمی وردو کلۆ      ئەگەر ژیری بیزانە تۆ
(هەوری) مەتەڵی زۆر جوانە      ئەوەی کورد بێ لای ئاسانە

١٩٨١/١١/١

## (ئەی پیاو چاکانی)

ـەی پیاوچـــاکانی دونیا بەگشتی
ـۆمان بنێرن پەیـــامی ئاشـــتی
هــــــەڵی گرتبیّ کۆترێکی سپی
دوژمـــــن نەزانی خێرا بەکـــپی
ـەیـــامێکی وا مـــــژدەی رزگاری
ـۆ کوردی هەژار بێنیّ بـــــەدیاری
لەسـەری لاچی زوڵم و جەورو زۆر
بەرۆکی دەگریّ رۆژی بەسەد جۆر
ـۆژگاریّ دووره کـــورد ژینی تاڵە
ـەدەس غەیرەوە پەرێشـــان حاڵە
بەئارەزووی خـۆی خوێنی دەمژیّ
ئـەوەی حەق بـڵێ خێرا دەیکوژیّ
زۆر خوێنی رژان بۆ ســـــەربەخۆیی
لەبەدبەختی کورد بـــە فیڕۆ رۆیـی
خاکی سەرانســـــــەر داگیرکراوە
دابونەریتی هەمـــــــووی گۆڕاوە
جێگەیـێ نییە کورد تیا بســـرەویّ
دەورانیّ نەبوو کەمیّ دەرکــــــەویّ
رۆژی ســـەد جۆرە زوڵـمی نارەوا
چەن ساڵە حاڵی بەم جـۆرە دەڕوا

هەمیشـــــە ژینی خـــــەم و تالاوە
ماف رەوای خۆی لیْ زەوتـــــکراوە

بەڕاستی دەورو رۆژگـــــاریْ تەنگە
بۆکورد هەموودەم وەك شەوەزەنگە

بەلام نیزیکە تیشـــکی زەردی خۆر
هەڵبیْو دوژمنی کـــورد بخاتە گۆر

رۆژگار بگۆڕیْ بە دەوریْکـــــی تر
شادی بیْیتەوە ناومان کوتـــــوپڕ

(هەوری) ئەو وەختە ئیتر خۆشحاڵە
لەلای نامیْنیْ مەینەت و ناڵـــــــە

کەرکووك – ١٩٨١/١٢/١٢

## (زەمانە دەڕوا)

ـمانە دەڕوا هەروەکوو ســـێبەر
ـە کاتێ زانییت دەچێتە ئەوسەر
کەواتە روو کە دەرگـــــاهی باری
پێش ئەوەی کەوا مەرگـت بێتەسەر
ـمبە بە درك لـــە رێی هیچ کەسێ
ـ هۆی ئاژاوەو فیتنەو دەردەسەر
وەك گوڵی بەیان گەش‌وروو‌خۆشبە
با بۆنت هەبێ وە رەیحانەی تـــەڕ
ـەردەم پشتگیری حەق و راستی بە
ـوژمنی درۆو غەدرو زوڵم و شـــەڕ
خۆت گیان فیداکە لە رێی هەژارێ
پلەت بەرزە بێ لەلای دادگــــــەر
هەوری) تۆش دایم بۆ دین و وەتەن
ـەوەستە هەتا رووح ماوە لەبــــەر

١٩٨٢/٥/٧

## (ئەی فەلەك)

ئەی فەلەك تاكـــــەی  وێڵ و بێ لانە
كەوتمە بەر لێشـــــاو جەوری زەمانە
هەموو دەم لە نــــــــاو دەردو ئازارم
بێ دۆست و هاورێی لــــە ژین بێزارم
سەیلی سروشـــــكم وەك تاوی بوهار
لەسەردا بەتاو كـــــە دەڕژێتە خـــوار
شێواوە تەواو رەنـــــگ و روخـــسارم
گیرۆدەی دەســــــتی جەوری روژگارم
ئای بۆ ئاوازێ خۆش بە تـــــــەئسیر
كەمێ ئەم خەمە لابەرێ لە بیـــــــــر
تاوی دڵەكەم ســـــــــــاڕێژ بێ زامی
بێتەوە سەر خۆ هەمـــــــوو ئەندامی
ساتێ بە شـــــادی بێ خەم وە خەیاڵ
سەربەست بگـەرێم وەكوو بای شەماڵ
خەمی زەمـــــــــــانەم هیچ لا نەمێنێ
ژیانێ تازە خۆی بـــــــــــۆم بنوێنـێ
بۆخۆم بگـــــــــەڕێم بە ئارەزووی دڵ
بگەشێمەوە وەك خونچەی ســــەرچڵ
ئەویش زۆر دوورە لەم عەسر و وەختە
چونكە رۆژگاری زۆر تووش و سەختە
(هەوری) گیرۆدەی ناو دەردو مەینەت
خانەخۆی خەمە رۆژی ســــەد كەڕەت

١٩٨٢/٨/٢٣

# (بەخێر بێ)[42]

ـەخێر بێ ڕۆژی مەولودی رەسولْ
ـڕوناکی خستە ناو دڵەی مەلول
هەر بە هاتنی دونـــــــیا ڕووناك بوو
ڕوی ئاسمان وەکوپەڕەی گوڵ پاك بوو
ـشەق بوو ئەیوانی کیسـرا لە تاوە
ـبەرزێر ئەرزا چوو ئاوەکـەی ساوە
موژدەی خۆشـــــــی بە جیـهان درا
پەرستگای بووت و ســەنەم تێــك درا
ـڕۆژگاری تاڵی گۆڕا بـــە شـادی
لە جیهان درا بانگـــــی ئـازادی
رزگار بوو کۆیلەو ئەسـیرو هــەژار
لە جەورو زوڵمی زاڵمـــــــی زۆردار
ئاسایش کەوتە تـــەواو دونیـاوە
دەرگاهی خێرو خـــۆشـی کراوە
دونیا ڕووناك و زەمین گوڵشـــەن بوو
کانیاو هەموو جوان و ڕەوشـــەن بوو
هەزاران هـــــەزار دروودو سەلام
بۆ گیانی پاکی سەروەری ئیسلام

---

[42] - بە هۆی بیرەوەری لە دایکبوونی پێغەمبەری مەزن –د.خ)- لە ١٩٨٢/١١/٢ وتراوە.

## (گەردوون)

گەردوون شـــكاندی بادەی دەســـتم
بەناحەق دیسان شێواندی هەســـــتم
هـەر چەن هێرشی خـەم خەست‌و چڕبێ
بە قومێ شـــــــەراب کەچی من مەستم
فەلەك لافاوی خـــەمی بۆ مـــــن هات
بۆیە بەم جۆرە خەمگین و پەســـــــتم
لەشکری خەفەت وا دەوری گـــــــرتووم
لەناکاو خێرا وا دەســـــتی بەســـــتم
ژیینم بەســـەر چوو گشــــتی بەتاڵی
تەمەنی لاوی زوو چوو لە دەســــــتم
سەبا سەت دەخیل نامەی یــــــار بێنە
بەڵکوو ساڕێژ بێ برینی خەســــــــــتم
(هەوری) بێزارە لە چـــەرخی ڕۆژگار
چونکە هەموودەم هەر جەرگی گەستم

١٩٨٢/١٢/١١

## (ئەزیزان ئەم ژیانە)

ـەزیزان ئەم ژیـــانە هــەر عەزابە
ـرووزەی دڵ دەبینـــی وەك كەبابە
بە رۆژ وشـەو لەناو جەولانی مەینەت
هەمو وەختم لەدەسچوو پر لە زیللەت
ـە شادی گەر دەپرســی زۆر زەلیلە
ـناو لێشاوی خەمدا چەشنی دیلە
زەمانە خەم دەبـــارێنێ هەموو دەم
دەسووتێنێ تەواو ئەندامی جەستەم
ـە ناو گێژاوی دەریـــای بێ قەراری
ـە چاوم دێتە خوار فرمێسكی زاری
هەمیشە لە حزەیێ خۆشـیم نەماوە
دەناڵێنم بەدەس دەردو بـــــەلاوە
بڵێسەی ئاگرێ بەربۆتە جـــەرگم
كە كۆتایی نییە تا كاتی مـــەرگم
هەموو دونیا وەكوو زیندانە لای من
لەبێ بەختی هەموو لێم بۆتە دوژمن
ئەسەف (هەوری) دەناڵێ چەن زەمانە
گەلێ بێزارو پەســــــتی لەم ژیانە

كەركووك = ١٩٨٣/١/٣٠

## (ئەمڕۆ ڕۆژگاریٚ)

ئەمڕۆ ڕۆژگاریٚ سەخڵەتە ... دڵم مەنزڵگای خەفەتە
ئەوەندە کزو خەمبارم ... تەواو لەم گیانە بێزارم
چونکە دەردم زۆر گرانە ... گەلیٚ تالە ئەم ژیانە
یەك تۆز ڕۆشنایی نەماوە ... هەر چوار دەورم لیٚگیراوە
هەرچی دەبینم خەمبارە ... بە هەزاران دەرد دوو چارە
دەرگای خۆشی داخراوە ... مەینەت ئەمڕۆ بە لیٚشاوە
شادی زۆر کزو زەبوونە ... پێکەنین هەر توونا و توونە
سەیران و یاری نەماوە ... خیٚڵی خۆشی بەند کراوە
ناژننەوی گوفتاریٚ بەتام ... مەینەت ئامادە بەردەوام
بەڵام ڕۆژگاری نالەبار ... یا هەر خەم بڕژیٚنیٚ بەبار
یا لافاوی دونیا بیٚنیٚ ... ڕۆژیٚ سەدان بخنکیٚنیٚ
یەك زمرە خۆشی و شادی ... نەهیٚڵیٚ غەیری بیٚدادی
یاچی ڕیٚگە هەیە بیبڕیٚ ... یا چی قەڵا هەیە بیگریٚ
ڕۆژی سەدان لاو بکوژیٚ ... خوێنی لەو ناوە بڕژیٚ
یا خاکی ئەم نیشتمانە ... گشت بکاتە بەندیخانە
ڕۆژی دیٚ تۆڵە بستیٚنیٚ ... ڕەگی دوژمن لە بن بیٚنیٚ
کەلەپچەی دەستوپیٚدەبڕیٚ ... وەکو مەرد سەری هەڵدەبڕیٚ
هەڵدەکا چرای ئازادی ... نامیٚنیٚ دەوری بیٚدادی
داروبەرد هەموو سەرانسەر ... جوانی دەنوێنیٚ وەك ئەختەر([٤٣])

١٩٨٣/٢/١٦

[٤٣] - ئەختەر- ئەستێرە.

## (بوهار پەیدا بوو)

بوهار پەیـــدا بـــــوو دونیا رازاوه
درەختی سەر ئەرز هەمـــــــوو ژیاوه
لە خاك هاتە دەر وەنەوشـــەی شاخان
رزگاری بووه لـــــــــه بـــەفرو تۆفان
دەشتودەر هەمـــــوو جوانو رەنگینه
پڕ لە گوڵاڵه و لالـــــــــــه و نەسرینه
پیرەمەگروون و هەڵگـــــوردو قەندیل
لەسەریان ناوه وەك مـــــــەلامەنـــدیـل
سپی چناری گوێ رووبـــــــارو چەم
رزگاری بووه لە رەشـــــــــەبای خەم
کانیاو روونوساف گشت دێتە خوارێ
ئاوونگ لەســـــــەر رووی گولان دەبارێ
بولبول بە نەغمە دەخـــــوێنێ بۆ گوڵ
سەربەست دەگەڕێ لەم چڵ بۆ ئەو چڵ
سەر لە بەیانی شـــــــنەی بای شەماڵ
کە دەجولێنێ گوڵاڵـــــــــەی قەد پاڵ
قومری دەخوێنێ ئـــــاوازی پڕ جۆش
داروبەرد هەمـــــــــوو دێنێت خرۆش
تێکەڵاو دەبێ بە ســـــــۆزی شمشاڵ
مرۆڤ دەخاتە ناو دەریـــــــای خەیاڵ

# (ئەی وەتەن)

ئەی وەتەن داخت دەرناچــێ لە دڵ
مەگەر ئەو کاتەی دەمنێنە ژێــــرگڵ
ئەو خوێنەی گەشت بەناحـــەق رژا
گەلی کورد بۆ تۆ جگــــــەری برژا
ژن و ئەختیـــــــــارو منداڵی ساوە
زۆر بە مەزلوومی هەمـــووی کوژراوە
با شـــــیوەن بکەم بۆ کوردی هەژار
خوێن لەچاوم بێ وەك جۆگەورووبار
کوردی قوڕ بەسەر بێ دۆستوبێکەس
گشت کزو مەلوول لە بەندو قەفـــەس
ئەی وەتەن شەرتە شــەرتی مەردانە
هەتا هەناســــــــە مـابێ لەم گیانە
سوێند بێ بە خاکـی رەش هەڵگەڕاوت
بە کزەی دەروون ئـــــەختیار و لاوت
بۆ تۆ بێ ئێسك و وجـوودو خوێنم
تاکوو دوژمنت لـــــە رەگ دەربێنم
(هەوری) تێکۆشە بۆ کــوردی ئەسـیر
تا رزگــــــــاری بێ لە کـۆت زنجـیر

١٩٨٨/٩/١

## (نازانم بۆچی)

-زام بۆچ وا بێ شـــــەوقی رۆڵە
خەمی گشت دونیات تۆ وا لە کۆڵە

دەمێکە بێ سووچ خـوێنت دەڕژێ
ئەم کوردە گەلێ کزو کلۆڵـــــــە

تکەی چاوەڕێی دەورو رۆژگــاری
وەك مەرد وەرگرە لە دوژمن تــۆڵە

وڵاتت گەلێ جـــــــوان و شرینە
خۆت فیداکە بۆ مشـــتێ لەم خۆڵە

ئەم خاکە کەوا جێگەی سەفا بوو
ئێستا وێرانە سەرانسەر چـۆڵــە

ئەوکەسەی دوژمن بەخاکی خۆی بێ
بــزانــە یــەقین نـامەردو زۆڵـــــە

(هەوری) تۆ بۆ کێ ئەم باسە دەکەی
کۆتــاکە ئیتر ئــەم بۆڵە بــۆڵــە

١٩٨٨/٩/٢٠

## (وەڵامی نامەیێ)[٨٥]

براى ئازيزم كـــاك حــــــەمە رەشيد
كوردى دڵســـــــۆزو نەجيب و عگيد

دەنێرمە خــــــــزمەت رێزو سڵاوم
لاى من ئازيزى هەتـــــــاكوو ماوم

پرسيارى ژين و ژيــــــــانت دەكەم
بە هيوام هەرگيز رێت پێ نـەگرێ خەم

قەت تووشــــــــت نەبێ زەرپێ ئازار
هەر گەشـــــــاوەبێ وەك لالەى بوهار

دوژمنت هـــــــــەردەم كزو زەليلە بێ
لەناو دەرياى خـــەم بە وێنەى ديل بێ

بە رۆژ بە شـــــــادى بە شەو بەختيار
ســـــــەر دانەوێنێ لە ئاستت رۆژگار

يادەوەرى تۆ هــــــــــەردەم زيندووە
لەدووتۆى دەروون جێى خۆى گرتووە

رۆژگار ئەوەندە نـــاخۆش و ســـەختە
كەس ئاگاى لـە كەس نييە لەم وەختە

زۆر مەمنوونى تۆم نامـــــەت ناردووە
يــــــــــــادى منت زۆر تێدا كردووە

ئازارو خەمى لە دڵدا نەهێشــــــــــت
خۆشەويستى نوێ تێدا بەجێ هێشت

بەراســـــــــتى ديارە كەسێ بە وەفاى
بۆ (هەورى) مايەى گوشادى‌و صەفاى

---

٨٥ - وەڵامى نامەى هاورێيەكى ئازيز لە ١٩٨٨/١٠/٧ى. ز وتراوە.

# (لەبەر جەورو خەم)

ـەر جەورو خـەم قەت مەناڵێنە
ـچەن ڕۆژ ژیان خۆت مەدۆڕێنە
وەك شووڕای پۆڵاو ئاسن بە هەردەم
لەسەر حـــەق چاوی دوژمن دەربێنە
ـەس بخەنە ناو دەسـتی یەكتری
ـگەڵ برای خۆت مـەردی بنوێنە
ئەو كەســـــە پیاوە مەردو بەغیرەت
خاوەنی وەفاو شـــــــەرت و بەڵێنە
ـوت بگرە لەبەر جـــەوری ڕۆژگار
ـەم دونیا بۆ كەس سەر دامەنوێنە
زۆر ئاگادار بە لە كـاری نـاشریــن
بۆ شتێكی پووچ خۆت مەفـــەوتێنە
هەرگیز لامەدە لەسەر ڕێگەی حەق
بۆ دین و وەتـــــەن خوێنت بڕژێنە
ژینی ژێر دەستی بـــــڕاو نەمــێنێ
ڕاپەڕەو حەڵقەی دەستت بشكــێنە
بێ ڕەنج و زەحمەت ناگــەی بە ئاوات
(هەوری) تۆش بێسود عومر مەچوێنە

١٩٨٨/١١/١٠

## (دەمێکە من)

دەمێکە من دەنـــالّم هەروەکوو نەی
دەڵێن دێ رۆژێ شادی چاوەکەم کەی
هەمووعومری بەسەرچووگشت بەتاڵی
دەبێ کەی بێ بکەم من تۆزێ ئۆخەی
لەناو ئازار و جـــــەورا وا دەبرژێم
بەخۆت تیمارکە دەردم خــالقی حەی
هەمیشە دێتە خوار فرمێســکی زاری
دەبینی رەنگەکـــەم زەردە وەکوو بەی
خوڕەی خوێنی دڵـم دەڕژێ هەموودەم
تەواو ئەم خەڵــــکە بێزارە لە نـاڵەی
ئەوەندە باری خــەم کەوتۆتــە سەرما
دەروونم واگڕەی دێ بۆ قوومــێ مەی
خوا رەحمی بەحــــاڵی خۆم و قەومم
ئەوا پردی ســەبر رووخــــاوە پایەی
وەکوو ئەیوب دەمێکــــە چاوەڕوانم
دەبێ کەی دوژمنانم تۆ لـــە نـاوبەی
ئیتر (هەوری) گوشـــــادی بێتەوە یاد
لەناو ئازاری رۆژگار بەس بکـــا وەی

کەرکووک- ١٩٨٨/١١/١٣

## (تۆ ئەی دەعبا)

| | |
|---|---|
| ـۆ ـەی دەعبا ئەی خوێنمژ | ئەی دڕندە ئەی پیاوکوژ |
| ـەی خوێنڕێژ ئەی تۆقێنەر | مێردە زمەی مەرگهێنەر |
| ـەی هێلانەی خەم و دەرد | ئەی بێ جەوهەری نامەرد |
| ـۆ ـێوی یا جانەوەر | ئەی لە ناوبەری بەشەر |
| ـەد و جەورت بە لێشاو | دونیای داپۆشی تەواو |
| چەم و دار گوێزت سووتان | کانیاوت گشت کرد وێران |
| ـێن و گریان و زاری | هەمووی دێنێ بە دیاری |
| ـێشکەشی دەکەی بە گەل | ئەی بی کەڵکی تەوەزەل |
| ـەجوولا هەستت جارێ | بۆ منداڵی هەژارێ |
| کـتێ کە باوکت دەکوشت | خوێنت بە ناحەق دەڕشت |
| ـ گوندێکت دەڕووخان | هەمووت دەکرد سەرگەردان |
| ـزگەوت کە ماڵی خوایە | جێگەی نوێژو تەقوایە |
| ـێرانت کرد بەر لە گشت | تێکەڵ دەبوو خۆڵ و خشت |
| ـەڕەی قورئان لەگەڵ با | بەرەو ئاسمانی دەبا |
| ـوڵمی وا رووی نەداوە | خەڵك بە کۆمەڵ کوژراوە |
| لەمەوبەر چەن زاڵم بوو | قەت مانەندی تۆ نەبوو |
| سەد وەك هۆلاکۆی بەدفەر | گشت خوێنمژانی بەشەر |
| یا جەنگیز خانی نامەرد | سووتانی گشت دارو بەرد |
| یاخۆ زوحاکی زۆردار | نەفرەت لە زوڵمی سەدجار |
| یا خۆ جەوری رەزا خان | چی کرد بە کوردی ئێران |
| یا خوێنڕێژی وەك هیتلەر | دونیای سووتان سەرانسەر |
| یافێڵبازی وەك چەرچل | چەوسێنەرو داخ لە دڵ |

سیاسەتی دونیای شـــێوان
هەزاران کەســــــــی رەنجان

تێك دەری چینی بەشـــــەر
سەرمایەی شـــــەڕو زەرەر

یاکەمال ئەتـــــــــا تورك
بۆ گیـــان کوردان وەك گورگ

ناڤەك شـــــەڕواڵی دەبڕی
زگی منـــــــــــدالّی دەدڕی

هی وەك تۆ نەبــــووە هەر
حاشا لە نەســـــــلی بەشەر

زوڵم و جەورت بــــێ پایان
ویژدانی دونیـــــای هەژان

ناترسی لە قەهــــــری خوا
کاتێ کـــــــە رۆژگار شێوا

بۆ کوێ دەچی قـــوڕ بەسەر
دەکەوییـــــــە داوی خەتەر

باریك دەکـــرێ وەك دەرزی
وەك چۆلـــــــەکە دەلەرزی

نامێنێ یــــەك بست مەفەر
روحت دەچێ بۆ ســــــــەقەر

کەرکووک – ٨٨/١٢/٢٧ ؛

## (گەلیٚ تێکۆشام)

ـمێ تێکۆشــــــام بکەم بە مەرام
ـچی بکەم زەمانە یارمــــــەتی نەدام

ئەم چەرخە بۆ من نەســـــوورِا جاریٚ
دایم پەرێشان هەر دەربــــــەدەر مام

ـرە چەشت ساردی‌و گەرمی لەژیان
ـسەرو ئەوســـــەر زۆر جێگە گەرِام

هەر رۆژیٚ هەزار خەم و ناســــــۆری
بەدەس دەردەوە تەواوی فەوتــــــام

ـۆر قسەی ســــاردی ناحەزانم بیست
ـسەر قەومــــی خۆم زۆر ئــــازار درام

رۆژگار لە راست من هەر چەوتی هێنا
لەناو شــــــــەپۆلی مەینەتدا خنکام

ـۆر پەرێشــــــانی و رەنجەڕۆییــم دی
چەن بەردی گەورە هاتە ســــەر رێگام

خودا بنێریٚ دەورانــــــــــــی شادی
گەلیٚ بێزارو بیٚ شــــــــەوق و نەوام

با بەس بیٚ ئیتر فرمێســــــــکی زاری
هەوری) شێواوە ســــــەرتاپا ئەندام

١٩٨٩/٢/٤

## (شەماڵ دەخیلم)

شەماڵ دەخیلم تووخوا زوو وەرە
کەمێ ئەم خەم و دەردەم لا بـــەرە
تۆ ببڕە ڕێگـــە دووری ترســـــناك
هەواڵی ئێمـــــــــە بۆ ئومەم بەرە([86])

هەر چەن ڕێگایێ زۆر دوور و سەختە
تایبەت بۆ ئێمە ئەمڕۆ لـــــــەم وەختە
کەسم نەبینی وەك تۆ ســـەربەست بێ
دەزانم هێزت بـــــــە توندو جەختە

کاتێ گەیشتیە هـەوارگەی مەردان
ئەوەی کەلاتە زوو بیکـــــــە بەیان
بە جۆرێکی وا دەروون بلـــــەرزێ
ئاگر بخاتە ناو دڵی ئینســـــــــان

بڵێ گەلێ هەن زۆر بـــــــەش خوراون
لە میللەتــــــانی جیهــــــان جێماون
هەمیشە حاڵیان گـــــــــــەلێ پەشێوە
زۆر پەرێشـــــانن تـــــــەواو فەوتاون

سکالای ئێمە بەرە بەردەســـتیان
پاشان بزانە ویست و مەبەستیان
ئایە ئامادەن هاوکاریمـــــان کەن
تەواو بڕوانە لـــــە بیرو هەستیان

تۆ بڵێ کەمێ تیمــــــــار دەردمان کەن

---

[86] - ئومەم – مەبەست لە نەتەوە یەکگرتووەکانە بەشێ لە ئیش و کاری وڵاتان دەبا بەڕێوە.

یا تۆزێ چارەی رەنگــی زەردمان کەن
هەروەك برایێ زۆر دڵســـــۆزو مەرد
پارێزگاری ژین و عــــــەردمان کەن

ـکو جوولا بێ تـۆزێ ویژدانیان
ـابێ بیرو هەســـــتی جارانیان
ـرانبەر ئێمە دڵیـــــــان گۆڕابێ
ـو بیخەنە کار وتــــەو بڕیاریان

شتێ دیاری کــەن بۆ کــوردی هەژار
کەمێ ببەستن دەس پیـــاوی زۆر دار
نەهێڵن چیتر خوێنــــــــمان بمژێ
بگەشێنەوە وەك لالــــــــەی بوهار

ـم رۆژگارەو دەورانـــەی ئەمرۆ
ـبینم هەروەك دەوری هۆلاکـــۆ([87])
چەن ساڵە مەینەت هەر بەردەوامە
بۆ کوردی هەژار هەر شین و رۆڕۆ

میللەتێکین زۆر مەردو بــــە غیرەت
هەموو بەرێزو بە قەدرو حورمــــەت
بەڵام زەمانە پشتمــــــانی نەگــرت
هەردەم گیرۆدەین ناوداوی نەگبـــەت

[87] - هۆلاکۆ – یەکێکە لە فەرماندە خوێنرێژەکانی جەنگیزخان بەرەگەز مەغۆلن لە ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتووە لە ساڵی ١٢٥٨ی. زاینی، بەغدای داگیر کردووەو وێرانی کردووە.

میللەتێکین کۆن لە مێژوو ناســـــراو
خاوەن زمان و جێگەو خـــــاك و ئاو
چونکە چوار دەورمان هەموو ناحەزە
لە هەموو رووێ بێبەش و جێــــــماو
گەلێ بێزارین لـــــــــــەم ژینە تاڵە
شادی لە ناومان شــــــــتێ مەحاڵە
هەموو دووچارین گـــــەورە تا بچووك
خەفەت دەبارێ چەشـــــــــنی گەواڵە
هەزار ئەوەندە دەردمان گـــــران بێ
هەمیشە بەشـــمان شین و گریان بێ
خۆشی نەمێنێ لەسەر رووی زەمین
لێشاوی بەڵا هەروەك تـــــۆفان بێ
یا هەردەم دونیا تاریـــــــك و تەم بێ
لە هەموو لاوە شــــین و ماتـــــەم بێ
رۆژێ هەر دەبێ تیشــــــکی رووناکی
هەڵبێ و لابــــەری ئازارو خــــەم بێ
(هەوری) ئەگەر چی دەورو زەمانە
ئەمڕۆ بۆ ئێمـــــە هەروەك زیندانە
خەفەت و خۆشی هەتــــا سەر نییە
رۆژگار هەموودەم هـــەر لـە گۆڕانە

٩٨٩/٢/١٧

## (یادی کەرکووک)[٨٨]

ـەرکووك ئەی شـــاری دێرینم ئەی شـــاری جوان و ڕەنگینم
ـەری هەموو دەم خـــەفەتبار شاری چەوســـاوەی بێ بوهار
ـــاری دێهات وێران و چۆڵ میللەت ڕەش و ڕووت و کڵۆڵ
ـەری ڕازاوەی بووکـــی کورد ئەی قیبلەگای درشـــت و ورد
ـەری شـــێخ ڕەزاو ئەسیری فوئادو لوتفی و ســـابیری
ـحیانی تر وەکـــوو ئەوان لە ڕۆشـــنبیرو وێژەوان
ـەری شـــەهید مەلا ڕەئووف بلیمەت بوو وەك فەیلەسووف
چـــەندێ مەردو بەغیرەت بوو دڵسۆزو عەشـــقی میللەت بوو
ـێ منەت چـــووە سەر سێدارە لە پێناوی کوردی بێچـــارە
ـیا مەردی وەك حەمـــە خورشید وەســـتا لە رووی دوژمن عگید
ـدەست و پێ لـــەناو پێوەن بوو بەڵام هورەی دەمـــاوەن بوو
یا شـــێری وەك ئەحمەد غەریب تابڵێی جوانمەرد و نەجـــیب
ـە هەر شـــوێنێ پەیدا دەبوو دوژمـــن زراوی لێ دەچـــوو
یاخۆ عومـــەر شەریفی مەرد ملکۆو ســـیامەندی نەبەرد
لـــەناکاوێ دەستێکی ڕەش لە ژیان کردیـــانی بێ بەش
مەردێ وەك عەزیـــزی قەرە لە ناو شـــەهیدان ســـەر وەرە
یا شێری وەك حەمید حوســێن لە قەرەداخ گـــەوزا لە خوێن
بە دۆشـــکەی فڕۆکەی دوژمن جەرگی هەڵتەکـــان بان و بن
ســـەر قافڵەیان مەردی تەواو بە ڕەحمانی نفووس ناســـراو

---

٨٨ - ئەم پارچە شیعرە لە یادی شاری کەرکووك و هەندێ لە شاعیران و شەهیدانی ناوداری ئەم شارە لە ١٩٨٩/٢/٢٩ی زاینی وتراوە.

گەلێ پەنـــــدی دا بە دوژمن     هەرگیز نەترســــا لە مردن
سەدان شــــەهیدی وەك ئەوان     خوێنی لـــــە رێی گەلدا رژان
چەن هەڤـــاڵی زۆر تێکۆشەر     سینگیان بۆ کورد کردە سەنگەر
لەرۆژگاری زۆر ترســـــناك     دەســــــووتا دارو بەرد وخاك
لە شەوی تووشی زســــتانا     لەژێر کـــــــڕێوەی بارانا
بە برســـیەتی و بەشەونخوون     پێ خاووس و مانـــدوو زەبوون
تفەنگ و فیشــــەك لغ لە شان     لە دووی مـــــاڤی کورد دەگەڕان
لەناو گەلـــــە گورگی دوژمن     خوێنـــیان دەڕژان بۆ تۆو بۆ من
پەردەی شـــەوەزەنگیان دەدڕی     سەربەســــتیان بۆ گەل دەکڕی
گەرچی ژیـــانیان زۆر تاڵ بوو     بەرد سەرین و ئەشکەوت ماڵ بوو
گرنـــگ نەبوو مەرگ لای ئەوان     بۆ سەربەخۆیی کوردســـــتان
تا رزگـــــاری بە دەس بێنن     ئەم خاکە لە خــــــەم دەربێنن
ئافرەتی داماوو خەمـــــگین     مناڵـــــــی کزی خوێن شیرین
ئـــــەختیاری جل و بەرگ دڕاو     تەواو جەســـتەو روخسار شێواو
هەناســـــە سەردو دەس بە تاڵ     دەروونی رەش وەکـــوو زوخاڵ
ولاتێ وێران و سووتـــــــاو     باخاتی لق و پۆ شـــــــکاو
ئەی شـــاری بێ نازو رەشپۆش     هەمیشــــە بی دەنگ و خامۆش
ئەی کانگای زوڵم وجـەورو خەم     وەختە لەســــەرمان لاچێ تەم
رۆژێ هەر دەبێ داگیرکـــــەر     رەگ و ریشــــەی بهێننە دەر
هەرکەس مـــافی خۆی وەرگرێ     بەرهـــــەمی رەنجی بەرگرێ
بولبول بە شـــــادی بخوێنێ     خەم لە هیچ شـــوینێ نەمێنێ
بۆ (هەوری)ش ئەو وەختەوکاتە     ئەوپـــــــەڕی خوشی و ئاواتە

## (سلێمانی بە راستی)

سلێمانی بەراستی جێگەیی زۆر خۆش و دڵگیرە
بە زۆری خەڵکی ئەم شارە دەبینم دانش و ژیرە
هەموو دەم جێگەی عیلم و فیداکاری بوو ئەم خاکە
خەبات و هەوڵ و تێکۆشان لە مێژوو دیارە جێگیرە
گەلێ ڕۆڵەی هەبوو وەك مامە یارەی قارەمان پێشك
کە ئێستاش دوژمنانی هەر خەریکی فێڵ و تەزویرە
وەرە بڕوانە شاخی گوێژەو ئەزمر چەنێ جوانە
بوهاران بۆنی گوڵزاری لەلای من زۆر بە تەئسیرە
ئەوەندە خۆشە دەنگی بولبول و قومری سبەینانی
ئیتر پەنهان و بێچارەن، قەل و بووم مات و بێ قیرە
هەواو ئاوو سروشتی ئەم وڵاتە پاك و بێگەردە
گەلێ هەرزانە یەك زەڕەی ئەگەر بیکڕی بەسەد لیرە
چیاو پێدەشت و کۆساری بە جارێ گشت بەروبوومە
هەموو کانی و سەرچاوەی بە چەشنی جۆگەی شیرە
خەم و مەینەت بەدی ناکەم لە سەیری دیمەنی جوانی
پەپوولەی ئارەزوو دەفڕێ لە ناو گوڵزار صەفا گیرە
وەرە (هەوری) بەیانی کە لەبەرچی بوو بەجێتهێشت تۆ؟
کە بەم جۆرە لەلات خۆش بوو هەمووشی کوردو هاوتیرە

نیسانی ساڵی ١٩٨٩

## (نەسرین)

نەسرین کیژی شۆخی چاومەست
خۆشی و شادی منت بە دەست

یەك نیگات بوو جــــەرگی برژاند
لەلام نەما هیچ هۆش و هەســــت

لەنجەولارو نازو جـــــــوانیت
بۆ ئازاری دڵ بە ئەنقەســـــــت

دڵ گیرۆدەی عیشـــــــقت بووە
هەموو رێگایەکت لێی بەســـت

هەروەکو تــــــەیرێکی غەریب
زامی دەروونم قووڵ و خەســـت

وەرە دەســــــــتت بدە دەستم
برۆین بەرەو لوتکەی مەبەســت

جا بە وشەی شـــــیرین و جوان
بۆت دەنووسم شیعرو هەڵبەست

ئەم قۆنـــــاغەی وا بۆی دەچی
نەما دەوری دیلی و بەربەســت

راپەڕەو دەرکەوە لـــــە مـــاڵ
بەرەو ژیانێکی سەربەســــــت

---

## (چ جوانی دەگا)

چ جوانی دەگا بە جوانی رووی گوڵ
ئەو گوڵەی کەوا دڵ دێنێتە کــــوڵ

چ کاتێ خۆشــــە وەك وەرزی بوهار
وەیاسەیرانی رووی دەشت وگوڵزار

چ دەنگێ خۆشە وەك سەدای بولبول
کاتێ دەخوێنێ بــــە ئارەزووی دڵ

چ وەختێ خۆشە وەك دەمەو بەیان
یاکۆڵکەزێڕی پاش تـــاوێ باران

چ بایێ خۆشە وەك شــنەی شــەماڵ
وەیا ئاوازێ وەك سۆزی شــمشــاڵ

چ کاتێ خۆشە وەك وەسڵی دولبەر
گفت و گۆی بە تام هەردووبەرانبەر

(هەوری) ئەوکاتەی قەت لەیاد ناچێ
هەرگێز لەم ژینە لــە دڵ دەرنــاچــێ

٩٨٩/٤/٧

## (بەیانیان لەگەڵ)

ـحـیـنیان لەگەڵ سـروەی شەماڵە
ـە خۆی دەنوێنێ نەسرین و لالە
خووناو دەبارێ لەسەر پەڕەی گوڵ
چاوی هەڵدێنێ خونچە لەسەر چڵ
ـیرگز لەسەری ناوە تاجی زەرد
گەلێ بە شەوقەو لە قینی نامەرد
ژاڵە بە گوڵی زۆر گەش و ئاڵی
تەماشای لە دڵ دەردەکا تاڵی
ـفیرۆ بە بەرزی شاهی گوڵانە
ـسپی و ئاڵ تێکەڵ گەلێ جوانە
دەشت و دەر پڕە لە بۆنی گوڵان
کەژوکێو هەموو زۆر ڕەنگین و جوان
ئاوازی قومری و نەغمەی بولبول
خەم و پەژارە نـاهێڵن لە دڵ
بەڵام چ فایدە من هەر خەمگینم
ڕۆژگار کە دەستی ناوەتە بینم
(هەوری)بوهاری لا وەك زستانە
ژیانی هەموو پڕ دەردو ژانە

١٩٨٩/٤/٢٢

## (هەموو دەم)

هەمووودەم روو بەخەندە گەلێ دڵگیرە غـــادە
بەو دەست وپەنجە ناسکە بۆمتێکە یەکدوو بادە
وەکوو خونچەی سبەینان زۆر گەش و نەشئەداری
عیشوەو نازو جوانیت هەمیشـــــە هەر لە یادە
تیری نیگات بە جارێ جەرگ و دڵی کون کون کرد
کاتێ کە دەنگ هەڵدەبرێ ئەو وەختە خەم بەربادە
جارو بار دێیت و دەچی بە عیشـــوەو لارو لەنجە
ئەم خەڵکەت رەنجەڕۆ کرد بەو قەدە وەك شمشادە
مانەندی ئاسکی دەشتی گەلی سرك و مەغرووری
ئەو دەمەی ناز دەنوێنی شـێوەت وەك پەریزادە
وەسفی جوانی و ناســـکیت مەحاڵە ناکرێ بەمن
رووت وەك گوڵی نەوبوهار سروشتت پـاك و سادە
(هەوری) ئەمڕۆ گوشـادە بە کوێری چاوی دوژمن
وەرە ئەی جوانی خۆشـڕوو پێکەنەوە خەم بەبادە

بەغدا – ١٩٨٩/٥/٦

## (بۆ کۆچی لوتفی باوکم)[٨٩]

-وەی چەن رۆژ لە نــاو ئازارو دەرد دەتـــلامەوە
-یمە بێ راحەت و خەو وەك تـــەشـــی دەخولامەوە
رۆژی دکتۆر هات وتی تۆ بـاشـــی فەرمـــوو زوو برۆ
هاتمەوە ماڵ لێ درێژ بووم گیان بـــە دەردو زامـــەوە
ع‌ــــەمێ زۆر دەوری لێ دابووم ژن‌و پیـــاوو منال
.ۆر بە شـــادیو زەوق‌و خۆشی گفتو گۆی بەتامەوە
لەحزەیێ زۆر خۆش‌و دڵگیر بوو قسەو گوفتاری خۆش
دۆســـت و بێگانـــە لـــەگــەڵ خـــزم و بـــــراو مـامەوە
وەختێ بینیم چرپە چرپەو هیچ منـیش حاڵی نەبوم
چاو دەگێرم کـەس نەما هەر خۆم بە تەنها مامـــەوە
ما فکر کەم ئەی خودایە بۆچـی چۆڵ بـــوو ژوورو دەر
دیم منالێ هاتە ژوورێ دانیشــــــت لـــەلایەن پامەوە
وەختێ پرسیم رۆڵە بۆچی ئێرە چۆڵ بوو کـەس نەما
پێی وتم باپیرە وامرد دەی پێچـنە کفـــن و خـامـــەوە

---

٨٩ - کاتێ لە نەخۆشخانەی سەدامی گشتی نەشتەرگەریی ریخۆڵە کوێرە کرابووم لـە دوای دەرچـوونم لـە نەخۆشـخانەی ناوبراو لە ١٩٨٩/٥/٢١ باوکم لوتفی شاعیر بە هۆی ئەوەی ماڵی من کەمێ لە ماڵی باوکمەوە دوور بوو هەواڵی کۆچی دوایی ئەم زاتەم پاش چەن سەعاتێ بیست ئەویش لەبەر ئەوەی کە من کەمێ نەخۆش بووم بۆیە بە منیـان نـەوتبوو بـۆ ئـەوەی خەمگینتر نەبم. بەڕاستی بەبیستنی ئەم هەواڵە تاڵە برینەکەم زیاتر هاتە ئێش و دونیای رووناك و بەرینم لـێ بـووە بەشەودەزەنگ و زیندان هەر چەندە من عومرم کردبوو خاوەن ماڵ و منالْ و ژن بووم. بەلام هـەر خـۆم وەك منـالی دەبـینێ فرمێسکی چاو دەهاتە خوار چەن یادگاریەکی دەوری منداڵی دەهاتەوە یادم ئیتر خۆم بۆ نەگیرا بۆیە بەم چەند دێرە شیعرە بە سۆزە کەمێ سەبووری دڵی خۆم پێ دایەوە بەلام تا مردن ئەو خەمەم لەدڵ دەرناچێ کە نەمتوانی لە پرسـەکەی ئامـادە بم ئەویش بە هۆی نەخۆشییەکەمەوە بوو ئەو ئەرکە پیرۆزەم لەکیس چوو نەمتوانی بەشداری بکەم ئەم پـا رچـە شـیعرەم هەر لەسەر جێگەکەم نووسیوە بۆ یادگاری ئەو رۆژە خەمناکە لە رۆژی سێ شەممە ١٩٨٩/٥/٢٢

ئەم هەواڵەم بیست شـــــعوورو عەقڵ و هۆشم لا نەما

یەك تەزوویێ هات بە سەرما دەرچوو لە نووکی پامەوە

فکری پێشووی دەوری منداڵی هەمـــــوویم هاتە یاد

هەروەکوو بەفـــــری بوهار بێ ئیختیار تـــاوامەوە

گریەو زاریم پەیـــا بوو هاتە جۆش ســـۆزی دەروو

خـــۆم لـــە قـــوڕنێم بـــۆ فیراقی هەر لە ســەر تا پامەوە

بۆ کۆچی زاتێکی وەك لوتفی دەسـووتا جەرگ و دڵ

هەروەکوو بولبــــول دەناڵم چیم بە لۆمەی عامــەوە

شادی کەی روحی بە جەننەت یـــا ئیلاهی لعالـــەمی

من لە دەرگات رۆژو شــــەو دەســتەو دوعــا پاڕامەوە

لوتفی پیاوی دینو دونیابوو لە دەســچوو داخەکەم

وەك گوڵی گەش بوو لە ناو ئەم عالەمی ئیســـلامەوە

ئەو نەجاتی بوو لـــە دونیا گەیێ خـــزمەت زاتی حەق

قوڕ بەسەر من پـــــاشی ئەو بێ یارو بێکـــەس مامەوە

(هەوری) تۆ بۆ خۆت بناڵە تاکوو ماوی قوڕ بەســـەر

گۆشەگیرو دەســــــتە ئەژنۆ بەو دڵە ی پڕ زامـــەوە

## (بەڕێکەوت)

ـ.ـە بە لـــەنجە دەرکەوت ... کە تووشی بووم بە ڕێکەوت

ـ ـوای کـــەمێ گفتوگۆ ... ئەو نێچرو من هـــەڵۆ

ـحـحب شـــیرین ئەندامێ ... وەعدێ بچـــووکی دامێ

ـخت بوو لـــە خۆشیا ... بکەومە دەشـــت و چیا

ـگام لە خـــۆم نەما بوو ... کیسرام لەلا گـــەدا بوو

ـ ـەورخـــۆما دەهاتم ... دەمووت گەیشـــت ئاواتم

ـوقرەم لێ بـــڕا بوو ... پەردەی ســـەبرم دڕا بوو

حمم و مەینەتم هـــەڵات ... بسکەی ســـمێڵم دەهات

ـ پاش دەمێ تـــر کە چووم ... لە بەردەمـــی تێپەڕ بووم

ـتی لاچۆ لـــەم ناوە ... تـــاکوو گاڵم نەداوە

چاکت دارکـــاری بکەن ... بۆ خەڵکی بت کەنە پـــەن

هەموو لەشـــت بشکێنن ... ئابڕووت بزڕێنـــن

منیش گەرامـــە دواوە ... شەوق و زەوقم تـــوواوە

نەوخۆشی و شادییەی هەبوو ... بەیەك لەحزە هـــەموو چوو

کە ئەمەم بیســـت لە دولبەر ... چاوم پەڕییـــە تەوقی سەر

پێتان بڵێم حـــەریفان ... نەکەونـــە داوی جوانان

کەمیان پەیمانیان هەیـــە ... عیشـــقیان لەلا گەمەیە

١٩٨٩/٩/١٤

## (کۆشکێکم بینی)

کۆشکێکم بینی زۆر بــەرزو جوان
هەروەك تەلاری شـــــاهانی ئێران
دەرگاوپەنجەرەی نەقشی رەنگاورەنگ
تاق و هەیــــــوانی وەك بەرزی کێوان
گەلێ دڵگیر بوو وەك جێگەی ئەمیر
زۆر گوشـــادو بەرز گەورەو فراوان
دیوار کرا بوو بــــــەردی جۆراو جۆر
کاتێ دەتبینی دڵ دەبـــــوو حەیران
بەڵام خاوەنی هەمـوو دەم خەمناك
رووخســـاری شێواو کزی دەنوان
رۆژی ســەد بەڵا بەرۆکی دەگـــــرت
جاروبار لـــــەلای دەبوو بە میـــــوان
تا پەنجەی ئەجەل گەیشـتە سەری
لـە نـاکـاو گـوڵی ژینی هەڵــوەران
رۆژگـار وەهـایە بۆ کەس نـــــامێنێ
ئەگەر نەمرود([90]) بی یـــــا نەوشیروان([91])
(هەوری) وریــا بە تۆش لەم ژیانە
رێی هەڵە نەکەی هەی خانە وێران

---

[90] - نەمروود- پاشایەکی زاڵم و بت پەرست و دژی حەزرەتی ئیبراهیم وستاو کورەی ئاگری بـۆ دروست کـردو هاویشتیە ناوی بەڵام خودا ئاگرەکەی بۆ فێنك کردوو رزگاری بوو.

[91] - کیسرا- نەوشیروان- کوری قوبازی کـوری فـەیروز بـووە یـەکێ بـووە لـە شـاهە ناودارەکـانی ئێـران لـە گـرنگترین پاشماوەکانی (تاقی کیسرا)یەو لە (مەدائین) لە خوارووی شاری بەغدای ئێستایە هەرماوە.

## (ئەی بەرنامەکەی)([92])

بەرنامەکەی شـــــرینی کەلەپوور
هەفتـەی جـــاریٚ تۆ دیٚتە حزوور
گەلیٚ بە شەوق و خۆشـــی و بەتامی
بۆمان بمیٚنیٚ تـــــا دەورانـــی دوور
و نەریتی رەســــــــەنی کوردی
یٚتە کـــــــــایە بۆ لاوی جەسوور

ئەم بەرنامەیە هەمـوو کـــورد زوبان
تەماشای دەکەن لـــــە نیزیک و دوور
چونکە گۆرانی ونوکتەو شیعری جوان
کاتی دەبینی دلٚ دەبیٚ مەســــــرور
من دەلٚیٚم گەلیٚ سوود بەخش وچاکە
با ناحـــــەز بۆ خۆی بکا لوورە لوور
ئیتر بـــــە هیوام هـــــەر بەردەوام بـیٚ
پیشکەشی دەکەم یەک چەپکیٚ چنوور

[92] - بەهۆی بەرنامەی کەلە پوورەوە وە لە ١٩٨٩/٨/١٧ی.زاینی وتراوە کە بەریٚز کاک ئەسعەد عەدۆ پیشکەشی دەکرد.

## (وەسفی قەومی کورد)

میللەتێکی قـــارەمان و زیرەك و مـــــەردانە کورد
ڕووبەڕووی دوژمن هەمودەم هەروەکو بورکانە کورد
نێرو مێ گەورەو بچووکی ئـــــەم گەلــە ئامادەیە
ڕۆژی تۆڵە وەك پڵنگی شـــــاخ و سەرکێوانە کورد
دوژمـنـــی تـــۆقیـــوە بیت و ڕۆڵـــەکـانی ڕاپەڕێ
چونکە نەسڵی زاڵی پیرو ڕۆستەمی دەســتانە کورد(٩٢)
بێتوو ئەم قەومە لــە ناو خـــۆیان تەواوی یەکگرن
ئەو دەمە خۆ دیارە ئیتر مەســـئەلەی ئاسانە کورد
تۆ وەرە بڕوانە مێژوو شـــــــــاهیدی ئەم قەولەیە
دوژمنی گەر بێتە مــــــــاڵی جێگەی ئامانە کورد
پاك و دڵ ســافە هەموودەم ئەو سروشتی وایە هەر
زۆر بەزەوق و شەوقە دایم ڕووگەش و خەندانە کورد
کامەی وا زۆر هـــەژارە بۆ ســـەخاوەت حــــاتەمە
هەر کەسێ ڕووکاتە دەرگای خۆدەڵێ سوڵتانە کورد
گشت موسڵمان و بەدینن ڕوو لە نوێژو ســـوونەتن
دوژمـنـی زوڵـــم و خـــراپە و خـــاوەنی ئیمانە کورد
کردەوەی بەد کەم دەبینم مـــــن لـە ناو ئەم میللەتە
زۆری ئینســانی نەجیب و ڕاگـــــری پەیمانە کورد

---

[٩٢] - زاڵ: باپیرەی ڕۆستەمە هەردوو پاڵەوانی ناوداری سـەردەمی خۆیـان بوونـە یەکـەم بـە زاڵـی پیرنـاودارو ئەم ڕوستەمی دەستان یا تاج بەخش ناودار بووە.

نایـــــەویْ غەدرو درۆ لایەنگـــری راستی و حەقە
میللەتێکی پاك و خـــــاوێن دوژمنی بوهتانە کورد
ـیـوی داوێن پیس‌و دوو روو ناپەسەندی زۆر کەمە
ـشت شەرەفمەندو بەڕێزوکردەوەی زۆر جوانەکورد
ئێستاکەش گەربێت‌و یەکــبن سەربەخۆیی نیزیکە
گەرچی ئەمرۆ رەنجەڕۆیە ســەر کزو حەیرانە کورد
ـدتــفی دڵ پێی وتــم (هـــەوری) بزانە قــەومی تۆ
چاوی هەڵێیناوە ئەمـــــــڕۆ روو لە تێکۆشانە کورد

کەرکوك- ١٩٨٩/٩/١٢

## (برای خاوەن هۆش و بیر)

برای خاوەن هۆش و بیر    ئەی هەستیاری زاناو ژیر
بڕوانە ئەم دونیایە    چەن هیچ و بێ وەفایە
هەر کەس دێتە سەر زەوی    چەن ڕۆژی تێدا دەژی
چەن پێغەمبەری نازدار    پێچایەوە کۆچ و بار
چەن پاشا چەن پاڵەوان    چەن پیاوی مەردی مەیدان
چەن ڕابەر چەن پێشەوا    خاوەن لەشکرو سوپا
چەن قەسرو قەڵای قایم    ئاوەدان بوون بە دایم
ئێستا گشت چۆڵ و وێران    وەك خانووچکەی مناڵان
چەن پیاو چاك چەن ئەولیا    هەمووی لە ناو برد دونیا
چەن زاڵم و چەن زۆردار    چەن ئاغاو بەگ و سەردار
چەن زانای زۆر بە جەوهەر    پاك بوون وەك ئاوی کەوسەر
چەن جوانی وەك زولەیخا    چەن نازداری وەك لەیلا
چەن عاشقی وەك فەرهاد    یا وەك مەجنوونی ناشاد
چەن دەروێشی سینە پاك    ڕەوانەی کرد بۆ ژێر خاك
چەن توجار چەن کاسبکار    چەن کۆرپەی جوانی نازدار
لە باوەشی دایکی فڕان    جەرگ و دڵی هەڵقرچان
چەن شەهیدی خێر نەدیو    بڕینی ئەم دیوو ئەودیوو
چەن هەژاری زۆر نەبوون    پشتی شکان دونیای دوون
هیچ وەفای بۆ کەس نییە    دەورانی تاسەر نییە
کەواتە برای نازدار    ڕووبکە زاتی کردگار
چەن ڕۆژێ ژینت ماوە    لە یەك ناکاو تەواوە
(هەوری) ئەتۆش بزانە    دووا ماڵت گۆڕستان

٠/٣

# (ئەی کاروان کوژە)

ـەی کـــاروان کوژەی بەری بەیانی([٩٤])
ـەرخۆت شـــاگۆڵی ئەستێرەکانی

کە دەر دەکەوی لە دەمـــــە و بەیان
نیشانەی لــــــە بۆ رێبوارو کاروان

ـەر خوا دەزانێ چـــــەندەها ساڵە
کە دێی و دەچی ئەتۆ بەم حـــــاڵە

ئەوەندەت دیوە دەوران و رۆژگـــــار
زۆرت بەڕێ کرد زســـــتان و بوهار

ـەوەندەت خۆشی و شادی دونیادی
ـەوەندەت جـــەورو زوڵم و ریا دی

چاکە رەونەقی جوانیت کـــە ماوە
ئێستاش شەڕ دەکەی لەگەڵ هەتاوە

کاتێ روخسارت بە دەر دەکـــەوێ
ئەســـــتێرەکان تر پەکیان دەکـەێ

ئەوەندە جوانی تۆ لەو ئاســــمانە
ئەو شوعلەو شەوقەت نوری یەزدانە

جێگەت ئەوەندە پیـــــرۆزو بەرزە
هەزار هەزاران بە قـــەدەر ئـــەرزە

هیچ کەس نازانێ تۆ چیت واجوانی
تۆ ســـڕی قودرەت زاتی رەحمانی

تەماشات مایەی شـــادی دەروونە
بۆ دڵی (هەوری) چونکە زەبـــوونە

---

[٩٤] - کاروان کوژە- ناوی ئەستێرەیەکە ئەم شیعرە لە ١٩٨٩/١١/١٩ وتراوە.

## (ئەی منالّە خنجیلە)

ئەی منالّە خنجیلە خوێن گەرمەکان
ئەی پەپوولە نازدارە پڕ شەرمەکان
هەستن هەموو بچـــــن بۆ قوتابخانە
رووناکی پاشـــــــەرۆژە چاك بزانە
کوڕو کچ بێ جیاوازی هەر هەمووتان
بکەونە رێی بەرەو کاروانی ژیـــــان
هەموو دەستی یەکتر بگرن وەکو مەرد
نەوەك بەجێ بمێنن هەنـــاسە سەرد
ئێوەن ئومێدو چرای ئەم مـــیللەتـە
بزانن ئەم ژیــــانە هەر هیمـــەتە
ئەوەی دانیشێ هەردەم دەستەوەستان
دوایی دەڕوا ژیانی گشــــت بە تالاّن
دەسا ئێوەن نەوەی ئەم کوردە مەردە
پڵنگ و شێری ناو ئەم شاخ و هەردە

١٢/٢٩ ٩

## (لەیادی رۆژنامەی هاوکاری)[٩٥]

ـمیٚ شیرینە یـــــــادت هاوکاری
ـرخ و بەرزی مایەی هۆشـــــیاری
هەموو دەم یادت دەکـــــا پیرولاو
زۆر خۆشەویستی وەك گلیٚـنەی چاو
ـیست سالْ تەواوە خزمـــەت گوزاری
ـ وشەی رەســـــەن ناو کوردەواری
شیعری جوان و وتاری بە ســـوود
هەر هەفتەی جاریٚ دیٚنیتە وجـــوود
چەن پارچە غەزەل چەن رووداوی جوان
ـتۆ رزگارت کرد هەمـــــوو لە نەمان
چەن شاعیری کورد هەموو ناو ون بوو
زیندووت کردەوە کــــاریٚ مەزن بوو
هەوری)ش پیٚت دەلٚـیٚ هەر بەرقەرار بی
ـتیری ناوچاوی دەســـتەی زۆردار بی

---

[٩٥] - بە هۆی تێپەڕبوونی بیست ساڵی تەواو بەسەر دەرچوونی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی هاوکاری نازیزەوە کە دەزگای رۆشنبیری کوردی لە بەغدا سەرپەرشتی دەرچوونی ئەم رۆژنامەیە دەکا، یەکەم ژمارەی لە ١٩٧٠/١/٩ دەرچووەو تا ئەمڕۆ هەر بەردەوامە لە خزمەت کردنی وشەی رەسەنی کوردی بابەتی هەمەجۆری زۆر جوان و بە سوود لەسەر لاپەڕەکانی خۆی بڵاو دەکاتەوە، چیرۆك،شیعر، پەخشان، رەخنەی ئەدەبی، فۆلکلۆر، مێژوو، سەرەڕای چەندین بابەتی جۆراو جۆری تر ١٩٩٠/١/١٥، کەرکووك.

# (کابرایەکەم دی)([٩٦])

کابرایەکم دی ریش سـپی     بالاّ دریّژ وەك شـــــۆڕە بی
گۆچانیّکی چەوتی لەدەس     هاواری کرد ئاخیر نەفـــەس
کۆمەڵیّ بزنی دابـــۆ پیّش     لەگەڵ یان دا بە کیّشمە کیّش
هەریەك بۆ لاییّ دەیقوچان     ئەویش رای دەکرد لە دوویان
تەواو ماندوبو مام ئەختیار     تا بزنی هیّنایە ســـــەر بار
یەکیّکیانی گرت لـــە پیّشا     گرتی بەلاقیا و رایکیّشـــــا
بەکیّشی کرد بەسـەر عەردا     بزن هــــــاواری بوو پەیدا
دیمەنیّکی زۆرناشیرین بوو     دڵم گەلیّ بۆ خەمـــگین بوو
چوومە پیّشـــەوە لە کابرا     دەستم کردە گاڵـــــەو هەرا
وتم تۆ زۆر بیّ ویـــژدانی     رەحم و بەزەیی نــــــازانی
ئەم گیانداره بیّ زمـــــانە     کەی لایەق بوو بـــەم لیّدانە
وتی کاکـــــە تۆ وازبیّنە     لەم ئیشە خۆت هەڵمـــەقوڵنە
تۆ نازانی ئەم بزنـــــانە     تا بڵیّی دەردیـــــان گرانە
گەر ئەوان ریّی خۆیان بگرن     من چیم دەویّ لــــە مام بزن
هەتا ئەوان وا چەوت بـــڕۆن     بەدەســـتی من کوتەك دەخۆن

---

[٩٦] - رۆژیّ کابرایەکی ئەختیار کۆمەڵیّ بزنی دەلەوەران پیّی بزنیّکی گرتبوو بەسەر عەردا رایدەکیّشا، منیش زۆرم بـەلاوە ناخۆش بوو لیّی بە دەنگ هاتم بەلاّم سوودی نەبوو، بەو هۆیەوە ئەم شیعرەم لە ١٩٩٠/١/٢٨ وتووە.

## (با بگریم حەقمە یاران)

- بگریم حەقمە یاران دەردەکـــەم زۆرکارییە

-ـرگرانی رێی حەقم من بۆیە پـــیشەم زارییە

عومری گەنجیم هەربەغەفڵەت چوولەدەس خاکم بەسەر

تازە هۆشیار بوومەوە ئەم شـــــــــــیوەنەم ناچارییە

خاوەنی کۆڵێ گوناهم کردەوەی چاکەم کەمە

تۆ وەرە بڕوانە حـــاڵم ئەشکی دیدەم جارییە

غەیری رەحمی تۆ نـەبێ چــــــــــارەو دەوایی تر کوا

چونکە ئـەم دەردو برینەی من کــــــە تووش‌وسارییە

ـزۆر دڵم خۆشە بە نەصی ئایـــەتی لا تە قنە توو

بۆیە بێ باکـــم ئەمن بێشـــــک کـەلامی بارییە

لەشکری دەردوبەلاّ چـــوار دەوری گرتـــووم بەردەوام

ئەی خودایە رەحمـــەتێ ئەم ژینە هــــــــەر بێزارییە

هەوری)بەسیەماتەمینی رەحـمەتی زۆرەخودا

تۆ بەڕاستی رووکەدەرگەی ئەو یەقین رزگارییە

١٩٩٠/٣/٧

## (كەوتمە بەر چەپۆك)

کەوتمە بەر چەپۆك زەمانەی غەدار
خوێنی جگـــەرم دەمژێ وەکو مار
رۆژوشــــــەو هەردەم کزو داماوم
جەستەی بێ هێزو زەردهەڵگەڕاوم
بێ شەوق و هەوەس شادیم نەماوە
دەردو مەینەت وو خــەم بە لێشاوە
هەروەکو مەجنون لە شـین و زارم
شـەیدای دیداری لەیــلی نازدارم
سوپای خەم ئەمڕۆ دەوری لێم داوە
چرای گوشـــادیم شەوقی نەماوە
بۆ کێ باسی کـەم دەردی دەروونم
کێ تیماری کـا جەرگی پڕ خـوونم
کوانێ هاوڕێی وەك برای گیـــانی
کـە بوی بە یان کەم رازی نیهانـــی
دەردی دەروونی بۆ شـــی کەمەوە
ئەم تاڵییە کەمێ لـە بــیر بەرمەوە
(هەوری) عومری چـوو بە نامرادی
هەر چـــاوەڕوانە بۆ رۆژی شـادی

۱۱/٤/۹۹۰

# (گوێ راگره)

ێوێ راگره بــرای گیـــــانی
بۆ ئەوەی زۆر چـــــاك بزانی

حوا ئێمەی نارده ســـەر دونیـا
چەن جۆره میلـــــلەت جیاجیا

- وییه پێمـــــان رزق و ژیـان
ناسینی واجبه بێ گومـــــان

ێویســـــــته به ڕۆژو بەشـەو
روو بکەینــــــه دەرگانەی ئەو

ەرچی فـــــەرمووه وابـکەیـن
یەك تۆز لــــه ئەمری لا نەدەین

ـوەك هەر بە خەوو خــــواردن
هەتا دەگـــــــا پێمان مردن

خۆمان حازرکەین بۆ حیســـاب
تاکوو تووشـــمان نەبێ عەزاب

ـەمرین و راســـت دەبیـنەوه
لەیەك شـــــوێن کۆ دەبینەوه

ەرووەك جاران بێ زیـادو کـەم
ئەعزای لەشمان هەموو سەرجەم

هەموو بی دەنگ راوەســـتاوه
ئەوەی یەك ســــــاتێ ژیاوه

ـۆژێکه زۆر ســەخت و خــەتەر
هەر کەسەو خەمی خۆی لەبـــەر

نامـــــادەیه زاتی یـەزدان
لەگەڵ ســــــەرجەم پێغەمبەران

ســـــەرداره فەخری کائینـات
شاســـــــواره رۆژی عەرەسات

مەلەك به ســـەف راوەستاوه
فەرمانی بیی لـــــەلای خواوه

دەس بەجێ جێبـەجێ دەکەن
له پاشـــــان حەمدی خوا دەکەن

دەفتەرمـــــان دەهێنه مەیدان
چاکه وه خـــــــــراپه بێگومان

هیچ بزر نـــــابێ زۆر و کەم
گشت حیســـاب دەکرێ به قەڵەم

ئەنجا پرســــیار دەکەن لێمان
لـــــــه کردەوەو هەم له ژیان

یـــــــەك زەڕه هیچ بزر نابێ
خێرو شـــــەڕ هەرچی کرا بێ

ئەوەی چاکەی بێ سەربەســته
لەو رۆژه ئەوبێ دەربەســـــــته

قوڵی دەگرن بۆ ناو بەهەشـــت
لەگەڵی ناکرێ حەوت و هەشـــت

گوناهباران بۆ جەهـــــــەننەم دڵیان پڕ لە حەســـرەت و خەم
دەسووتێن بەگوێرەی گوناهیان پاشان هەڵدەستێ عـــــەزابیان
بەڵام کـــافران و موشـــــریك لە جەهەننەم زیندوون بێشـــك
دەسووتێن و چاك دەکرێنـــەوە هەر بەو حاڵـــــەش دەمێنەوە
نەعازە اللــــــــە لەو عەزابە سووتانیان چەشـــــنی کەبابە
کەواتە ئەی برای هۆشـــــیار فرســــــــەتە خێراکە زینهار
لەم ژینە هەتـــــاکوو ماوی روو لە خـــــواکە بە تەواوی
بەڵکوو لە ســـــەحرای مەحشەر دوورە بێ لە ئاگـــــری سەقەر
(هەوری) مەئیوەس مەبــە ئەتوو خوا فەرموویـــــــە لاتەقنەتوو

٩٠/٤/٢٩

## (سەیرە کە دەڵێن)

سەیرە کە دەڵێن فلان کەس نەمرە
ـ تێکۆشەرە یاخوود شـــاعیرە
چاوەکەم نەمـــر هەر زاتی خوایە
لەم پەندە بۆ خۆت شـــتێ وەرگرە
بەڵێ چەن کەســێ لەمێژوو دیارە
هەموو دەم لەلای بچووك و گەورە
لە هەزاران کەس یەکی وەك سەعدی ([97])
جارو بار ناوو شیعری حـــازرە
ئەوەی مرد دیـــارە ناوی نامێنێ
دوای چەن ساڵی تـــر ناوی بزرە
وریابە شتێ بکـــــە بۆ ئەولات
دیارە کە ئیشی دونیات گشـــت ترە
زۆر ئاگەدار بە لە نەفسی بەدخوو
بەرەڵڵای نەکەی وەك مـــاری سڕە
هاتەوە ســـــەر خۆ پێتەوە دەدا
راســــــتە کە دەڵێن چرا هەڵبڕە
ئەگەر بەڕاستی روو لە خوانەکەی
بێگومان لـــەولا حاڵت زۆر شڕە
دونیاو قیامـــەت هەردوو دەیەوێ
بەبێ ئیش و کـــار رۆژگارت مەبڕە
(هەوری)چیتداوە لەم خەڵکە ئەتۆ
لەکردەی خراپ تۆخۆت دور بگرە

---

[97] - سەعدی – نازناوی جەلال الدین عەبدوڵلایە ٥٨٩- ٦٩١ ی کۆچی لەتیرەی ( لوڕ)ی کـورد بـووە شـاعیرو نووسـەریکی بەناوبانگی دەوری خۆی بووە ئەم پارچە شیعرە لە ١٩٩٠/٥/٥ی زاینی وتراوە.

## (ئەزیزان ئەم ژیانەی من)

ئەزیزان ئەم ژیانەی من هەموو هـەر شین‌ومـاتەم بوو
بەشی من رۆژوشەو تەنها هەمیشـە ریژنەی خەم بوو
ەموودەم لەشکری مەینەت لە دەوروبەرمە وەك یــاوەر
دەپرسی گەر لە شادی زۆر کەمە دایم بە ئاستەم بـــوو
نەبوو یەکیٚ دەسم بگریٚ لە خزمو خۆیش‌و بیٚگـانــە
چ بەختیٚکی رەشم بووئەی خودایە هەروەکو تەم بوو
بە خۆرایی دەبینم رووی نیـــیە لیٚم زۆر کەسی سـەیرە
ئەگەرچی تاکوو ئیٚستا کە لەلای من خاتری جەم بـــوو
دەزانم هۆی چییە ئەمرۆکە هەنـــدیٚ لیٚـم تەوەللایە
هەتا ماڵم هەبوو گشتی بەوێنەی مـــامو خاڵەم بوو
گەلیٚ رەنجم لەگەڵ ناسیاوی خۆمدا گشتی بیٚسوودچوو
لە پاداشتی قسەی ساردو توانجی روو لە سینەم بـــوو
لەناو زیندانی حەســـرەت دا دەناڵیٚنم بە خەمناکی
هەناسەی ساردوئاهی دڵ کە تیٚکەڵ شین‌وناڵەم بوو
بە شەو هۆشـــــــم نییە غەواسی ناو دەریای خەیالاتم
بە رۆژ ئالوودەی ناوخەم هەمیشە دۆست و هاودەم بوو
گەلیٚ بیٚزارە (هەوری) لەم ژیان و دەورو رۆژگـــارە
دەمیٚکە من دەنۆشم شەربەتی خەم کارو پیشەم بوو

١٩٩٠/٦/١٠

## (دەخیلم بە تۆ

ـخیلم بە تۆ ئـــەی پەروەردگار
ـیزارم لە دەس چەرخـــی رۆژگار

دەردو بەڵاو خەم لـــە هەموو لاوە
هیچ چارم نییـــــە دەورم گیراوە

ـودا پەنام دەی لە شـــــەڕو بەڵا
ـوور بم لە فیتنەی دونیاو و مافیها

زۆر جـــەورم بینی زۆر کوێرەوەری
زۆر رۆژم چواند بــــە دەربەدەری

کونجی زیندان و ســـــایەی دوژمنان
ـۆرم چەشت خەم و مەینەت و گریان

چەن جێگە گـــەڕام من لەم ژیانـە
زۆرم گوێ لێ بوو تـــانەی بێگانە

ـۆر ئازارم چەشـــــت لە نیزیکی خۆم
بۆ زۆر کەس سووتام بە مانەندی مۆم

چەن یادی دەکەم ئەحـــواڵی سەیرە
پاداشتم نەدی لە خــــزم و غەیرە

غەیری سەر ئێشەو فرمێسك و گریان
هیچم دەس نەکەوت لەدۆست و یاران

قەت پشت نابەســـتم من بەم دنیایە
چونکە ئەم ژینە وەك سێبــــەر وایە

ـەوری) تۆ رووکە دەرگـــاهی خودا
دەرمانی دەردت بۆ دەبێ پەیـــــدا

## (بولبولی هەژار)

بولبولی هەژار دەنگـــت هەڵێنـــە
ئەو سۆزە خۆشـــەت پڕ لە ئەوینە
هەموو ڕۆژ هەستە بەیانی زۆر زوو
ئەو کاتەی کە خۆر لەئاسۆ دەرچوو
لەسەر درەخـــــت و لە کەناری ئاو
لەگەڵ ڕوونـــــاکی گزنگی هەتاو
ئەو کاتەی کە گوڵ جوانی دەنوێنێ
خونچەی بوهاریش چاوی هەڵدێنێ
سروەی شـــەماڵیش زۆر بە ئارامی
لە ســــەردا دێنێ بۆن و بـــەرامی
تۆش لەو کاتـــەدا بەرانبەر بە گوڵ
ڕازی دڵی خـــــۆت بڕژێنە بە کوڵ
ئاوازی ئەتۆو دیمـــــەنی بوهـار
لەدڵ ناهێڵێ یەك زەرە ئـــــازار
خەفەت تۆزقاڵێ لای کـەس نامێنێ
هەڵدێ لەو ناوە و ملی دەشـــکێنێ
(هەروی)ش لەوکاتە زۆر شادومانە
لـــــــەلای نامێنێ خەمی زەمانە

# (شەو تا بەیانی)

ـەو تا بەیانی بە تەنیام
لە ناو خولیاو خەمی دونیام

ـسوورپێم بە دەم دەردەوە
بەم رەنگە کزو زەردەوە

ـوەکانم ناچێتە خەو
بە درێژایی هەمووشەو

ـە دەڕوانمە ئەو ئاسمانە
ئەو ئاسمانە روون و جوانە

ـیشکی ئەو مانگە دەبینم
تێکەڵ دەبێ بە ئەوینم

ـارێژ دەبێ زامم کەمێ
دەحەسێمەوە سەردەمێ

ـو هەمیشە ئاشنای منە
وەکوو من جەرگی کون کونە

کە دێ ودەچێ لەو ئاسمانە
هەروەکوو من سەرگەردانە

ـوەندە زووڵمی بینیوە
کزی روخساری پۆشیوە

ـەلام ئەو وا لەو ئاسمانە
دەڕوانێتە ئەم جیهانە

من لەو زیاتر پەرێشانم
گیرۆدەی چەرخی دەورانم

ـەو جارێ رەونەقی ماوە
هێشتا وەك من نە شێواوە

من زووخی جەرگم دەنۆشم
چی بکەم نایێ فەرامۆشم

ـەو بەسەربەستی دێودەچێ
وەك من نانالێ لەسەر جێ

هەوری) پشت بەستە بەخوا
مەکەوە دووری نەفس و هەوا

١٩٩٠/١١/٧

## (چەپۆکی ڕۆژگار)

چەپۆکیدا لەزۆر کـــەس چەرخی ڕۆژگار
ڕژاندوویە بە ســـــــەریا دەردو ئـــازار
لە ناو دەریای مەینەت زۆر پەشـــێوە
شەوو ڕۆژ موبتەلاو دووچارو خەمبار
لەبەر سەختی ژیانی و چەرخی گەردوون
پەرێشـــــــــانە هەموو دەم وەك بریندار
وەکوو دێوانە هەردەم وێڵی ســـەحرا
لە ژینی خۆی تەواوی پەست و بێزار
دەچۆڕێ خوێن لە جەرگ و ئاوی چاوی
مەلوول و کز ژیـــــــــانی پڕ لە زینهار
فەلەك بادەی گەیاندە لێوی وەســـتا
شـــکا بادەو شەرابیش زوو ڕژا خوار
ئەتۆش (هەوری) گەلێ جا تووشـــی دەردی
ئەگەر هەجووی زەمان کەی حەقتە جارجار

## (بۆ کۆچی دوایی جاهیدی شاعیر)[٩٨]

ـ ئەمڕۆ کە کۆچی کرد جەنابی خـــــــاڵە بورهانی
ـ ســـــــەربەستی لە دونیا چوو لە بۆ لای زاتی رەبانی
ئەگەرچی ژینی ئەم زاتە هەموو پـــــڕدەردو ئازار بوو
هەموو دەم وێڵ و ئاوارە دەســــــــووڕاوە لە شارانی
ـ ۆر جێگە بەرانبەر تیرو تانەی ناکەســــــان وەستا
ـحیمەت زۆر بە پیاوانە رەوشتی جوان‌و ئینســــــانی
گەلێ عومری بەتـــاڵی چوو لە جەوروميحنەتی ڕۆژگار
کەچی هیچ تیك نەچوو هەرما لەسەرکرداری زۆرجوانی
ـ ونیا زۆر پەرێشان بوو لەبـــەر دەردی هەژاری خۆی
ـبور شەوق‌وهەوەس لای ئەو لە روخساری کەدەتروانی
هەزاران شیعری پڕ مەعناو بە سوودی بۆمە دانــــاوە
هەموو دەم جێگەی فەخرە لەلای گشت دۆست‌ویارانی
ـ دوای ئەو کێ بکا تەخمیسی شیعری شاعیرانی کورد
کە جێگەی خاڵییە ئەمڕۆ درێغ بۆ خزمـــــەکەی (کانی)[٩٩]
خوا سابیکە خاتر فەخری عالەم خۆشـــەویستی خۆت
ببەخشە (جاهیدی) شاعیر بەجاهی شـــــاهی گەیلانی
گەلێ مەحزوون‌و خەمگین‌و پەریشـــــــانە دڵی(هەوری)
هەموو دەم هەر لە ناڵینە ببینە شـــــــــین و گریانی

---

[٩٨] - بەهۆی کۆچی دوایی مامۆستا بورهان جاهیدەوە لە ١٩٩١/١/٢٦

[٩٩] - کانی- جەبار ئاغای دۆغرەمەچی ١٨٩٧- ١٩٥٧ شاعیرێکی ناوداری کورد بووە و مامی جاهیدی شاعیرە.

## (ئەم شەو)[100]

ئەم شەو رێکەوتی شەوی یەك شەممە
دڵ و دەروونم پڕ دەردو خـــــەمـــــە
ڕۆژی یەکەمین لە مانــــگی شوبات
ڕۆژێکی ناخۆش پڕ بــــەڵاو ئافات
ســـاڵی زایینی حەزرەتی مەســـــیح
بۆتی دەنووســـم زۆر جوانەو فەسیح
هەزارو نۆ ســــەت هەم نەوتوو یەك
شەڕ داگیرســـاوە دونیا پڕ لە چەك
شەڕی وا گـــــەورە قەت رووی نەداوە
جیهان بە جـــاریْ گشت شـــڵەژاوە
هەرچی دەبینی گشـــــتی چەکدارە
گەورە و بچووکی سـەرپاك دووچارە
ئاگری ئەم شـــەڕە دونیـــــای گرتووە
خەڵکی لە ترســـــان بیهۆش کەوتووە
مەفرەزەش هەردەم وەکووسەگی هار
دەســـــــووڕێتەوە لە کوچە و بازار

[100] - بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە بەسەر ئەم وڵاتەدا هات و ئێمەی گەیاندە کۆمەڵگای شۆڕش لە چەمچەماڵ بە ڕـــ دورێکی زۆر تاڵ و ناخۆش بوو کەس ئاگای بەسەر کەسەوە نەمابوو هەرچەن کە ئێمە بە ئارەزووی خۆمان چـــ ئەوی و هەموو شتێکمان هەبوو هیچ جۆرە کەم و کوڕی ژیانمان نەبوو، بەڵام لەبەر تەنگی و ناخۆشی ڕۆژگار زۆر بە ـــ تاڵ و گران بوو تەنها ئەوەندە هەبوو کە هاوسێ خزمێکی زۆر چاك بووین کە ئەویش کاك سەید حوسێن ـــ عەبدولڕەحمان کە هەمیشە قسەی خۆش بۆ دەکردین و دڵمان پێی دەکرایەوە، شەوێکی زۆر تاریك و ساردو ڕەشەبـــ بەهێزی دەهات و ئێمەش چرایەکی ئاوومان هەبوو جاروبار دەکوژایەوەو بە هەزار حاڵ پێمان دەکردەوە منیش ئە ـــ یەك شەممە رێکەوتی ١٩٩١/٢/٢ ی.زایینی لە چەمچەماڵ - وتراوە.

ـــرِبازی هـــــەزار بەبێ نـــان و ئاو
ـــێ پارەو پووڵ مەلـــــووڵ و داماو
بەزۆری دەیبەت بەرەو ساحـــەی شەڕ
لەلای زۆر روونە مەرگی دێتە ســـەر
ـــەر چەن هـــــــەوڵ ئەدا کاری گرانە
ـ جارە هەڵـــــــــدێ روو لەوکێوانە
ئەمریکا لەگەڵ چەن دەوڵــــەتی تر
خاکی عێراقیان ســــــووتان بە ئاگر
ـــزیان وایە ئەم خـــــــــاکە بگرن
ـــەستی خوێنڕێژو زۆرداران ببـــــڕن
ئێمەش دەربەدەر واین لە چەمچـــەماڵ
دەســــــــوورێنەوە بە دەســـتی بەتاڵ
ـە جیاتی ئیش و ســـەنعات و هونەر
خەریک گولێنین هەمــــوو سەرانسەر
هەموو دەم لە ناو دەردو ئـــــازارین
بە رۆژ و بە شـــــــەو زۆر بێ قەرارین
ـرکەی سارووخ و دەنــــــگی تەیارە
عالەم لە تاوا گشـــت بوو ئـــــاوارە
نان و ئاو نەما نـــەوت و بەنـــزین کەم
رووی ئاسمانی گرت دووکـــــەڵی ماتەم
ڕێگە گشـــت گیرا هاتـــــــوچۆ نەما
لەناو ئەم دەورە بووینە ســـــــینەما
هەرچەن سەیردەکەی هیچ دەس ناکەوێ
کەس نییە لە ژێر ئەم بــــــــارە نەنوێ

بەتایبەتی منیش خێـــــزانێکی زۆر
هەموو بچکۆلە وەکـوو مـــــارو مۆر
ڕۆژی ســــەت جۆرە بیـــــانوو دەگرن
گەر پەیای نەکەی وەختــــــە بۆی بمرن
چەن فکر دەکـــــــــەم دەردێ گرانە
هەزاران وەك من تێدا حەیــــــــرانە
ساخودا دەخیل ئەی پـــــــــەروەردگار
پەنا بە دەرگـات ڕۆژی هــــــــەزار جار
من بەندەیەکی بێ توانـــــاو زەلیــــل
ڕزگارم بکەی دەخیل ســــــەت دەخیل
دەرگای ڕەحمەتت زوو بکـــــــــرێتەوە
دەورانێ خۆشی دیســـان بێتــــــــەوە
(هەوری) خەم مەخـــۆ ڕوو لە خوداکە
هێزو یارمـــــــەتی هـــەر لەو داواکە

## (دەمێکە)[101]

حمێکە شـــــــەڕو هەرایە      دەنگ و وڕەی ڕەشـــــەبایە
ئسمان بەرگی تاری پۆشـــی      شین و گریانی بەجۆشــــی
حشت و چیا هـەموو تەم بوو      عالەم دڵی پڕ لە خەم بــــوو
جەن ســـــــاڵە ئەم دڕندەیە      لەگەڵمان بگرەو بەردەیــــــە
ـەم دڕندەیە پیـــــاو کوژە      ئەم نامەردە ئەم خوێنمــــژە
ـەم دەعبایە هەزار پایـــــــە      کە لە شێوەی مرۆڤ دایــــــە
خوێنی بە ناحــــــەق دەڕژان      جەرگی هەزارانی بـــــــرژان
شوومە هەروەکـــوو کوندەبوو      شێواندی شــــەوق و ئارەزوو
ئرەدانی هەمـــــوو رووخان      مزگەوت و تەکیەو دیوەخـــان
چەم ســــــووتاوەکانی وشکە      بۆتە جێی مارو دوو پشـــکە
نامەی خۆشی و شـادی دڕی      کۆتری ئاشتی ســـــەربڕی
خەم و تاڵی هــــەردەم بە بار      دەیڕژاند وەك تەزرەی بوهـــار
بەســـــــەر کەلاوەی دەروونە      ئەو دەروونە زۆر زەبــــوونە
هیوای شـــــادی تیا نەماوە      گلێپەو بڵێســـــــەی کوژاوە
بەڵام ئەمڕۆ وا ســــەر لە نۆ      تازە دەری کردووە چـــــرۆ
لە نوێ ڕەگی داکووتـــــاوە      تەواو گرتوویە ئەم نـــــاوە
هاتە خوار کوڕانی مـــــاندوو      نەوەی بابە گەورەی پـــێشوو([102])
دەروێشـــی تەکیەی ئەو زاتەن      هەموو وەك شێرو فـیلـــەتەن
بە هاوار ئێمەوە هاتــــــوون      تیمار بکەن زامــــــی دەروون
گەشایەوە ترووســـــکەی دڵ      سەر لە نوێ عەشقی هاتە کوڵ
هیوای پەیدا کرد بە ژیــــان      بۆ تۆڵە کەوتـــــۆتە جەولان

---

[101] - ئەم پارچە شیعرە بە هۆی را پەڕینی شاری کەرکووك لە رۆژی ١٩٩١/٣/٢٢ وتراوە

[102] - بابە گەورە – مەبەست لە سەرۆك بارزانییە.

## (وەرن وەرن)([١٠٢])

وەرن وەرن منـــــالینە    ئەمڕۆ ڕۆژی ڕاپـــــەڕینە
ڕۆژی ڕزگـــــاری میللە تە    دەورانی هـــەوڵ و هیمەتە
بەسەر چوو فرمێسكو زاری    وا پەیدا بووە ڕزگـــــاری
ئەما جەورو ترســـی دوژمن    ڕەگوریشەی دەرچوو لەبن

وەرن وەرن منـــــاڵەكان    ئەی مناڵە لێو ئاڵـــــەكان
دەمێكە دەنــــــاڵن بێ ناز    كۆتایی هات ڕێگەی هەوراز
ئەو ڕێگەی چەندەها ســاڵە    كورد دەتلێتەوە عـــەوداڵە
هەزاران شـــــەهیدی داوە    خاكی بە ئاگر ســـــووتاوە

وەرن وەرن مناڵـــــــەكان    وا بەسەرچوو شـــین وگریان
بڕوانە ئەم نیشــــــتمانە    ئەم خاكە شـــرین و جوانە
زۆر لە مێژە كزو مــــــاتە    دەروونی پڕ لــــــە ئاواتە
هەر چوار دەوری لێ گیراوە    وەك مەلێكی باڵ شـــكاوە

وەرن وەرن منـــــاڵەكان    ئەمڕۆكــــــە گۆڕاوە دەوران
دەڵێن زاڵم دەوری نەمـــــا    بووە بە پەندو سینەمـــــا
پشتی شكاوە بە جــــاریّ    شەرم و نەمسرەتی لێ باری
وێران بووە دام و دەزگـــای    تێك شكاوە هێزو ســـوپای

---

١٠٢ - ئەم هۆنراوەیە لە بارودۆخێكی تایبەت دا لە كەركووك لە ٢٤/٣/١٩٩١ ی.زایینی وتراوە.

ەرن وەرن منـــــالّینە      تەماشا بکـــــەن ئەم ژینە
حەفەت بارگـــەی پێچایەوە      شادی وا هاتـــــە کایەوە
ـەم بوهارە گەلیٚ جـــوانە      پاراوی خوێنی لاوانـــــە
ـۆیە وا تیشـــکی ئازادی      رایماڵی جەورو بێـــدادی

ـەرن وەرن منـــــاڵەکان      نازدارە خوێنە شیرینـــەکان
ـبسڕنەوە فرمێسـکی چاو      تاریکی چوو دەرکەوت هەتاو
ـوا بلێسـەی باوەگوڕگوڕ      موژدەی هێناوە کـــوت و پڕ
ـەلیٚ ئەی کوردی بیٚ نـەوا      هەستە ئیتر مەینەت نەمـــا

وەرن وەرن مناڵـــــەکان      هەلاتووە ئەســـتێرەی بەیان
دڕی بە تاریـــــکی داوە      موژدەی روونـــاکی هێناوە
ئیتر کاتی تێکۆشـــــانە      بێزاری روو لـــــــە نەمانە
تیشکی ئـازادی دەرچووە      ئەم کوردســـتانەی گرتووە

## (بریندارە دڵی زارم)

لە ناو جـــــــەورو خەمی رۆژگار بریندارە دڵــــی زارم
بەرۆژو شەو لە بەدبەختی خەریکی شــین و هـــــاوارم
وەرە بڕوانە حاڵی من چ ســەر سەخت و پەرێشانم
تەمەننای مردنم هەردەم بەدڵ لـــــەم ژینە بێزارم
رووناکیم لێ بزر بوو وا لــــــە ناو ژنێکی زۆر تـــەنگم
بەرێکەوت تووشی شــادی قەت نەبوو یەکجاری رۆژگارم
ئەگەرچی جیسم وجانم وا لە ناودۆســتان و یارانە
گوزەر گاهم دەبینی تۆ کە وێڵی دەشت و کۆسارم
وەکوو دێوانە ئاســا هــەر لە نــاو گێژی خەیـــالاتم
مەقامێکم نییە ئـــــــاوارەو مەدهــۆش و بیمــــارم
لە ئەحواڵی زەمانەو رۆژگار دوورو تـــــەوەللامە
هەمیشە گۆشەگیرو کزو گەلێ خامۆش و خەمبارم
ئەگەرچی (هەوری) بێچارە دووچاری مەینــەت و دەردە
لەسەر رێگە ی حەق و راستی شوکر هێشتا کە هوشیارم

١٩٩١/٣/٢٩

# (ئەی خوێنمژ

ـەی خوێنمژی زۆردار بێ ئەسڵی بەد ئەتوار
ـەی بێ حەیای بێ عار. ئەی زاڵـمی غەددار
سەت تف لە روخســارت لە جــــەورو ئازارت
لە ئیش و رەفتارت هەی روو رەشــــی رۆژگار
ـەم میللە تە ت شێوان تەڕو وشکت سووتان
چەندین دڵت رەنجان هەروەکوو گورگی هار
چەن پیرولاوت کوشت خوێنت بە ناحەق رشت
چەن ماڵو خێزان گشــت هەمووت کردتارومار
زوڵم و ســــــتەم تاکەی جەورو ئەلەم تاکەی
ئازارو خەم تاکەی لەم ژینە ســــەت زینهار
زوڵمت لە حەد دەرچوو خەڵـکی پەرێشان بوو
بێزارە لێت مێژوو چۆنی بکــا تۆمـــــــــــار
تاکەی دەواز بێنە ملی خۆت بشـــــــکێنە
بۆ بڕژێ ئەم خوێنە وەك جۆگـــــــەو روبار
هیچ کەسێ تۆی ناوێ لەم ســــەر ئەرزە تاوێ
بەسیەتی پێی ناوێ تۆزێ ببــــە هۆشـــــیار
بەســـــــەر چوو بێدادی کزی و نا مورادی
وا دەوری ئـــــــازادی وەختــە ببێ ئێزهار

١٩٩١/٤/١٥

## (تووشی دەوریٚ بوومە) ([١٠٤])

تووشی دەوریٚ بوومە یاران دوور لەدەرمان و تەبیب
رۆژو شەو نالەی دەروونم دیٚ بە ویٚنـــەی عەندەلیب([١٠٥])
خەم لە هەر چوارلا دەباریٚ هەروەکـــوو تاوی بوهار
دوور لە خاکی نیشتمان کەوتوومە بیٚ یارو غەریب
وا لەناو گیٚژاوی خەم دووچاری ســـــەت دەردو بەلاّم
چونکە بەم دەردەی گەیاندم تف لە روخساری رەقیب
چەرخی بەدکردار گەیاندمیٚ خـــاکی ئیٚران و شنۆ
دەربەدەر بیٚ مالٌ و پارە وایە تــــــەقدیرو نەسیب
سەیری ئەم خەڵــکە هەموو وردو درشــت گیرۆدەیە
پیاوی تاوانبار لەگەلٌ ئینســـانی زۆر داناو نەجیــب
هەرکەسیٚ سەیری دەکەی روخساری غەرقی ماتەمە
خوایە ئەم دورە بگۆڕی تۆ بە شــــــادی عەنقەریب ([١٠٦])
(هەوری) تۆ بڕوانە ئەم دەورە چە تووش و سەختەتە
دوژمنانی کورد هەموودەم وان لـــــە پیلان و فریـب

---

[١٠٤] - بەهۆی ئەو بارودۆخە تالەی کە بە سەر ئەم ولاتەی ئیٚمەدا هات و لە ئە نجامی ئەو رۆژگارە نالەبارە من و هەزارانی وەك من ئاوارەو دەربەدەر و پەریٚشان بوو منیش لە شاری شنۆ لە مالی مەحموودخان گیرسامەوە و ئەم پارچە شیعرەم لە ١٩٩١/٤/١٧ لە شاری شنۆ وتووە.

[١٠٥] - عەندەلیب- بولبول

[١٠٦] - عەن قەریب- بەم زووانە

## (بۆ كۆچی دوایی عەتیەخان)[١٠٧]

ـە ناو رەشـــــمالْی ئۆردوگای ئێران
ـەویْ نووستبووین گشت مالْ و خێزان
لەپڕ گوێم لیْ بوو دەنگ دایـــــە دایە
وەختیْ منیش چووم دیـــــتم هەرایە
ـوتیان عەتیە خان بێهـــــۆش كەوتووە
ـازانین مـــــاوە ئاخـــــۆ مردووە
وەختیْ سەیرم كرد كە لیْ دەكـــەن سلْ
زەرد هەلْگەڕاوە وەك لاپەڕەی گـــــولْ
فرمێســـــكی چاوم وەك تەرزەی بوهار
بەخوڕ لە ســـــەردا دەهـــــاتە خوار
بۆ كۆچی دوایـــی زۆر بیْ قـــەرار بووم
شادی باری كرد بە خەم دووچـــار بووم
ئەو شەو لـــــە دەوری هەتـــــا بەیانی
هەموو دانیشـــتین بەدلْ گـــــــرانی
كاتیْ تیشكی رۆژ ســـــەری هێنا دەر
كۆبۆوە لێمان دۆســـــــــت و برادەر

---

[١٠٧] - لە كاتی ئاوارە بوونمان لە نیزیك شاری شنۆ لە ئۆردوگای ( شوهەدای هەلْەبجە ) بووین كە لـە تەنیـشت دێـی ( بـیْ مزوورتیْ )ەوە كە ئاوایی مەجید خانە لە شەوی ١٩٩١/٤/٢١ی.زاینی بوو باجیم عەتیەخان كچی شێخ حەسـەنی بـەرزنجی دێلێژمیی بە نەخۆشیەكی كوتوپڕ ئەمری خوای كرد. ئەو شەوە تا بەیانی بەدیارییەوە دانیشتبووین لـە دوای رۆژهـەلات تەرمەكەیمان برد بۆ ئاوایی ناوبراو لەویْ بە خاكمان سپارد خەلْكی ئاوایی و مالْی مەجید خان بە تاییـەتی زۆر مانـدوو بوون خودا پاداشتیان بداتەوەو هەمیشە وێنەیان زۆر كـات ١٩٩١/٤/٢١، لـە ئۆردوگـای شـەهەدای هەلْەبجە لـە نزیـك شارۆچكەی شنۆ وتراوە.

زۆر بە حـــــورمەت و بەرێز و تەقــدیر
خەڵـــــــکی گەلێ زۆر زویـــر و دڵگیر
تەرمیان گواستەوە بۆدێی (بێ مزورتێ)
تەســـلیم خاك کرا زۆر چاك جێ بەجێ
ماڵی مەجیدخــــان زۆر خــزمەتیان کرد
هەرچی پێویست بوو ئازا دەســت و برد
خودا بۆ خاتر رەســـــوولی نــــــازدار
ئەم قەومە دوور بن لــــــە بەڵای رۆژگار
(هەوری) بنێرە هـــــــــــەزاران سڵاو
بۆ گـــــــــۆڕی پاکی وەك بۆنی گوڵاو

## (هەستی دەروون)(١٠٨)

ڕەها بوو دەســـتی ڕۆژگار و دەوران
ئێمەی گەیانده نـــــاو خاکی ئێران
لە دوای چەند ڕۆژێ پڕ دەردو عەزاب
بە ڕۆژو بەشـــــــەو بە بەفرو باران
بێ نان و بێ ئـــاو بێ خواردن و خەو
منداڵی وردە هەمـــــــوو دەگـــریان
باران و ســـــــەرما زۆر توندو بەهێز
هیچ کەس نەیدیبوو لە دەوری زەمـان

---

١٠٨ - لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە نالەبارەی کە بەسەر خەڵکی عێراق دا بە گشتی و بەسەر میللەتی کورددا بە تایبەتی دا هات ئەوەبوو دوای چەن ڕۆژێ هەموو بەرەو ئەو دیوی سنوور ڕەویان کرد لە بەر جەوری ڕژێمی سەدام ئێمەش هەروەك هەموو خەڵکی ئاسایی ئەم وڵاتە ناچار لەگەڵ منالەکاندا بەسەڵتە خێزانی ڕوومان لەو دیوی سنوور کرد پاش مانـدوو بـوون و ئـازارێکی گـەلێ زۆر بـە ئـاوارەیی و پەرێشانی و هەناسە سەردی و چەن ڕۆژێ بە ڕێگاوە بووین بەساردو سەرماو لەژێر ڕەهێڵەی تۆفانەوە بە هەناوی بـەتاڵ و ئـەژنۆی بـێ هێزو لێوی وشکەوە بە هەزار حاڵ هەر چۆنێ بوو خۆمان گەیاندە شاری (خانە) کە لەسەر سنوورەوە ئێرانییـەکان (پـیران شـهر)ی پـێ ئەڵێن لە دوای شەوێ بە هەر حاڵێ بوو لە ژێر لێزمەی باران و تۆفاندا زۆر بە زەحمەت و پەرێشانی و شپرزەیی گەیینە ناو شاری شنۆ لە ماڵی یەکی لە برا کوردەکانی ئەو شارە کە ناوی (مەحموود خان) و پیاوێکی دەسڕۆ و ناوداری شاری نـاوبراو بـوو گیرسـاینەوە و کـەمێ پشووماندا و ماندوویمان حەسایەوە. بەڵام زۆری پێ نەچوو نەیانهێشت سڕێ پێمان دەرچێ بـە تـەواوی سـەربازی ئێرانـی هـەڵیان کوتایە سەرمان و بە زۆری زۆرداری و بەبێ بەزەییانە ڕاپێچیان کردین بۆ ناو (ئۆردوگای شەهەدای هەڵەبجە) دوو سێ ڕۆژ لـەوێ بـووین تا بڵێی هەموو شتێ زۆر بوو وەکو خواردەمەنی و کەرستەی پێویستی ژیان دەس بەجێ بۆمان ئامادە دەکراو هەر کەس بە گوێرەی ژمارەی خێزانی یارمەتی تەواوی وەردەگرت. بەڵام ئێمە تابڵێی ڕوونـاکی لـە نـاو دڵ و دەروونمـان نـەبوو زۆر کـزو خـەمبار بـووین گەرچـی ناسیاویشی زۆر لێ بوو هامووشۆی ماڵی یەکترمان دەکرد هەر لەو ڕۆژانەدا لە ١٩٩١/٤/٢١ بوو بـاجیم عەتیـەخان کـچی شـێخ حەسـەنی دێلێژەیی کۆچی دوایی کرد لە خاکی غەریبایەتی لە ئاوای (بێ مروورتـێ) بـە ئامـادەبوونی دانیـشتووانی دێـی نـاوبراو زۆر بـەڕێو ڕەسمێکی شایستە بە خاك ئەسپەردە کرا بە ڕاستی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە زۆر کاری تێمان کرد سەرەڕای ئـەم هـەموو مـاڵ وێرانییـەو دەربەدەری و خەم و خەفەتی کە یەخەمانی گرتبوو گەرچی ماڵی مەجید خان کە برای مەحموود خان بوو ماڵی لە ئاوایی ناوبراو گـەلێ خزمەتیان بە ئێمە گەیاند لە کۆچی دوایی باجیم عەتیەخاندا هەرگیز باسی چاکەو پیاوەتی و مەردایەتیان ناکرێ بە قەڵـەم مەگـەر هەر خوای مەزن پاداشتی چاکەیان بداتەوە دوای ئەم ڕووداوە مامۆستا ماسین و کاك حەسەنی برای مەردانـە بـە دەنگمانـەوە هـاتن و هەوڵێکی زۆریان دا تـا ئێمەیان گواستەوە بۆ دێی ناوبراو و ژیانمان کەمێ خۆشتر بـوو ئـەم ئاواییـە بەشـی زۆر مـاڵی مەجیـد خـان و مەحموود خانە. ئاواییەکی زۆر گەورەو ئاوەدانە تا بڵێی خۆش و دڵگیرە هەموو چوار دەوری دارو دارستانەو جۆگەی ئاوی بە نـاودا دێتـە خوارێ زەوی و زاری بە زۆر کێڵگەو بەراوە ئەم گوندە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری شـنۆوە و جـادەی قـیر دەگەیێتـە ئـاوی لـە ١٩٩١/٤/٣٠ وتراوە.

بەهـــەر حاڵی بوو بـــە هەزاران دەرد
هەموو گەیینە نێو شـــــاری پیران
بەڵام ناو شاریش زۆر ئـــاوەدان بوو
لەبەر میوان و دەســـتەی غەریـــبان
هیچ جێگە نەبوو ئەو شـــەو بۆ ئێمە
هەر چەندە گەڕاین مزگـــەوت کۆڵان
ناچار کۆمەڵ بووین لە ســای دیوارێ
لەسەرما لەرزین هەتـــاکوو بـەیـان
بەیانی سەرباز گورج پیلیـــان گرتین
وتیان زوو بڕۆن ئێســـتا بێوچـــان
ئێمەش دەگەڕاین دەڵتەنگ و خەمبار
بێزارو زەبوون هەمـــــوو ماڵ وێران
یەك دەیگووت بڕۆن بۆ لای مەهاباد
میللەتێ چاکن دڵســـــۆزی کوردان
یەك دەیگووت نەخێر بـۆلای نەغە دە
یەك دەیگووت شنۆ باشترە بۆمـــــان
ئەنجا گشت سوار بوین کەوتینە رێگە
بۆ شاری شـــــــنۆ پەنا بە یەزدان
شارەکەی سمکۆ ئەو پیـــاوە مەردە
کە خۆی بەخت کرد بۆبەرزی کـوردان
لە رێگە گەلێ حاڵ پەرێشان بووین
باران دەباری بـــــەرێژنەو تۆفان
برسی و نەخۆشی هەم دەردوخـەفەت
هەموو بە جارێ گرتی یـــــەخەمان

ـە وەزعە تـــــاڵە بەم دەردە زۆرە
گەیینە ناو شار گشت دڵ پڕ لە ژان

هەموو وەستا بووین لەلای کۆگـــایێ
لەپڕ پەیدا بوو لاوی نــــەوجــــەوان

سڵاوی کردو ئەحـــــــواڵی پرسی
ـیمەش بەسەر هات خۆمان کردبەیان

ئەم لاوەش ناوی مامۆســـتا مامسین
خەڵکی شنۆ بوو کوڕی مەحموودخان

ـەرمووی لێ کردین چووینەوە بۆ ماڵ
بە ڕوویەکی خۆش دڵێ فــــــراوان

ئەوشەو لەوێ بووین بەڕێزو حورمەت
زۆر خزمەتیان کردبەراستی هـەمووان

چەن ڕۆژ بەو جۆرە زەحمەتیان کێشا
مامۆستا خۆی و گشت ماڵ و خێزان

کاک حەسەن برا بچووک مامــــۆستا
زیاد لە پێویست ڕەنجی دا بۆمـــــان

دوولاوی دیکەش خوێن گـەرم و چالاک
کاکە جەعفەر و کاکە ســـــەرتیپ خان

گەلێ پیاوانە خزمەتیـــــــان کردین
مانەندیان کەمبوو ناودەستەی مەردان

خوایە هەر شاد بی شـــــارەکەی شنۆ
چونکە دڵسۆزن بۆ قەومی کـــــوردان

گەرچی چەن قسەی زۆرناخۆشم بیست([١٠٩])

وەك تیر تەئسـیری کرد لە دڵ و گیان

بەڵام من هەرگیز پێ دڵتـەنـگ نابم

زۆرم بینیوە جەوری رووی جـیهان

وەك داری بەڕو زۆر رەگ ئەسـتوورم

هیچ نام شـێوێنێ کـزەبای بەیان

ئیتر داوامە لـە دەرگـای باری

هەم لە خزمەتی شـای ئاخرزەمان

خەڵکی ئاوایی (بێ مزوورتێ) هەمووی

بەتایبەتی لە گشـت مـاڵی مەجید خان

دایم مـەحفووز بن لـەبەڵای رۆژگار

خودا بۆ خاتر ئایـاتی قورئـان

هەمیشە هەموو هەر بـەختـەوەر بن

بەشادی دۆست و کوێری دوژمـنان

بەڕاستی تاکوو مەدحیـان کەم کەمە

خودا پاداشـتیان بـدا لەو جیهان

ئەگەر دەپرسـن بزانن من کـێم([١١٠])

(هەوری) بەرزنجی برای بچـووکتان

نەوەی محێدین شێخی کەرکووك شار

بەرزنجی نەسـەب نـاودارە و عەیان([١١١])

---

[١٠٩] - لە کاتێ کە لە شاری شنۆ بووین رۆژێ لەسەر دوکانێ هەندێ شتم کڕی کابرای دووکاندار وتی ئێوە لە خۆرا ئەوەتـ بەسەرخۆ هێناوە دەوڵەتی عێراق عەیبی نییە منیش ئەوەندەم وت بەڵێ رەنگە ئەم خەڵکە هەموو شێت بوویێ وازی لە مـ ژیانی خۆی هێناوەو کەوتۆتە پەنای پیاوی وەك تۆ.

[١١٠] - لەبەر ئەوە لە کۆتایی شیعرەکەدا ناونیشانی تەواوی خۆمم بردووە لەسەر داوای چەن برایەکی کوردی ئەودیوو کە نووسخەیان لەبەری نووسیووە.

## (هەواکەی سازگار)[112]

هەواکەی ســـــــازگارو خۆشە کەرکووك

هەموودەم شۆخ و شەنگە هەروەکو بووك

نە زۆر ســـــەرماو تۆفانە بە زســـــتان

نە گەرماو گــــرەی زۆرە بە تاوســـــــان[113]

بوهاری هەروەکوو باغچەی بەهەشـــــــتە

هەموو دەوری تەپۆلکەو زوورگ و دەشتە

رووباری خاسە چەن جوان دێتە خوارێ[114]

هەموو بێستان و باخە گشـــت کەنارێ

---

- ئاودارو عەیان- دەگەڕێتەوە بۆ زاتی شێخ محێدینی کەرکووك.

- لە دوای ئەو باروتۆخەی کە بەسەر ئەم ولاتە داهات ئەوە بوو ئێمەو هەزارانی وەك ئێمەی گەیاندە ئەودیوی سنوور بە هەر حالێ بوو گەڕاینەوە شاری هەولێر ماوەیەکی زۆر ماینەوە گەلێ دڵتەنگ وخەمبار بـوون سـەرماو سـۆڵەی ئـەو رێگـە دوورو ئاوارەیی ئەو کوێستانی حاجی ئۆمەرانەو بەهانەگرتنی سەربازی ئێرانی و قسەی ساردو سڕی بێگانەو ناحەزان و زۆر شتی تر ئەمانە هەر هەمووی بوونە داخێکی زۆر گران لە دووتوێی دڵ و دەرووندا بە تایبەتی کە تا دەمرم ئەو کاتـەم لە یاد ناچێ رۆژێ لە شنۆ تووشی هاوڕێیەکی زۆر ئازیز بووم ( کاك شاباز خورشید ) کە زۆر دەمێکی دوور بـوو ئەمـدی بـوو کاتێ لەو ئاوەدا بینیم لەو شوێنە زۆر دڵم پێ کرایەوە بە زۆر بردمەوە بۆ ماڵ خواردنیان ئامادە کـرد و کـە دەستمان بـۆ نانەکە برد لە ناکاوێ دا دوو سێ سەربازی ئێرانی پەیدا بوون و دەرگەیان پێ گرتین و وتیـان هـەر ئێـستا ( بـرون بـرای اوردگاە ) ئەوەندە هەوڵماندا بێسوود بوو ماوەی ئەوەیان ئەدا کە نانەکەمان بخۆین ناچار میوانەکەمان بەرێ کـرد بـەدڵ نیگەرانییەوە رۆیی و کابرای سەربازیش خێرا خێرا دەیگوت ( برون برای اوردگاە ) ئێمـەش ناچـار هەنـدێ شـڕەو پڕەمـان هەبوو کۆمان کردەوە و کەوتینە رێ، ماتۆر سوارێ لە پێشەوەو یەکێ لە دوامانەوە لەبەر ئەوەی نەکوو بگەڕێینەوە بۆ نـار شار، بەو شێوەیە زۆر بە رەفتارێکی ناشرین و ناپیاوانە ئێمەیان گەیاندە ( ئۆردوگای شەهەدای هەڵە بجە ) ئەمـەو چـەند کردەوەیەکی گەلێ لەمە ناشیرین ترم دی لەبەر ئەوە زۆر تامەزرۆی گەڕانەوە بووین بۆ کەرکووك ئیتر گە گەیشتینەوە سەر جێ و رێی خۆمان زۆرمان بەلاوە خۆش بوو هەر چەن کە لەلایەکەوە ماڵ و حاڵمان هەموو بە تالان چوو بوو، و هیچیان بـۆ نەما بۆوە لەلایەکی ترەوە مرەمرێ پیاوانی رژێم هەر بەردەوام بوو بەلام دیسانەوە بەلای ئێمەوە هـەر لـە شـوێنانی تـر خۆشترو دڵگیر تر بوو ئەم پارچە شیعرە بەو هۆیەوە لە ١٩٩١/٥/٢٧ وتراوە.

[113] - تاوسان- هاوین.

[114] - رووباری خاسە بەناو کەرکووکدا تێدە پەڕێ بەزستان ئاوی پێدا دەروا بەلام بەزۆری بە هاوینان وشکە.

وەکوو زێر وایــــە خاکــــــی ئەم وڵاتە
کە جێگــــــەی خۆشی و ژین و حەیاتە
تەلاری بەرزو کۆشــکی جوان و ڕەنگین
ئەگەر سەت ساڵ بمێنیٚ نــابیٚ خەمگین
قەڵاکەی گشت دەمیٚ جێگــــەی سەفایە
لە وەســــفی چی بڵێم دیــــارە ڕەوایە
لە مێژوودا بەیـــــانە شــــاری کوردە
کەچی بۆ ئێمە جێگــــەی ئاهوو دەردە
خودا مەحفووزی کەی ئەم شــارە جوانە
لە شـــــــــەڕی زاڵم و فیتنــەی زەمانە

## (ئەی دڵ)

ـەی دڵ بناڵە خاك بەسـەر		گوناهی تۆ لە حەد بـەدەر
ـو خۆت بگـریە رۆژو شەو		چاوت نەبێ لە خوردو خەو
ـەرگت دەبرژێ وەك كەباب		لەدەهشەتی رۆژی حیساب
ـ خەوی غەفڵـەت راپەرە		دەسگیر تەنها پێغەمبـەرە
ـوەل خوداو دووەم ئـەوە		بە خۆی رابەرو پێشـڕەوە
ـەو شاهی هەردوو دونیایـە		خاوەن موعجیزەو غەزایـە
ـەرگاهی ئەو بگـرە قایم		لە رێگـەی ئەو برۆ دایم
ـەزاران درووود و سـلاو		پێشكەش لەگەڵ بۆنی گولاو
ـەم لە بۆ سـەحابەی كیرام		رەحمـەتی خودا بەردەوام
ـبرژێ هەموو دەم بێ وچـان		هەتا رۆژی ئاخیر زەمـان
ـبۆ گیانی پـاكی پێغەمبەر		لەگەڵ یارانی سەرانسـەر

كەركووك – ١٩٩١/٦/١١

## (بولبول بەیانیان)

بولبول بەیانیـــــان کاتێ دەخوێنێ
رازی دڵی خــــــــۆی هەڵدەڕژێنێ
لە دووری گوڵە نـــاڵەو هاواری
ئارامی نییە ئەو لە هیچ شوێنێ
ئەوەندە عەشقی روخســـاری گوڵە
بۆیە بەو جۆرە فرمێسکـــە رژێنێ
منیش وەکوو ئەو گەلێ خەمناکم
لێشاوی خەفـەت وا دەمخنکێنێ
هەموودەم لە ناو دەریای مەینەت
جارێ نەمبینی مــن خەم ڕەوێنێ
گەلێ تەقەلام داوە لــــــەم ژینە
قەت بۆ من نەبوو جــارێ کەلێنێ
وەرە بڕوانە ئەحواڵی (هـــەوری)
جەرگی کون کونە خوێنە دەڵێنێ

٣٠/٨/١٩٩١

## ( فەلەك دووبارە ) (١)

ەلەك دووبـــــارە دەورانی شـێوان
حونچەی ژیانی مەردێکــــــی وەران
مەرگی شـــێخ عوبێد داخی گران بوو
بۆ قەوم و هــۆزی وەك پشتیوان بوو
.تیێ پیرۆز بوو شێخی موبـــــارەك
ەکـــــــیەو مەقامی زۆر بە تەدارەك
نەوەی شێخ عەلی شـێخی دۆڵپەموو
رۆیی لە دەسمان هێشتا کە زوو بوو
ئەم چەرخ و دەورە بۆ کـــەس نامێنێ
هەر رۆژێ جەرگی یەکێ دەسووتێنێ
مەعلووم هەر کەســــــێ هاتە دنیاوە
رۆژێ هەر دەبێ بکـــــا ماڵئـــــاوە
ئەمڕۆ شـــێخ عوبێـــد داخی دەروونم
بۆ کــــۆچی دوایی جگەر پڕ خوونم
لەدەسمان رۆیی ئەم خـۆش گوفتارە
ئێمەی بەجێ هێشت لـەم شـین وزارە
(هەوری)وەکو ئەوتۆش رۆژێ دەڕۆی
بۆ خۆت شـــیوەن کە زارو رەنجەڕۆی

## (قودرەتی خودا)

ئەی خودای بێ شەریك و بێ مەکـــان
من لە ئاســـتت چۆن بسووڕێنم زوبان
خالقی ئەستێرەو هەم مانــگ و رۆژ
چی لەسەر ئەرزە هەتاکوو ئـاسمان
هەر لە سەحراو لە دەریـاو شاخ و هەرد
گیان لەبەر تاکو دەگـات ئینــس و جان
رزق و پێوستی هەمـوو دابین دەکەی
ئەوەندەی تۆ داوتە پێی عومرووژیان
چیت بوێ هەر دەس بەجێ ئیجرا دەبێ
قـــــــادرو توانا بە خۆتی بێ گومان
عیلم و زانستی تـــەواوی سەرزەمین
کۆڵەوارە ئەو لەراسـت تۆ هیچ نەزان
سەیری ئەو قورئانە کە گشت حیکمەتە
روو رەش و ریسوا دەکـا بـێ باوەڕەکان
سڕی حاومیم و عەین و سین و قاف
تاکوو ئەمڕۆ کـەس نەبوو بیکا بەیان
(هەوری) تۆ لەم باســـە وریابە دەخیل
نەوەکوو لەم بەحـرە ون بـــی ماڵوێران

١٩٩٢/١/٢٧

## (سەیرو سەیران)

سەیرو ســـــــەیرانی ناوباخ و گوڵزار
شادی و هەڵپەڕکێ گوێ چەم و رووبار
بۆنی نێرگز و شــــەوبۆ و یاسەمین
هەتا چاو بڕکا دەشت ودەریای شین
کام خۆشی دەگا بە وەســـڵی دڵـــــدار
وەیا دیداری دۆست و کەس و کــــــار
یا دەنگی قومری و ئاوازی بولبـــول
وەکوو دەرمانن لــــە بـــۆ دەردی دڵ
نەغمەی بە سۆزی ناوگەرووی شمشاڵ
دڵی زۆر خەمگین دێنێتە ســـــەر حاڵ
هەر سۆز و سەدای ئاوازێکی خۆش
بە مەرجێ دەروون بهێنێتە جــۆش
زۆر خــۆشە وەکوو دەوری ئـــازادی
مــرۆڤ دەخـــاتە ناو دەریای شـــادی
ئەوە لەلای من زۆر گــــران بایـــە
نایدەم بە موڵکی سەر ئەم دونیایـە
(هەوری) گەر مێشکی تۆزێ حەساوە
لای وایە لەو پەڕ شــــــــادی ژیاوە

١٩٩٢/٤/١

## (گوڵی سوور)

گوڵی سوور ڕەنگی زۆر گەش و جوانە
چونکە پەروەردەی خـــوێنی لاوانە
گوڵی ئـــاڵ گەلـــێ جوان و شرینە
وەك لێوی دولبەر کە قووتـــی ژینە
گوڵی مۆر ڕەنگی زۆر بـــە تەئسیرە
هەر خاسی دەستی شـــاهوو ئەمیرە
گوڵ سـپی هەست وهۆش دەبزوێنێ
چونکە نیشـــانەی ئاشتی دەنوێنێ
گوڵی شین دەڕوێ لـــەو کـەژو هەردە
وەك ڕەنگی ئاسمان ساف و بێگـەردە
گوڵی زەرد دیـــارە زۆر بێ هاوتایە
چونکە ئەو ڕەمزی ڕووناکـــی تیایە
کاتێ کە شـــــەوگار سامی لادەچێ
تیشکی خۆر زەردە لە کەل دەردەچێ
بولبول لەو کاتە بە کـــوڵ دەخوێنێ
مزگێنی خۆشی و شـادی دەهـــێنێ
ئەو کاتەش (هەوری) دڵی گوشـــادە
خۆی بۆ ژینی نـــوێ دەکا ئامـــادە

١٣/٤/١٩٩٢

# (شیعرێکی مەلا سابیر)

ـەوی دووشەمە پاش نوێژی عیشا
ـوماڵ شێخ عوبێد دەچووم بە تەنها
چونکە زۆر یادم دەکـــرد پڕ بــــە دڵ
زاتێکی پاکە وەکوو خونچـــەی گوڵ
ـەردەم تکـــا مەلای زاتی بـــاری
ـورر بێ لەجەورو لە بێ قـــەراری
کاتێ چوومە ژوور وتم ئەســــــەلام
وەڵامیان داوە بە شــیرین کــــــەلام
ـەیرم کرد لەوێ کاک مــەلا ئەنوەر
ـەگەڵ چەن کــەسێ پاك و مـــنەوەر
تەدریسی قورئان دەیان خوێند لەوێ
ئەنوار دەباری ئەو شـــــەوە لەوێ
پاشان بەهـادین پەیـــدا بوو لێمان
کەوتینە قسە بەخۆشـــی هەمووان
بۆیانم باس کرد ئەحـــواڵی پۆلـیس
کە چۆن منیان گرد دامیانە بەرلیـس
ئەم هەڵبەســتانەم داناوە بۆ تـــۆ
کاکە شێخ عوبێد نەبی رەنجـــەرۆ
ئەی هاوڕێ چاك و پاك و بە ئـــەدەب
بەڕێز و ناودار خــــاوەنی نەســەب

سەیدو ئـــــەولاد زاتی پێغەمبـــەر
گەلیٚ گەورەنە لای زاتــــــی دادگەر
من داواکارم لە دەرگـــــــای خـــودا
بە خۆشی بژی لەســـــەر رووی دونیا
(سابیر) فرســـــەتە بۆت ئەم ژیـــانە
حووبی ئال و بەیت نووری ئیـــمانە

١٩٩٢/٤/١٨

## (وەڵامی مەلا سابیر)[115]

ـرێی خۆشەویست کاك مەلا ســــابیر
ـە هیوام هەرگیز نەتبینــــم دڵگــــیر
هەموو دەم بژی بە خۆشی و شادی
خەمی زەمـــــانەت قەت نەییتە بیر
ـوژمنت زەلیل دڵ پڕ ئــــــــازار بێ
جەرگی خوێناوی کون کون بێ بەتیر
دایم دووچــــــاری دەردو بەڵا بێ
دەستوپێ بەسراو بەوێنەی ئەسیر
تۆش وەکوو خونچەی دەمەو بەیانی
بە شەوق و هەوەس هەروەکــو ئەمیر
دونیا زۆر خۆشە لای هەرزەو نەزان
بەڵام زیندانە لــــــەلای پیاوی ژیر
کاکی خۆم خەفەت مەخـــۆ لەم ژینە
گشت بەجێی دێڵێ گەدا تــــا وەزیر
دونیا هیچ نییە چـــەن رۆژێ ژیان
کردەوەی چاکە قەت نــــاکرێ لەبیر
(هەوری) بە هیوای خۆشی و شادیتە
دووربی لەئێش وجەوری دونیای پیر

[115] - شەوێ لە تەکیەی خۆمان چەند کەسێ دانیشتبووین لە ناکاوێ مەلا سابیر پەیدا بوو دوای ئەو مەلا بەهادین هەموو کەوتینە گفتوگۆ کردن دیار بوو پۆلیس زۆر مەلا سابیری ئازار دا بوو لەسەر مەسەلەی سەربازی ئەویش بۆی دەگێڕاینەوەو گلەیی لە رۆژگار دەکرد دوایی پارچە کاغەزێکی دەرهێناو ئەم هەڵبەستەی نووسی منیش بەم پارچە شیعرە وەڵامەکەیم دایەوە. ١٩٩٢/٥/٢٩

## (ڕۆژی کورد هەڵات)[١١٦]

ئەمڕۆ ڕۆژی کورد هـــەڵات تیشکی دای لە گشت وڵات
مەینەت و خـــەم باری کرد دوژمنی نامـــــــەرد هەڵات
ڕۆژگاریٚ خەم دەبــــاری لـــــە باتی ڕوتبەو خەڵات
ڕەنج و تەقەلای چەن ساڵ بەرهـــەمی هەوڵ و خەبات
داری ئازادی بەخــــــوێن لق و پۆپی لە نویٚ دەرهات
ئەمڕۆ وا هاتـــــــۆتە بەر میللەت گەیی بە ئـــــاوات
مەردانە هەموو یـــــەکبن لـــە ڕۆژی تەنگ و نەهات
دوژمن بۆت لــــــە پارێزە بەدایم هــــەر لەحزەو کات
(هەوری) وریـــــابن هەموو ڕەنجتان بە فیڕۆ نــــەڕوات

[١١٦] -ئەم هۆنراوەیە بە هۆی هەڵبژاردنی یەکەم پەرلەمانی کوردستان لە هەولێر لە ١٩٩٢/٥/٢٥ی.زاینی وتراوە.

## (بۆ كۆچی دوایی مەلا عەبدوڵڵا)[١١٧]

ـى پێنج شـــەممە بەیانی زوو بوو
ـر راپەڕیم گـــوێم لە دەنگێ بوو
بانگی كرد دەیگوت ئەی موسـڵمانان
ئەمشەو كۆچی كرد مەلای گـەورەمان

ـحی هەڵفڕی بۆ بـــاخی بەهـــەشت
ـ خزمەت باری كەوتە ســـەیرو گەشت
خودا لێ خۆش بێ لە ســـــەیئاتی
لە ڕۆژی مەحشــەر بدا نەجـــاتی

ـمت چرا وابـــوو بۆ دینی ئیســـلام
ـۆر خۆشەویســـت بوو خاوەن ئیحترام
مەجلیسی بەزەوق گفتوگۆی خۆشبوو
دەم بە پێكەنین هەردەم ڕووخۆش بوو

ـنـــایێ وەك ئەو ئەمـــڕۆ زۆر كەمە
ـە دەســــمان ڕۆیی دڵ بۆی پڕ خەمە
ڕەبیعول ئەوەل ڕۆژی ســـیانزەهەم
شین و واوەیلا پەیـدا بوو لـــە دەم

ساڵی وەفـــــاتیم زوو لە دڵ پرسی
هەزارو چوار سەد هەم سیانزەی نووسی

---

[١١٧] - بە هۆی كۆچی دوایی خوا لێخۆش بوو مەلا عەبدوڵڵا حوسێن ئیمام و خوتبەخوێنی مزگەوتی گەورەی ڕەحیماوا لە ١٩٩٢/٩/٩ی زاینی وتراوە.

## (ئازیز گوێ بگرە)

ئازیز گوێ بگرە لە دەنـــــگو باسم
لە ناو زەمانە وەك گێژو کاســـــــم
بۆتی بەیان کــــــــەم ئەحواڵی دونیا
لە ژین تا مردن هەرچـــــــــی وا تیـا
پێشان منـاڵی بێهۆش و نەفــــــام
دوای چەن ساڵێ تر کە بوویتە زەلام
لە هـــــــەر چوار لاوە بەڵاو دەردو خەم
کۆ دەبێتــــــــەوە وەك سوپای عەجـەم
نایەڵێ ئیتر یــــەك شــــەقاو بنەی
بەئارەزووی خۆت کــــاری وا بکەی
رۆژی هەزار دەرد دێتـــــە کایـــــەوە
هەر خەم و حەســـــرەت بۆ تۆ مایەوە
بە هەردوو دەســتی ناقرگەت دەگرێ
هەتاکوو تەواو هەناســەت دەبــــڕێ
ماوەت پێ نادا بە ئـــــارەزووی خۆت
دەستوپێت دەرکەی لە کەلەپچەو کۆت
تا پەیدا دەکەی دەرمــــانی دەردێ
لە ولاوە هـــــەزار ئەوەندەت بۆ دێ
جارێ شێواوە ژیان و حــــــــــاڵت
جارێ بەر بووە ئاگر لە مـــــــــاڵت
جارێ بە دەســــــتی زاڵم گیرۆدەی
جارێ بێ جێو ڕێی هەروەك گەریدەی

جاریَ نەخۆشی بیَ چارەو دەرمـــــــــان
جاریَ بێهۆشـــی بیَ کارو فـــــــــەرمـان

ـدریَ تا سەت جار هەر دلَ گرانی
ـیخاوی خەفەت شـــەو تا بەیانـی

ئیتر بەم جۆرە رۆژو مانـــــــــگ و سالَ
دایم زیرەت دیَ هـــەروەکوو منـــــــالَ

ـچونکە زەمانە زۆر بیَ وەفـــایە
ـەرگیز بەزەیی بە کەسدا نایـــە

هەتاکوو عومرت دێتە کـــــــــــــۆتایی
لـــــــــــە دونیا دەکەی تۆ مالَ ئاوایی

ـکەوێتە ریَ بۆ خزمەت بـــــــاری
ـگەلَ چەند گەز خام تۆ بە ناچاری

(هەوری) واز بێنە تـــــــۆ لەم گوفتارە
تەنها هەر بەدەس پـــــــــــەروەردگارە

١٩٩٢/١١/١٩

## (تیشکی خۆر)

تیشکی خۆر دەرچوو ئەمڕۆ لەدەم کەل
مژدەی ڕووناکی دەبەخشێ بە گــــەل
ئەو ڕەنگە جوانە کـە زەردو ڕوونە
سامی شەو ئیتر کزو زەبوونـــــــە
کوردە وا ئیتر دەمـــــەو بەیــــــانە
لابــــــەری دەردو ئـــــــــازارو ژانە
دەمێکە بەشت مەینـــــەت و زاری
هەر ژێر چەپۆکە وەك خزمەتکاری
ڕۆژگاری خەم و مەینەت بەســــەرچوو
سەربەستی و شادی لە جێی پەیدا بوو
جیهان ئەمڕۆکــــە تــەواو گۆڕاوە
کۆت و کەلەبچەی دوژمن پســــاوە
پێویســــــــتە ئێمەش ئیتر وەك بــــرا
دەس لە ناو دەس یـــــەك بی قڕەو هەرا
با ئالای وەتەن بشـــــــــەکێتەوە
دڵی پیرو لاو بگەشــــــــــێتەوە
(هەوری) باکوێر بێ ناحـــــەزانی کورد
ملی بشــــــکێ و ئەژنـــــۆی ببێ ورد

٩٢/١٢/٢٩

## (گەلێ روو لە من)

گەلێ روو لە من لێشـــاوی دەردهات
ـ هەر چوار لاوە وەك دارو بەردهـات
بۆ ســـــەر دڵەکەی پڕ ئێش و زارم
تانەی ناحەزان وەك کوللە زەرد هات
چۆن خەمـــگین نەبێ دڵەی بیمــارم
ـۆمن بە جارێ بەڵای سەر عـەردهات
زۆرجا ژیانم تاڵ و ناخـــــۆش بوو
تووشی ئازارو سزای نامــەرد هات
ـوپاس بۆ خودا لەشـــکری شادی
ـەروەکوو شێری ئازاو نـــەبەردهات
چونکە رۆژگار دەوری گـــــــۆڕاوە
دەورانێ خۆش و پاك و بێگەرد هات
لە جەورو میحنەت دڵ رزگـــاری بوو
هەوری) وا رەحمی تەنیای فەردهات

## (ئازيز بڕوانە)

ئازيز بڕوانە چـــەن پەرێشـــــــانم

کەنەفتی دەستی چەرخـــی زەمانم

بێزارم لە خـــۆم هــــــەم لـــەم ژيانە

خۆشی هەميشـــــە لەمن پـــەنهانە

بەرۆژو بەشـــەو نالـــەی دەروونـــم

وەك لالەی بێ ئاو کـــــزو زەبوونـــم

خەڵکی بەبێ هۆ لێــــم بۆتە دوژمن

زۆر بێ رەواجـــــم وەك نانی هەرزن

زيانم نييە بۆ دۆســـــت و ناســــيار

لە غەيری چاکەو شـــيرينی گوفتار

کەچی تێ ناگـــــەم بۆچی بەمجۆرە

تـــووش گێچەل دەبم هەردەم بەنۆرە

بەڵام نەمـــزانی رۆژگار گـــــۆڕاوە

هەق دەناڵێنێ و ناحەق بەتــــــاوە

شادی وێڵە لـــــــــەم دەورو زەمـــانە

لە هەر کوێ دەبێ هەروەك زيـــندانە

ئەم دەورەی ئێمە لە ناوی دەژيـــــن

نابينی بێجگە لە شــــين و گـــرين

مەگەر رۆژگارو دەوری هـــــــــۆلاکۆ([118])

خەڵکی بەم چەشنە بووبێ رەنجەرۆ

---

[118] - هۆلاکۆ – فەرماندەيەکی جەنگيز خانی خوێنڕێژ بووە

ـرمو بەردەیەو پارە وەرگـــــرتن
ـــەر ماڵی خۆی راونان و کوشتن

رۆژی هەزار بار خـــەفەت دەبـــارێ
بۆ سەر ئەم خاکە لەگشت کنـــارێ

چەند گۆشەگیر بی ولەعالەم بـەدوور
ـبیتە مایەی گوشـادی و ســروور

ئەگەر دەتـــەوێ دوور بی لە ئـازار
قەت مەکە هاورێی پیاوی بەدکردار

مەوری) بزانە گشـتی حیکمـەتە
ـوبانت بگرە ســــەر ســەلامەتـە([119])

ئەم شیعرە لە ١٩٩٣/٧/١١

[119] - ئەم نیوە دێرە پەندێکی کوردییە .

## (کوردە ئەمڕۆکە)[١٢٠]

کوردە ئەمرۆکـــــــە یادی ئەیلوولە
دوژمنـــــت گەلیٚ کـــــزو مەلوولە

دیارە بەنرخـــە گەلیٚ ئـــــەم یادە
میللەت بە جاریٚ دلّی گوشـــــادە

وەکو ئەم رۆژە سالّی شەست و یەك
ئەم گەلی کوردە دەسـتی دایە چەك

راوەستا دژی داگیرکـــــــەرانی
روبەڕووی دوژمن وەك شیٚر نەڕانی

تەواوی خاکی کوردی خۆڕاگـــــر
لەژیٚر پیٚی دوژمن گشت بوو بە ئاگر

دوژمن لە ئاسـتی وەکو ریٚوی گەڕ
هەمـــوو هەلاّتن لە مەیـدانی شەڕ

گەورە هەتاکـوو دوا بچووکـی کورد
هەموو بەیـەك دەس هەلّمەتی دەبرد

شۆڕشی نویٚیان بۆ کورد داگیرسان
دەنگی دایـــەوە سەرانسەر جیهان

کورد ئامادە بـوو بە مـــالٚ و گیانی
بۆ رزگار بوونی گشــت کوردستانی

---

[١٢٠] بەبۆنەی تێپەر بوونی ٣٢ سالٚ بەسەر بەرپا بوونی شۆڕشی ئەیلوولی مەزندا لە ١١/٩/١٩٩٣ وتراوە.

## (ڕۆژێ بە ڕێکەوت)[121]

ڕۆژێ بە ڕێکەوت ڕێم کەوتە هەولێـر
کە چوو بووم لەبۆ هەندێ کاری خێر
چەن ڕۆژ لـەوێ بووم لە هاتنەوەمدا
چەن کەسێ بەدخوو لەمن بوو پەیدا
منیان گلداوە بـەبێ ســـووچ و هـۆ
لەبەر ئەو خۆرە هەتـــا نیــــــوەڕۆ
لەگەڵ یەکێکیان کردمە کێشمەکیش
بەرەو ئاســـــــایش منی دایە پێش
بردمیانە ســەرێ بۆ قــــاتی دووەم
چوومە ژوورەوە ڕێك و مەنتــــــەزەم
کابرایێ ورگن شـــــان و قۆڵ قەوی
وتی ئەم هەوییەو نـــــاوە تۆ هەوی

---

[121] - ڕۆژێ چووم بۆ هەولێر لە گەڕانەوەمدا لـە نوقتـەی پشکنین داوای هەوییـەیان لێکـردم مینش دەفتـەر نفووسـیکی وینەگیراوم لا بوو ئەمەی نەسەلماند دایەومو هەندێ ناسیار هەوڵیان بۆمدا بەلام بێسوود بوو پاش ماوەیەك دامیانە پێش بۆ ئاسایشی هەولێر بردمیانە لای کابرای لێپرسراو زەلامێکی ورگنی قەڵەو دانیشتبوو وتی کورە تۆ دەچێ بـۆ سـەفەر بـۆ هەویە هەڵناگری لەگەڵ خۆت، وتم قوربان من تەمەنم ڕەتبووەو وتی مەسەلەی تەمەن نییە گەر کەفیلی ئاسراو نەهێنی دەتهاومە ژوور، لێرە کەس دەناسی وتم بەڵێ ئە نجاوتی وەرە ئە جمەدین برۆ لەگەڵ ئەم کابرایە با کەفیلێ بێنێ ئـە نجا کاك ئەجمەدین و دوو کەسی تر سوار سەیارەیەك بووین بەرەو ماڵی شێخ مەلیکی کوڕی شـێخ ڕەئـووفی خانـەقای کـەرکوو کەگەیینە ئەوێ لەو کاتەدا شێخ میوانی هاتبوو لەبەر دەرگا بوو کە منی بینی لەناو سەیارەکە هات بۆ لامـەوە وتـی هـا شێخ عوبێد ئەوە خێرە لەگەڵ ئەمانە چ دەکەی لێرەش پێوە بووی منیش مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش بـەناوبراوی وت بە مەسئوولەکەت بڵێ ئەم پیاوە خزمی منە بازوو بەریدا ئەگەر شتێکی تری هەیە لەگەڵی ئەمە ژمارەی تەلەفۆنەکەمە من لە ماڵم باناگادارم بکاتەوە ئە نجا منیان گەڕاندەوە بۆ دائیرە دیار بوو لە دواییدا کاك ئەجمـەدین مـنی ناسـیوە چـونکە خەڵکی دەورویەری کەرکووك بوو لای کابرای بەرپرسی ئاسایش باسی منی بۆ کرد ئیتر وازییان لێ هێنام و ڕزگارم بـوو لـە ١٩٩٣/٩/١٥ لە هەولێر ئەم شیعرە وتراوە.

وتم ئەفەندی ئەمـــــــــن ناسـراوم
گەر باوەڕ ناكـــــــەی بپرسە ناوم

وتی لە هەولێر تـــــۆ كێ دەناسی
وتم كێ دەڵێی بۆت بكەم باســـــی

وتی گەر كەفیل نەهـــــێنی بۆمان
ئێستا دەنێرم بتهـــــاونە زینـدان

وتم بنێرە زاتێ لەتـــــــــەك من
هەتا بهێنـم كەفیـــــــــلێ زامن

ئەنجا بانگی كرد لاوێكی روح سووك
زەحمەت بكێشە وەك برای بچـــووك

بچۆ لە تەكی كـــــەفیل دەهـێنێ
تا رزگاری بێ و زەحمـــەت نەنوێنێ

من و ئەو لاوە سوار سەیارە بوویـــــن
خێرا بەرەو ماڵ شێخ مەلیك دەچووین

كاتێ گەیشتین شێخ خۆی لەماڵ بوو
بە بینینی مـن زۆرخۆش ئەحواڵ بوو

وتی شێخ عوبێد ئەمــــــانە چییـــە
منیش تێم گەیــــــاند مەسەلە چییە

بەلاوەكەی وت بەفلان كـــــەس بڵێ
ئیشی ئەم خزمەم بكــــا جێبەجێ

زۆر عەرزی دوعـــــــاو سەلامم هەیە
من ناتـــــــوانم بێم میوانم هەیـــە

جا گەڕاینەوە بۆ شــــوێنی خۆمان
لاوەكە لەرێی وتـــــــی بە قــوربان

جەنابت خەڵك كوێ ولەكوێوە هاتووی
منیش ئەدەرسی خۆم پێوت هــەمووی
وتی كاكە شێخ من مەحسووب ئێوەم
هەر چیت پـــێویستە حازرم هەردەم
بۆچی دەنگ ناكـــەی تۆ چەن سەعاتە
من تۆم نەدیوە چـــەن وەخت و كاتـــە
وتم بڵێم چی ئەی برای هۆشـــــیار
خۆ لە خـــۆمەوە نایكەمە هـــــاوار
گوناهم چییە لــــــــەم بەزم و رەزمە
كەوا ئازارم دەدەن بـــــــەم نەزمـــە

وتی كاكە شـــــێخ چی بكەین ئێمە
دەسەڵات نـــییە ئەمـــــری هەرێمە
ئەنجا چوینەوە لای كابرای مەسئوول
وتی چەن قسەم لێ بكە قەبـــــــووڵ
ئەم پیاو شێخەو دۆســــــتی ئێمەیە
ئەگەر تۆ بەمـــــن باوەڕت هـــــەیە
من خۆم كەفیلم بە هەموو شــــــــتێ
هەرچیت پێویستبێ دەیكەم جێبەجێ
وتـــی زۆر چاكە مادام دەینــــــاسی
زوو چاو بپۆشیە لە دەنگوبـــــاسی
ئیتر رزگار بووم سا بە هـــەر ئەحواڵ
بۆ ڕۆژی دوایی گەیشـــتمەوە مـــاڵ
(هەوری) ئەمردی لێرەش پێوە بووی
تووشی ئازارو سزای كوردیش بووی

## (لە کونجی فیرقەت)

لە کونجی فیرقەت زەبوونم ئەمشـــەو
شێواوی دەستی گەردوونم ئەمشـەو
لە دەشتی سینـــەم هەر بارانی خەم
بۆ سەر دڵەکەی مەحزوونم ئەمـــشەو
شەپۆلی ئەشـــکم وەك ئاوی ئەڵوەن[122]
وێنەی فەرهادی بێســـتوونم ئەمشەو
لە نـــــــاو گێژاوی خـەم دەناڵێنم
بۆ ئەشـــکی دیدە مەمنوونم ئەمشەو[123]
دەبــــــرژێم لە نـاو ئازاری گەردوون
لە ناو بەحری خەم کـەتوونم ئەمشەو
دڵم وا بۆتە بار خــــانەی مـەینەت
کەوا خەڵتانی ناو خوونـــم ئەمشـەو
(هەوری) شـێواوە وەك زولفی دولبەر
هەروەك هاوشێوەی مەجنونم ئەمشەو

١٩٩٣/٩/٣٠

[122] - ئەڵوەن – ناوی روبارێکە لە دەڤەری خانەقین
[123] - ئەشك - فرمێسك

## (تەمەن)

تەمەن هەر وەکووخەو بوو
رۆژگارم شین و کەو بوو

پڕ بوو لە ئـــــازارو خەم
هەموو هەر ئاهوو ماتەم

رۆژ و شەو دەنـــــالێنم
بێهوودە کاتە چـــووێنم

گەلێ بۆ کـــــــوردەواری
رۆژو شەو گیانـەهـــاری

زۆرم دی رەنجـــــەڕۆیی
هەموو بە خۆڕا رۆیـــــی

هیچ پاداشــــتم بۆ نەبوو
ماڵیشم گشت تیا چـــوو

لە باسی حـــەق و ناحەق
مێشکم بوو شەق و پەق

ئیتر خەم ناخۆم لـــە کەس
هەر زگم تێر بێ و بـەس

با دونیا گشـــت وێران بێ
یا نیوەی سەرگەردان بێ

یا رۆژی ســـە دان نە فـە ر
هەموو بێتەوە بێ ســـەر

یا خوێن بڕژێ وەکـــوو ئاو
فرمێسکی چاو وەك لافاو

یا خۆ رەشــــەبای مەرگ
لەولاوە بێ وەك گـــورگ

بە ناحەق هەڵمـــــەت بەرێ
ئەو خەڵکە لە ناو بــەرێ

کەس بۆ من نەبـــوو تاوێ
جارێ نەینا هەنگـــــاوێ

ئەم چەن رۆژەم کـــــەماوە
روو بکەمە خـــوا تەواوە

عومرێکی کــــەم و کورتە
تاکەی ئەم جـرت و فرتە

هۆشیار بۆتەوە (هـــەوری)
تەواو گۆڕاوە تـــــەوری

١٩٩٣/١٠/١٩

## شەوێکی تار([١٢٤])

شەوێکی زۆر تارو تەنگ  کز دانیشتبووم بێ دەنگ
باران دەباری بەتاو  کزەبای ساردو لافاو
ساردی تینی هێنا بوو  مناڵ گشت کز داما بوو
منیش بیرمەکردەوە  لەکارو لە کەردەوە
پاشان لە ژینی ئینسان  کەچۆن دێتە سەر جیهان
پێشا ساوایەو منداڵ  دوایی دەکا گرو گاڵ
پێنج شەش ساڵێکی رەتکرد  دێتە مەیدان دەست وبرد
بەردەفڕکێ و لاساری  قەت تێر نابێ لە یاری
پاش چەند ساڵ تر تەواوە  کوڕی زۆر شۆخ و لاوە
یاکیژێکی شۆخ و شەنگ  چالاك و مەرد و قەشەنگ
ئیتر کچ بێ وەیا کوڕ  رادەپەڕێ کوتوپڕ
دێتە ناو کۆڕی ژیان  رۆژو شەو کارو فەرمان
یاکاسیب یا ئەفەندی  لە شار بێ یا لە گوندی
هاوین و زستان و بوهار  قەت لە ئیش نابێ بێزار
خەریك ماڵ و ماڵداری  شەونخوون گیانەهاری
یاجووتیارە یا سەپان  راناوەستێ بێوچان
یا وەستایێ زۆر چاکە  دەست و دڵو داوێن پاکە
یا جامباز یا دوکان دار  ئاڵ وگۆڕی ناو بازاڕ

---

[١٢٤] - ئیوارانێ لە دوای نان خواردن لە ماڵەوە دانیشتبووم بارانێکی توند دەباری لە ناکاوێ کارەباکەش کوژایەوە چرایەکی نابووتمان هەبوو هێنایانە مەیدان و پیان کرد منیش پشتم دابوو بەدیوارەکەوە هەر بیرم دەکردەوە لە ژیانی ئینسان کە چۆن دێتە دونیاوە لە دوای چەن کوێرەوەری چۆن بە جێی دێڵێ و ماڵ ئاوایی دەکاو کۆتایی بەم ژیانە دەهێنێ ئەم هۆنراوەیەم بەو هۆیەوە وتووە لە ١١/١١/١٩٩٢ی.ز.

ـ نووسەر یا رۆشنبیر     خاوەن هەستو هۆشو ژیر
ـ خۆ دەبێ بە مەلا     دەرجەی بەرزە لای خوا
ـ هەر شوێنێ دەرکەوێ     خەڵکی زۆر خۆشی دەوێ
ـ مەرجێ رێی راست بگرێ     هەتا ئەو کاتەی دەمرێ
ـ دەبێ بە فەرمانبەر     زۆر دڵسۆزو تێکۆشەر
خزمەتی وڵات دەکا     بۆ گەلی خەبات دەکا
یا خۆ دەبێ بە وەرزێر     زگێ برسی و دوو زگ تێر
شەوو رۆژ بەبێوچان     تێدەکۆشێ بۆ ژیان
بۆ هەژار دەبێ بە پرد     بەرانبەر بە گەورەو ورد
خۆی بە بچووك دەزانێ     رەنج دەدا تا دەتوانێ
بە برسیەتی و کەم خەوتن     ماندووی ئارەق رشتن
ئەنجا دەچێ بۆ پیری     کەم دەکا هێزو بیری
لە بن ماڵ لە سای دیوار     رادەبوێرێ رۆژگار
چاوی کز دەس بە گۆچان     بێزار دەبێ لە ژیان
بەم جۆرە ژینی دونیا     بەرەو کۆتایی دەڕوا
هەر کاتێ زانیت دەمرێ     یەکدوو هەنگاو عەرد دەگرێ
دەیبەن بەرەو گۆڕستان     جێ دێڵێ ماڵو سامان
ئەوەی بۆ ئەو بمێنێ     هەر ناوە جێ دەمێنێ
(هەوری) تۆش پشت مەبەستە     بەم دونیا پووچ و مەستە

## (بۆ مریەم خان)([١٢٥])

مەریەم خان ئەمڕۆ دەرچـوو لە دونیا
لە کەس و کـــاری کردی مـــاڵ ئاوا

خێرا کەوتە ڕێ بۆ خـــزمەت باری
لە چاو دۆستانی ئەسـرین دەباری

لە جێی سەید ئەحمەد ئەو زاتە مابوو
ئەویش وا چـــــرای ژینی کۆتا بوو

لەو کوانییە هەر ئەو مابوو بەتەنها
وەك دانەی دوڕ کــــەوتە ناودەریا

خودا بۆ خاتر ڕەســـــووڵی سەروەر
لەگوناهی خۆش بێ هەمووسەرانسەر

ئومێدم وایە لە بۆ ئـــــەو شوێنە
تەنها ئەحمەدی کاکە حــــوسێنە

هیوام وەهایە کـــە زوو بێـــــــتەوە
چرای خانـــەقاش بگەشــــــێتەوە

[١٢٥] - بە هۆی کۆچی دوایی مەریەم خانی کچی سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکووك لە ١٩٩٢/١٢/٧ی زاینی وتراوە.

## (جەرگی برژاندم)

جەرگی برژانم نیگای ئەو چاوو زوڵف و پەرچەمـــە
حۆرییە ئەم ئاهووە یا خۆ لە نەســـــــڵی ئادەمــە
وەك پەری روخساری هێندە شۆخ و شەنگ و ناسکە
غەمزەیەکی کافییە دەســــووتێنێ گشت ئەم عالەمە
بەژن و باڵای وەك چنارە یاخۆ سـەروی گوێ رووبار
مووڵکی شامی پێ بدەی هێشــتا کە هەرزان و کەمە
قەوسی ئەبرۆی وەك هیلال .برژانـــگی تیری کارییە
نێرگزی شـــەهلایە چاوی لالە روو خونـــــچە دەمە
چاوی وەك خونچەی سبەینان کاتێ هەڵدێنێ بە ناز
هەر کەسێ بیبینێ جــــــەرگی ئەنجراوە ئەو دەمە
یۆەی یاقووتی ئەوەندە شـــــیرین و عاشـــق کوژە
خاڵی سەر کوڵمی بەراســـتی نەشئەی جامی جەمە
سەد وەکوو نالی و کوردی وەســـفی تۆی بۆ ناکرێ
قوڕ بەسەر (هەوری) کەوا سـەوداسەری دەردوخەمە

کەرکووك – لە١٣/٣/١٩٩٤

## (لە ناکاو هەڵوەری)([١٢٦])

لە ناکاو هەڵوەری خونچەی بوهـــارم
لە داخی رۆژو شـەو زۆر بێ قــەرارم
سەفام زۆر خۆشەویست وەك چاوەکانم
ســــــــــــەفا بوو مایەی شادی ژیانم
سەفا بوو مودەیێ بێ نـازو مـەزڵووم
بەبێ دایك بەبێ خزمەت بوومەعلووم
سەفا بوو پرچەکەی وەك زێڕی زەرد بوو
هەتا وەسفی بکــەی جوان و نەبەرد بوو
سەفا بوو لێوەکانی خونچەی ســوور
هەمودەم زۆر بەخەندەو شادومەسرور
سەفا بوو وەك پەپـوولەی باغ و گـوڵزار
بەناحەق جەرگی برژاند دەســتی زۆردار
هەتا دەمرم خەمی ئەو کوڕپە جوانە
لە یاد ناچێ مەحـــــــاڵە لەم ژیانە
هەموو دەم رۆژو شەو من هەر لـــە زارم
لە هیجری ئەو لە عالــــــەم دەر کنارم

---

[١٢٦] -بە هۆی شەڕی ناوخۆوە لە شاروچکەی چەمچەماڵ لە کۆمەڵگای شۆڕش سەفانەدینی کوڕی شێخ نورەدینی برام نە کەس لەبەردەم ماڵی خۆیان یاری دەکرد لە رۆژی ١٩٩٤/٥/٢ شەهید بوو بە هۆی گوللەیەکی وێڵەوە. منیش ئەم پارچە شیعرە ـ ١٩٩٤/٥/١٩ ی. زانین وتووە.

کرو بێ شەوق و بێ زەوقم هەمیشـــە
حەم و گریان و ناڵەم کرد بە پیشـــــە
زمانی ماتەم و هەر شین و گریـــــــــــان
کەچی سوودی نەبوو ئەی دۆستو یاران
کوڕم بێ خەم بنوو بۆخۆت لـە ژێر خاك
ە دوای تۆئێمە گشت دڵتەنگ‌وخەمناك
هەموو یەك یەك لە خزمەت زاتی ئەكبەر
لەوێ یەكتر دەبینین ڕۆژی مەحشـــــــەر
ەتۆش (هەوری) ئیتر بەسـیەتی زاری
ەمەودوا ڕووكە دەرگـــای زاتی باری

## (باسی رابردوو)

بایەك دوو قســـــەت بۆ بكەم خاڵە
باسی رابردووی ئـەم ژینە تاڵـــــە
یەكەم منداڵم بووم بیٚ هۆش‌و نەفام
وەســتانم نەبوو وەك زەردەواڵـــــە
بە رۆژو بەشـەو ناو جەوری رۆژگـار
ژیانێكی تەنگ سـەد تف لەوحاڵــە
سەردەمی هەر خــەم بەینیٚ ئـاوارە
هەروەكو مەجنون لـەودەشت یاڵــە
شادیم كەم بینی لەم تەمـەنەی خۆم
ئەم ژینە هەروەك خــەون‌و خەیـاڵە
دونیا رۆژ بە ڕۆژ ئــــاڵۆز تر دەبیٚ
هەرساڵیٚ رەتبوو خۆزگەم بەو سـاڵە
لە ترس زمـانی نامــەردو بــەدكــار
(هەوری) وەك بولبـول لە ناڵە ناڵــە

كەركووك

## (دڵ لە عەشقی رووت)[127]

ـڵ لە عەشقی رووت غەوسەکەی بەغدا

مریاکەوە زوو بۆت بووە شـــــەیـدا

بە قوربانت بم رۆژی ســـەد کـــەڕەت

ئەی شێخی نازدار خاوەن بەرەکـــەت

ـە خەودا دیتم تەکیـــــەو مەقامت

ـڕەگای پیرۆز جێگەی کـــــەلامت

بۆیە وا سۆزی نــــاو دەروون و دڵ

هەروەك سەماوەر جۆش دەخـوا بەکوڵ

ـەم خەرابـــــاتە بێ خەوو خواردن

ـەر لە خزمەتدا تـــــا رۆژی مردن

زۆر ئارەزوومـــــە بێمە دیـــدارت

ببمە خزمەتکار دەرگـــــەی مەزارت

بەڵکوو لە ســـایەت ئەی خاوەن مەقام

خودا ببەخشێ گونــــاهو خەتـــام

چونکە من خــــاوەن کۆڵێ گوناهم

لە حزووری خوا مــــــن روو سیاهم

ـهەوری) شـــیوەن کە هەتاکوو ماوی

سەرتاپا قەدەم غـــــەرقی قـــوڕاوی

---

[127] - لە ستایشی شێخ عەبدولقادر گەیلانی لە وڵاتی گەیلان ساڵی ٤٧١ی کۆچی لە دایك بووە پاشان لە بەغدا نیشتەجێ بوومو بوتە رابەری رێبازی قادری لەساڵی ٥٦١ی کۆچی وەفاتی کردووە لە مزگەوتی خۆی نێژراوە- لە ١٩٩٤/٦/٩ وتراوە.

## (وەك بولبولی سەرچڵم)

وەك بولبولی سەر چڵـــــم دەناڵم بۆ رووی گوڵــــــم
لە دووری بە هەمـــوو دەم دەرژێنم داخی دڵـــــــم

جەرگی بڕیوم نیـــــگای شێت بووم بۆ خـاڵی گۆنای
هەموودەم مەستو مەدهۆش کەوتوومە گێـــژی خولیای

لێوی وەك گوڵە باخـــــــە مایەی حەســـرەت و داخە
شۆخ و شەنگ و ناســـکـە زۆر بە شەوق و دەمـــاخە

شەدەو توورمەی سەرشانـــی گەردنی ساف و جـــوانی
منی گیرۆدەی خـەم کـــرد یەك نیگای چاوەکانـــــی

بسك لوول و شـــــــەدەلار وەك پۆڕ دێ بە لەنجـــەولار
روومەتی هـێندە ئاڵـــــــە هەروەك گولاڵـەی کۆســـار

لە تاوی بـوومە مەجنـــوون ئەشکی دیدەم بوو بەخـوون
رۆژگارم هـەر دەردو خـــەم هەردەم بیمارو مـەحـــزوون

چاوەڕێم بەڵـکوو جـــاریێ وەك گولاڵەی بوهــــــاریێ
کـەمیێ خەندە بنــــــوێنی بۆ دەردەم بکـــــا چاریێ

ســاڕێژ بیێ زامی ســـەختم گوشاد بیێ کـــەمیێ بەختـــم
دڵـم خاڵی بیێ لە خـــــەم خۆشی بنوێنیێ وەخـتـــم

(هـــەوری) بگەشـــــێتەوە ناحەزی لێك بێتـــــــەوە
با چـەن رۆژیێ بە شـــادی بۆ خۆی بحەســــێتـــەوە

## (فكرم شێواوه)[١٢٨]

فكـرم شێواوه ژییـــنم زۆر تەنگــــە
ـونیام لەبەر چاو وەك شــــەوەزەنگە

خۆشی و شادی بـــــاری كرد لەلام
بارخانەی خەفەت هاتــــەوه بـۆلام

كاتێ كه زانیم زانای بــــەرزی كورد
مامۆستا مەلا مەجــــید كۆچی كرد

مانگی تەمموز بوو له نەوەت وچوار
تەشریفی رۆیی بۆ لای كردگـــــار

یەك لە عولەمـــای بەرزی عێراق بوو
دوژمنی غەدرو زوڵـــم و نیفاق بـوو

خزمەتی زۆر بوو بۆ دینی ئیســـلام
تەدریسی فەقێ هەم شەرعو ئەحكام

خودا بۆ خاتر نووری پێغەمبـــــەر
لەگەڵ یارانی هەموو سەرانســـــەر

بفەرموو عەفوی له گشـــت سەئیات
رزگاری بكەی له پـــردی ســـیرات

جێگەی بەهەشت بێ بەبێ دەردەسەر
بگاتە ئاوات له رۆژی مەحشــــــەر

[١٢٨] - ئەم پارچە شیعرەم بە هۆی كۆچی دوایی زانای بەناوبانگی كورد خوا لێخۆش بوو مەلا مەجیدی شەقلاوەوە لە ١٩٩٤/٧/٢٧ی.زاینی وتووە.

## (سەیری دڵەکەم)

سەیری دڵەکەم کون کونە سینەم هەدەفی خەم
بارانی خەفەت دەڕژێ بەسەرما بە هەموو دەم
بۆ من نەبوو لەم ژینە ئەبەد لە حزەیێ خۆشنوود[129]
ئەی یاری ئەزیز تۆ وەرە گوێ بگرە لە ناڵـــــەم
ڕۆژم وەکوو شەووایە لەبەر دەردو مـــەرارەت
شێواوە لەبەر تانەی ئەغیار هەموو جەستەم
هەر شوێنێ دەچم لەشکری خەم گرتوویە دەورم
ڕووناکی نییە بۆ منی سەرگەشتە بە ئاســـــتەم
چەن ساڵە لەدووی مەقدەمی ئەو یارە کەوێڵم
پەیدا بێ لە بۆ زامی دەروون و دڵی خەستەم
ڕەنجم هەموو بێسوود چوو برا هەروەکوو فەرهاد
کەڵکی چییە ئەم ئەشکە کەوا دەرژێ لە دیـــدەم
لێشاوی خەفەت پۆشی سەراسەر دڵ و جانم
بۆ بەرگری ئەم لەشکرە پێویستە حەزەرکـەم
بازاڕی شیعر گەرچی نییـــە دەورو ڕەواجـــــی
زۆر خۆشە ئەگەر ئەم غـــەزە لە ئەمڕۆ لەبەرکەم
(هەوری) وەرە ئەمڕۆ کە ئەتۆ هاودەمی خەمبە
بەم چەشنە ژیانت بەرە سەر دوور بە لە عالـەم ١٩٩٤/٨/١٢

---

[129] – خۆشنوود- دڵخۆش
- سەرگەشتە- شێواو
- خەستە- نەخۆش
- دیدە- چاو
- حەزەر- ئاگەدار

## (بەسە ڕێگەی ڕاست بگرە)([١٣٠])

بەسە ڕێگەی ڕاست بگرە هەتاکەی وا چەوت چێڵ
ئەم عومرەت وا تەواو کرد هەموو هەر بە فرو فێڵ
بۆ ئەم ژیانە هیچە ڕۆژی ســـەد درۆ دەکەی
ئەتواری خۆت بگۆڕە چاوئەبڵەقی خواروخێل
دونیا لەجێی خۆی دیارە هەمیشە جێگەی خەمە
پشوویێ بدە بۆ خۆت تاکەی پەراگەندەو وێـــڵ
تەمەنت بە فیرۆ چوو بێ ئاگای لەدونیاو دین
تۆزێ بیرکەوە لەخۆت قوڕ بەسەری گێل‌ووێل
هەر دەمەی جۆرە کاری بێ مەعنا ئەنجام ئەدەی
واز بێنە لەم ئەحواڵە ریسوای ناو هـۆز و خێـــڵ
تـێ بکۆشە بۆ ژیان تۆ هـە میشە ڕوژو شە و
ڕاپەڕە هەروەکو مەرد داوەشـــێنە پاچ و بێڵ
ئەوەندەی عومرت ماوە بە ســەربـەرزی ڕابوێرە
بۆ خۆت بژی بێ منەت هەر بهۆنـــەوە ســمێـڵ

[١٣٠] - ئەم شیعرە بۆ زاتی وتراوە کە زۆر بە کەمی کاسبی دەکرد هەر ڕۆژێ لە ماڵی خزمێ یا ئاسیاوێکی پاڵی دەدایەوە سەرمڕای تەوەزەلی و بەد ئەتواریشی - ١٩٩٤/٩/٢٠

## (ئەی دڵ هەتاکەی)

ئەی دڵ هەتا کەی بێ هۆش و هەستی
تاکەی بەم جۆرە بەگێژی و مەســــتی
بەسەر چوو دەوری گەنجی و منالی
گەر تۆ بەڕاستی خاوەن کــــەمالی
هەتا کــەی کۆشش دەکەی بۆ دونیا
بەرۆژ و بەشەو لــە درۆ و ریـــــــا
هەرگیز ناپرسی لەپیس و گـــــلاو
هەردەم شپرزەی زۆر ماندوو بە تاو
قــەت یادی خودا ناکەی بێ خەبەر
هــەر کاتێ زانیت دەکەوییە خەتەر
با وەك دارابێ موڵك و سامانـــــــت
بە تۆچی هەژار خاك بە دامانـــــــت
تــەوبەیێ راستی بکە قوڕ بەســــــەر
هــەتا لە دونیا نەت کــــردوە گوزەر
دەسا فرسەتە ئەی نەفسی بەدخــوو
ئەو عومرەی ماوە هەستە زووبــەزوو
رووبکە دەرگای حەزرەتی بــــاری
گەر تۆزێ هەتە هەست و هۆشیاری
خودا بۆ خاتر نووری پێغـــەمبـــەر
رزگارمان بکەی لە رۆژی مەحـــشەر
شادبین بە میوەو گوڵزاری بەهەشت
تێرتێربگەڕێین بکەین سەیروگەشت

۱۵/۱۰/۱۹۹٤

## (لەم دەورانەی چوو)

ـەم دەورانەی چوو زۆر ئـــازارم دی
ـزۆر جەورو مەینەت رۆژگـــــارم دی
زۆرم چەشت تاڵی وسوێری لەم ژینە
دەرمانێ نەبوو بۆ ئەم برینــــــــــە
ـزۆر زەحمەتم دی زۆر کوێـــرەوەری
ـزۆر پەنای نامەرد زۆر چەرمەسەری
زۆر قسەی ساردو سڕی نـــا حەزان
وەك پشکۆ جەرگ و دڵــــی دەبرژان
رۆژگار یەك ساتێ شادی نەدا پێــم
چەن بەڵای گەورەی هێنایە سەرڕێم
گاهێ هەژاری گاه بەندیخـــــــانـە
گاه لە غەریبی بێ جێگاولانـــــــــە
گاه لە ژێر چنگ و چـــەپۆکی زاڵم
دەمێکە لە دوای شـادی عـــەودالم
چی بکەم تا ئێستا بۆم پەیدا نەبـوو
ئەمڕۆکەش تەمەن تازە لەدەس چوو
ئێستاکەش دەچم بەرەو لای پیری
زەمانەش لوولم دەکا وەك تیـــری
هەموو دەم خەفـەت دەوری لێم داوە
روو لەلام دەکا لـــــــــە هەموو لاوە
نازانم خوایـــە روو لە کـــوێ بکەم
کەمێ ساڕێژ بێ زامی دەردەکـــەم

بەڵام بێســـــــــــووده دادو فیغانم
ئەم بارە هەردەم وا لـــــەسەر شانم
هەر لە منداڵیم هەتــــاکوو ئەمڕۆ
زۆربەی ژیانم هەر شـــین و ڕۆڕۆ
لە یادمە زســـــــتان پێـلاوی دڕاو
لە سەرما تکە ی ئاو دەهـات لە چـاو
بە ڕۆژو بەشەو لەلای بـەرخ و مەڕ
بێزارم ماندوو جلـــو بـەرگی تەڕ
وزەم لێ دەبڕا دەستم گـــۆی ناکرد
ســـــووچی ببوایە پەنـــام بۆ دەبرد
بەگڕەی هاوین ســــەرو پێ پەتی
ژیانێ هەمووی دەردو مـــەینەتی
دایم ڕەش‌ورووت ناوخەڵەوخەرمـان
یا لەگەڵ پاڵە یا شـــــەغرە کێشان
لە دوای چەن ساڵ تر بۆ کرێکاری
هەدوودەم سەرقاڵ هەرخاکەساری
هەزاران دەردو خـــــەمی گەورەتر
گەلێ لەمانەی باسم کـــــرد زیاتر
ئیتر ئەمەیە جـــــەوری ڕۆژگــار
ڕزگارمان بکەی ئەی پەروەردگــار
ببووژێنەوە ژیــــــــانم کــــەمێ
بەخۆشی بژیم منیش سەردەمـــــێ

۱۹۹٤/۱۲/۲۸

## (هەزار نەفرەت)([١٣١])

هەزار نەفرەت لە چارەت ریش زلی سمێڵ تاشراو
فتیلەی شــــــەڕو فیتنە ئاژاوە گـــێڕو بەدناو
ئێستاکەش کەس نازانێ ئەســڵ و رەگی تۆ کێیە
لەم ناوە چۆن پەیدا بووی وەك دوومەڵان بێ کڵاو
خانەوادەکەت هەمـــــوو جوملە رەوشت ناشرین
تۆ لەوان خوێری تری گــــــەلێ نامەردو ناپیاو
چاکەت قەت نەکردووە غەیری بـــەدی و بەدکاری
شێری لە بۆ قسەی زل لە دەوری گــۆشت و پڵاو
وا پیر بووی وەك رێوی گەڕ بەســــە ئیتر وازبێنە
زۆر کەســــــت فریو داوە بەزمانی لووس و پاراو
رۆژی هەزاران درۆ هەڵدەرژێنی لەم نـــــــــاوە
هەر ساتێ بەشێوەیێ رێك دەخەی هـــــەزاران داو
بە چە روویێ ناو خەڵکـــــی هەمشە دێ و دەچێ
کردەوەت پیس و بۆگـــەن وەك ئاوی گۆم و چاڵاو
ئاخ لە بۆ پیاوێکی مـــــــەرد ریشت لە بندا ببرێ
بت کاتە پەندی رۆژگار نــــــاوت بزڕێنێ تەواو
چیت پێ بڵێم کە تــــۆزێ لایەق بە شانی تۆ بێ
هەموو کەس تۆ دەنــــاسێ کردارت وا لەبەرچاو

---

[١٣١] - ئەم پارچە شیعرە بۆ زاتێ وتراوە کە بە رواڵەت بە پیاوێکی چاکی دەکرد بەڵام باوەڕ پێکراوی دەوڵەت بوو لە یـەکێ لە دەزگا سیخوڕییەکانی زمانی فارسی و کوردی دەکرد بە عەرەبی. ئەمەو سەرەڕای چەند رەوشتی ناشرینی تریشی هـەبوو لە ١٩٩٥/٧/٣ی. ز. وتراوە

# خاڵە وەیس[١٣٢]

خاڵە وەیس و مام عەودل        هاتنە خوار بە خلەخل
هەردووکیان کورت وقەڵەو        ناوشانیان پان و بتەو
سمێڵ فش و ورگ زل        شەرواڵ پان و پشتێن شل
بە گاڵتەو بە نوکتەی قۆر        قسەی پوچی جۆراوجۆر
بێ خەبەر بە رۆژو شەو        تا چاویان دەچێتە خەو
دایم هەر بە پێکەنین        بێ ئاگان لە دونیاو دین
تەنها برسیان نەبێ        ئیتر چی دەبێ ببێ
با دونیا نیوەی تەواو        بخنکێ گشت بە لافاو
یا هەر چی بەشەر هەیە        کە لەسەر ئەم ئەرزەیە
هەمووی بمرێ لە برسا        یا رۆژو شەو لە ترسا
کەس لەحزەیێ نەسرەوێ        یا نانێ دەس نەکەوێ
یا بسووتێ دەشت و چیا        نەمێنێ یەك تەڵێ گیا
وەیا رۆژی سەد هەزار        بگرن و بیدەن لە دار
یاکاول بێ شارودێ        هیچ رووناکی تیا نەبێ
یا خوێن برژێ وەکوو ئاو        سەر زەوی بکا پاراو
لای ئەوان هەر بوهارە        بێ ئاگان لەم رۆژگارە
خۆزگە منیش وەك ئەوان        رۆژم بە خۆشی دەچووان
نەك وەکوو مامە خەمە        خەمخۆری ئەم عالەمە

---

[١٣٢] - ئەم هۆنراوەیە بۆ دوو ناسیاوی خۆم وتراوە لەم شێوەدان بەڵام نەك بەم ناوانەوە ١٩٩٥/٢/١١.

## (عەزیزم چاوەکەم)

عەزیزم چاوەکەم دڵ هـــــەر لەلاتە
هەموو دەم زۆر پەرۆش و موبتەلاتە
هـــەتا ماوە لەســـەر ئەم ئەرزە ژینی
کـــە جاریٚ چاوەڕێی ماچــی خەڵاتە
زەمانێکە لە دووریت هەر دەنـاڵێی
گەلیٚ بێزارە لەم ژین و حـــــەیـاتە
قەدەم فەرموو بپرســـە تۆ لـــە حاڵیٚ
کە خۆی قوربانی تۆزو گەردی پـــاتە
غەریب و دەربەدەر ماوە بەبێ کەس
نەخۆشە کەوتووە بیٚ دەســــتەڵاتە
کە تۆ پاشای سەرجـەم جــوانەکانی
ئەویش پابەندی مـــــوژگانی نیگاتە
میسالی بولبولی شـــەیدایە هەردەم
کەناڵەی دیٚ لە وەخـتی رۆژهەڵاتە
لە دووریت زۆر حەزین و گۆشـــەگیرە
شعووررو عەقڵ و هۆشی گشت لـــەلاتە
بە رۆژو شەو لە ســـــەحراو بیابان
دەگریٚی ئاوی چـــاوی وەك فوراتە
لەرووخساری خەموحەسرەت دەباریٚ
کەخۆشی هیچ نەماوە لـــــــەم وڵاتە
زەمانیٚ وەك شکۆفەی نەوبوهاربوی
نەهاتی تازە دێی وەعدەی مەماتـــە
بەسەر چوو دەوری گەنجی تازە رۆیی
وەکوو خەو وایە لام ئەو دەورو کاتــە
ژیانت شینە(هەوری)تازە دوای ئەو
کە رۆژگارت بەرەو رۆژی نەهـــاتــە

١٩٩٥/٣/١٢

## (زۆرم چەشت)

زۆرم چـــەشت دەردو تاڵاوی دونیا
زۆر ژیـــام لە ناو ئازارو خولیــــــا

ماوەیەکی زۆر بەنـدی و دەربــەدەر
زۆر رۆژم چواند هەمـــوو بە هەدەر

زۆر شەوان سەرم نایەوە بـــە خەم
ژیانم هەموو هــــــەر لەگەڵ ماتـــەم

وەك برای گیانی بە رۆژو بە شــــەو
هەر پێکەوە بووین هەتا کاتی خەو

زۆر جا دانیشتم دەس لە سەر ئەژنۆ
لەم عومرە زۆر جا بوومە رەنجـــەڕۆ

چەنجار کەوتوومە ژێر چەپۆك زاڵم
زۆر جا شکاوە سەرو گوێ و باڵــم

زۆرجا هاتە خوار فرمێسکی حەسرەت
دەروونم بۆتە مەنزلگای حەفـــــــەت

زۆر جا زەمانە بڕی جەرگی مـــــــن
سینەم وەك هەدەف بۆ تیری دوژمن

(هەوری) ژیانت گشت بـە تاڵـــی چوو
هــەردەم گیرۆدەی پەشێوو مانـــــدوو

١٩٩٥/٥/٢٩

## (بژی و نەمر)

ـەمێکە هـەر بژی و نەمر — ژیانێکی کوتـوپچڕ
ـەمر چاوەڕوانی و بیٚ ئەنجام — ئەمڕۆ سبەینیٚ و رۆژیٚ تر
حالّم وەك تەیری بالّشـکاو — ئەگەر تۆ پیٚم دەکـەی باور
ـۆژی سـەد بەلاّ دیٚ بۆ لام — هەر چوار دەورم بۆتە ئاگر
ـامی سینەم زۆر بە جۆشـە — بلّێسەی وەك باوەگوڕگـوڕ
بۆ لای پیری هە نگاودەنیـٚم — بە رەورۆژ گارێکی شـڕتر
هێزو توانـام تیا نەمـاوە — خودایە سا بەسـە ئیتر
ـەحمیٚ بە حالّـی زارم کە — ژیانێکی کەمـیٚ چاتـر
ـەورانی شـادی بێتەوە — لەناو بچیٚ خـەم کوتوپڕ

١٩٩٥/٦/١٧

## (هەتا ماوە)

هەتا ماوە ئەم حەیـــــــاتە    جێی ناهێڵم ئـــــەم وڵاتە
ئەم وڵاتە جێی ئەژدادمـــــــە    هەموو دەمیّ هەر لـە یادمە
لەگەڵ ئەوە مـــــــان و ژیینم    ئەو نەبیّ من زۆر خەمگینم
یەك مسقاڵ خاکی نیشـــتمان    ناگۆڕمەوە بە گشت جیهان
من پەروەردەی ئـــــەم وڵاتەم    ئەم خاکە پڕ لە ئـــــاواتەم
چۆن دڵم دیّ بەجێـــــی بێڵم    بیّ نازو بێکـــــەس بیهێڵم
ئەگەر ئێمە هەموو بڕۆیــــــن    بزان لە پاشان ڕەنــجەڕۆین
بیّ نرخە مرۆڤی بیّ خـــــاك    بەکۆمەڵ بیّ یاخۆ بە تـــاك
دەستە دامانم لاوەکـــــــان    قەت جێی نەهێڵن نیشتمان
دەبیّ پارێزگاری بکـــــەن    لە فێڵی دوژمنی بۆگـــەن
نیشتمان وەك باب و داکـــــە    گەلیّ دڵسۆزترو چاکـــــە
شەرەف و غیرەت و پـــــایە    هەر لە ناو نیشتمان دایـــە
بەرد لە جێگەی خۆی سەنگینە([133])    کە هەڵ کەندرا بیّ تینـــە
(هەوری) تۆ لـــە ڕێگەی وەتەن    پێشکەش بکە گیان وبەدەن

[133] - ئەم نیوە بەیتە پەندێکی کوردییە ١٩٩٥/٦/٢٧

## دەوران شێواندت[١٣٤]

ـوران شێوانت شەوقی رووخســارم      لــە خۆم بێــزارم
هەموو هەر خەمە رۆژو شــەوگـــارم      خەیــلــێ بیمـــارم

خوێن لە چاوم دێ وەك جوگەو روبار      بە درێژی رۆژگــار
هەر دەناڵێنم لە ئێش و ئـــــــازار      وەکو عوود وتــار

گەلێ گرانە باری سەر شــــــــانم      زۆر پەرێشـــــانم
روو لــــــــــە هەڵدێرم رێگە نازانم      ئارامی گیانـــــم

دڵسۆزێ نییە کە بگرێ دەســـــتم      هەتاکو هەســــتم
کەمێ تیمار کا زامانی خەســـــتم      لە تاوی مەستـــم

چی بکەم زەمانە بۆم نەهات جارێ      لە هیچ رۆژگـــارێ
بۆئەم دەردەی من قەت نەبوو چارێ      یاخۆ تیمـــــارێ

بۆ کوێ دەستەبەم راستم بۆ نـــایە      چی بکەم خوایــە
ئازاری دەروون کۆتـــایی نـــــایە      بەبێ شیفایـــــە

---

[١٣٤] - شاعیرانی پێشوو بەم جۆرە هۆنراومیان دەگووت موستەزاد منیش لەسەر ئەو شێوازە بۆ نموونە ئەم پارچە شیعرەم لە ١٩٩٥/٨/٢ی . زانی وتووە.

لە ناو مەینەتی رۆژگار دەکولێــــــم        نازانم من کێــــم
رۆژی هەزاران بەلا دێتە رێـــــــــــم        من بۆکوێ هەڵێم

کەس نییە تۆزێ یارمەتیم بـــــدا        گشت لێم بوجودا
ئەم بارە قورسەم لەسەر لابـــــــدا        کوا دەبێ پەیـــدا

(هەوری) خەم مەخۆ بۆ ئەم دنیایە        کە بێ بەقایـــــە
با زۆرت هەبێ سامان و پایـــــــە        روو لە فەنایـــــە

# (دڵ دەناڵێنێ)

ـ دەناڵێنێ هەروەك ناڵەی نـــــەی
ـمنگم گۆڕاوە وێنەی زەردە بــــەی
ـە دونیا جارێ قەت نەم کرد ئۆخەی
ـەم خەم و دەردە نازانم تاکــــــەی

هەزار داخ لە دەس زەمانەی بەدخــوو
هەر بە ئاهی سەرد تەمەن بەسەر چوو
رۆژێ سەد ئازار بۆ مــــــن دێنێ زوو
هەروەك لافاوە خــــوێنی دڵ خوڕەی

بەشم هەر جەورو خەمو زاری بـــوو
ـرۆژم سەر سەختی شەو بێداری بـوو
جارجار پێکەنین لە ناچاری بــــوو
مەحاڵە چارەم مەگەر زاتی حــــەی

بە شوێن سەد دەردا خەیاڵ دەفڕێ
رۆژی چەن بەلا بەرۆکم دەگـــــرێ
لەتاوان جەرگ‌ودەروون گڕ دەگرێ
شەکراو لام تاڵە وەك پیاڵەی مـــەی

گەردوون شێواندی تان و پۆی ژینم
کزو پەك کەوتە بێ تواناو تینـــــم
فەلەك بێزارە لە سەدای شینــــــم
زەمانە بۆ من قەت نەبوو بــــــزەی

کەوتمە بەر شەپۆل چۆمی گارفێـــن([١٣٥])
برینی جەرگم پڕ زووخاوو خوێـــــن
لە ناو خاکی خۆم بەبێ جێگەو شوێن
بێگاری دوژمن هەم گاڵە و مـــــڕەی

خەزانی پیری زوو لێم پەیا بـــــوو
ژینم هەر هەمووی دەردو جەفـا بوو
بەستەی خەفەتم لا ئاشـــــــنا بوو
شادیم قەت نەدی نەخۆی نە نەوەی

باخچـــەی ژیـــانم گەڵای زەرد بووە
بەختـم ئاوارەی چـــۆڵو هـەرد بووە
جەرگم کوون کوونی زام و دەرد بـووە
جەســتەم وەك مردوو بـــڕاوە وزەی

(هەوری) لە تاو دەرد بێزارە شەوان
ناڵەی دەروونی وەك بلوێـری شوان
ئاشنایە لەگەڵ ئەستێرەی بــــەیان
بێزار لەم ژینە هــــــەزار دادو وەی

---

[١٣٥] - چۆمی گا رفێن- بە رووباری دەوترێ ئاوەکەی زۆر خوڕو توند لەسەردا بێتە خوارەوە. لە رۆژی ١١/٩/١٩٩٥

## (من کوردێکی)

ـن کوردێکی ئاشتی خوازم — رێی کوردایەتی رێبازم
ـحس لە خەبات هەڵناگرم — هەتا دەگەم بە مرازم
ـەم رۆژگارە تا بمنێم — بۆ ئەم خاکە من سەربازم
کوردستانە پێناسەی من — هەموو ئاوات و نیازم
قوڵ و باڵی لێ هەڵدەکەم — دژی دوژمن هەڵۆو بازم
خۆم لەو رێگایە بەختەکەم — ئەوجا ئەمن سەرفرازم
ـاتوانێ زورنای بێگانە — تێکی دا بەستەو ئاوازم
ـە پێناو کوردی چەوساوە — هەموودەم من بەردە بازم
ـینەم قەڵغانی پۆڵایە — گەرچی بە جەستە لاوازم
بەشداری خۆشی و ناخۆشیم — رێبوارێکی رێی هەورازم
بۆ پارێزگاری ئەم خاکە — بێگومان هەر وەك ئەیازم

## (دڵم خەمبارە)

دڵم خـەمبارە٠ دونیـــــــام لا تارە
لـــە خۆم بێزارم٠ لـــەم رۆژگارە
شادیم نەماوە٠ دڵ پڕ زووخـاوە
پەست و خەمگینم ٠جەرگم بڕاوە
رۆژم لا شـــەوە٠ شـــەوم بێ خەوە
حـــاڵم پەشێوە ٠ناڵـــەم وەك كەوە
دەردی هەژاری٠ هـەم خێزانـداری
بە درێژی ساڵ٠ رۆژو شـــەوگاری
ئای لەم زەمـــانە٠ دەردی گـــرانە
دڵ بێقـــــەرارە٠ زۆر پەرێشـــــانە
هەرچیت كەدەوێ٠ هیچ دەس ناكەوێ
ژیانی ئاڵۆز٠ قـــەت رێ ناكەوێ
مەینەتە مـــــــانم٠ زەهـــرە ژیانم
چەرخی رۆژگار٠ جەرگی ســـووتانم
هەر خەم دەبارێ٠ لە گشت كنارێ
شادی نابینێ٠ لـــە هیچ دیارێ
وەك گوڵی بێ ئاو٠ سیس و پەشۆكاو
هەمیشە زەبوون٠ هەم فرمێسكی چاو
بێ جـێو ئاوارە٠ كـەم زاد و پارە
لێشاوی خـەفەت٠ سوبح و ئێوارە([١٣٦])

---

[١٣٦] - سوبح- بەیانیان

ـرو بێ هەوەس ٭ وەك تەیری قەفەس

ـماوو مەلوول ٭ هەر گـــریان و بەس

ئیتر بەم جۆرە ٭ مەینەتمـــان زۆرە

ترس و برسیەتی ٭ هەردوو بەنۆرە

ـاورێی چاکـــــە ٭ گـــەلێ بێ باکە

ـەردەم حـــــازرە ٭ بێ وێنـــەو تاکە

خودا بۆ خاتر ٭ حــــەزرەتی خدر[١٣٧]

کەمێ ژیانم ٭ بســـــووڕێ چاتر

هەوری) بێزارە ٭ لـــــەم ڕۆژگـــارە

هەر دەنـــــاڵێنێ ٭ چاری ناچـــارە

---

[١٣٧] - خدر- خضر یەکێکە لەو پیاو چاکانەی هاوچەرخی موسا پێغەمبەر بووە دەڵێن ناوی ( حەیات )ی خواردووە هەتا هەتایە نامرێ، پێدەڵێن خدری زیندە.

## (لە جەوری رۆژگار)

لە جەوری رۆژگـــــار بێزارم ئەمڕۆ
مەگەر روو بکەم من لە دەشت و کۆ
رووناکی لـە دڵ بەدی ناکـــرێ
ئاگری جەرگم هەر وەکوو پشکۆ
دەروونم سووتا زووخی لێ دەتکێ
فرمێسکی چاوم هەروەك تانجـەڕۆ([١٣٨])
وەها گۆڕاوە دەوران و رۆژگـــــار
کوندە بوو چۆتە مەنزڵگای هەڵـۆ([١٣٩])
هەرچی دەبینی زۆر تەنـگەوە تاوە
ریاو تەمەلووق فیشـــــــاڵ و درۆ([١٤٠])
پڕ بەپێ راکەم بۆ ناو خـــاکی تر
هیچ چارم نییە چی بکەم بـابەڕۆ
ژیان زۆر تاڵـــــە لە ناو ئەم قەومە
رۆژو شەو خەریـك ئاژاوەی ناوخۆ
کۆمەڵێ ئێمە چۆن رزگـــار دەبێ
دوژمن یەکتری وەك کەو خۆبەخۆ
راستی لە ناومـــان زۆر بێ رەوایە
بازاڕی کزە وەك هـــەرزن و جـــۆ

---

[١٣٨] - تانجەڕۆ- روبارێکە لە ناوچەی سلێمانی

[١٣٩] - کوندە بوو پەلەوەرێکی بێ دەسەڵاتە بەڵام هەڵۆ پەلەوەرێکی زیرەك و گۆشت خۆرە

[١٤٠] - ئەم پارچە شیعرەم لە بەرواری ١٩٩٥/١١/٩ ی.زایینی وتراوە

## (گریانم دێ)

ئازیز گریانم دێ بۆ قەبـــــری تەنگ
ڕووی دونیا لای من بۆتە شەوەزەنگ
هەموو وەختێ هەر زارو خـــەمبارم
چونکە لەدەرگای خـــوا شەرمەزارم
نازانم ئاخــــۆ قەیـــــدو دەفتەرم
چی تیایە خاکی دونیا بەســـــەرم
ئەهلی دۆزەخـــم وەیا خۆ بە هەشت
بۆیە بەمجۆرە دەکەم حەوت وهەشت
دەزانم خاوەن کـــۆڵێ گونـــاهـــم
لەمەحشەر کێ بێ پشت وپەنـــاهم
حەقمە لەو ڕۆژە گەلێ بترســـــــم
هەواڵی وەزعی خـــۆم چۆن بپرســـم
ئەو کەســـــەی کەوا ژیرو زانـــایە
دڵی شاد نابـــێ قەت بەم دونیایە
هەمیشە خەریك شـــین و چەمـــەرە
چونکە ڕێگایێ سەخـــتی لەبـــەرە
(هەوری) واز بێنەم لە شین و زاری
پەنا بە دەرگای حەزرەتی بـــاری

١٩٩٥/١١/٢١

## (ئەزیزان روو سیاهم من)

ئەزیزان روو ســـــیاهم من
لە حەد دەرچوو گوناهم من
کەبیّ پشت و پەناهم مـــن
دەخالەت یا رەســـول الله

بە دایم خاکە ســـــارم من
خەریکی ئاهـــــو زارم من
هەمیشــــــە ئینتیزارم من
دەخالەت یا رەســـول الله

هەموو بێســـوودە رەفتارم
بەدە کـــــــردارو ئەتوارم
لەناو زوومرەی گوناهکـارم
دەخالەت یا رەســـول الله

بە رۆژو شـەو لە گــــریانم
سووتاوە جەرگی بوریـــانم
بە دایم رووت و عوریـــانم
دەخالەت یا رەســـول الله

لە ترس هەنـگامەی مەرگــە
کەوا سووتاوە ئەم جەرگــە
ئەوا هاتوومـە بەر دەرگـــە
دەخالەت یا رەســـول الله

گەلیّ مەحـزوون و بیمــارم
خەریکی شـــــیوەن و زارم
تیمارکـە دەردو ئــــازارم
دەخالەت یا رەســـول الله

ئەتۆ (هــەوری) چ بیّ بـاکی
کە نەسیلی شاهی لـەولاکی
ئەوا هاتـم بە دڵ پاکـــــی
دەخالەت یا رەســـول الله

١٩٩٥/١٢/٣٠

## (ئەی دڵ تۆ وەرە) [١٤١]

ئەی دڵ تـــــۆ وەرە خێرا پەلـەکە
هەســـــتە با بچین بۆ شاری مەکە
لەوێوە ئەنجا بەرەو مـــــەدینە
کانگای زانیـاری و رەوشت و دینە
سەرانســـــەر خاك و دار و دیواری
زۆرجوانە هەروەك دانــەی مرواری
جێگایێ گەلێ خۆش و نــاوادارە
لەهەموو جیهان روون و دیــــارە
بچین بۆ دیـــدار ئەو ماهجـــەبینە
لەو مەڵبەندە زۆر خــۆش و شرینە
هەردەم لەخزمەت ئەو شاه سوارە
ئەومەردە مەزنە ئەو بزوورگ وارە[١٤٢]
لــــــەوێ بمێنین تا رۆژی مــردن
بە رۆژو بە شەو لە خزمەت کــردن
بەڵکوو لە سایەی ئەو زاتـە مەردە
سارێژ بێ هەموو زامـــانی بەندە
تاکوو لەرۆژی مەحشــەرو حیساب
(هەوری) رزگاری ببێ لــــە عەزاب

---

[١٤١] - لە ستایشی پێغەمبەری مەزن (د.خ) لەسەر بێ لە ١٩٩٦/١/١٩ وتراوە

[١٤٢] - بزوورگ – گەورە

## (قاپی ڕەحمەت) ([143])

قاپی ڕەحمەت وا کراوە ســـــەد شــوکر بۆ زاتی خوا
لەشکری جەورو خەفەت مل خۆی شکـــــان لێرە نەما
دونیا چەن وشك‌و گرانی بوو هەموودەم پڕ خەفەت
خەم دەبارێ ڕۆژو شەو شادی لەهیچ شوێنێ نەمــا
هەرکەسێ سەیرت دەکرد روخساری خەمگین‌وپەشێو
ڕەونەقی دونیا نەما بوو دارو بەرد ئاب و هـــــــەوا
وای لێهات خەڵکی بە جارێ کەوتە گێژاوی خەتــەر
ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر گرانی زیاد دەبوو دەردو بـــــــەڵا
دەك خەجاڵەت بێ موســـــەبیب و خودا جەرگی بڕێ
چونکە ئەم خەڵکەی دەبرد دایم بەرەو چـــــاڵی فەنــا
ڕۆژی شادی وا هەڵات لای برد خەم‌ودەردو خەفەت
هەوری ڕەش لاچو روناکبوو دەشت‌و دەرشاخ‌وچیا
ڕۆژێکی خۆش‌و بەزەوقە خەم لەلای هیچ کـەس نییە
هەر بمێنێ بەر قەراربێ شــادی و خۆشی و ســـــــەفا
دڵ لە خەندەو پێکەنینە ڕۆژو شەو هەر خۆشـــییە
ئەی برادەر بۆ جەزای ئەم ڕۆژە باروو بکەینە خـــوا

(هەوری) چەن ســاڵە دەرونت بۆتە کۆگای دەردوخەم
خۆ کوفر نابێ ئەگەر چەن ڕۆژ بژی تــــــۆ بێ جــــەفا

---

[143] - بە هوی دابە زینی با زار و پە یدابو و نی هە رزانی لە ١٩٩٦/١/٢٥ وتراوە

## (ڕوو له خۆشییه)([144])

ڕوو له خۆشییه ئەمـــــڕۆ کە ڕۆژگار
ـێ ڕزگاری بوو له جـــــەورو ئـــازار
دەرگاهـی خۆش و شادی کـراوه
عالەم مەسروورە تاڵی نەمـــــاوه
ڕۆژی ئازادی وا لە نـــویّ هـــــــەڵات
خۆشی کەوتەناو سەرانســـــەر وڵات
هەمووکەس ئەمڕۆ دڵی گوشادە
دوور لە مەینەتولە خـەم ئازادە
هەمووی پێچاوە غـــوباری ماتـــــــەم
لای کەس نەماوە یـــەك تۆزقاڵیّ خەم
لـــەرووی نابینی گەردی بێزاری
باری کرد جەورودەردی هەژاری
ماوەییەکی زۆر خەڵکی دڵ تەنگ بوو
ڕۆژی ڕووناکی وەك شەوەزەنگ بـــوو
قەت لە یاد ناچـــی ئەو گرانییە
ئەو قاتوقڕیو مـــــاڵ وێرانییە

[144] - بەهۆی نیزیك بوونەوەی دابەشکردنی خواردەمەنی و داودەرمانەوە بە تەواوی بازاڕ شکاو هەرزانی کەوتە ناو خەڵکەوە هەموو شتێ نرخی دابەزی و میللەت کەمێ لە برسیەتی ڕزگاری بوو و کوێرەوەری و هەژاری بەسەر چوو و خەڵك تۆزێ بووژایەوەو شادی و خۆشی کەوتە دڵی هەموو کەسێکەوە و هیوای بە پاشەڕۆژێکی ڕووناك پەیدا کرد. ١٩٩٦/٢/١٢ ی.زاینی، بەرامبەر بە ٢٢ی ڕەمەزانی ١٤١٦ی کۆچی.

ژیانیٚ ناخۆشـــی زۆر بە زەبوونی
دەینالاًند لە ژێر بـــاری نەبوونـی
ڕووناکی نەبوو ئاسـۆ تاریك بوو
ڕێگەی ژیان سەختو باریك بوو
(هەوری) تۆش ئیتر شوکری خوداکە
غەیری ئەو دەرگای تر نییە کـــاکە

## (لە ستایشی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی)

شێخی من عەبـــــدولقادرە
لەم سەر زەمینـــــە نادرە
خاوەنی فەیزو ئەســــرارە
دەریای زانست و ئەنــوارە
بارەگای وا لـــــە بەغدایە
دڵم بۆی شێت و شـەیدایە
زۆر نەخۆش و حاڵ پەشـێوم
هەردەم وشــــکەزارو لێوم
دەخیلە هاتوومە دەرگـــــات
چاوەڕێم بۆ لوتف و خەلاًت
بەندەییٚ خەستەو بار گـــران
ئالوودەی ناو شین و گریان
ڕجام بۆ بکـــــە لای خوا
بۆ دەردم پەیـــدا بیٚ دەوا
گوناهی مــــــن گەلیٚ زۆرە
بۆیە لە زاریم بەم جـــۆرە
(هەوری) هەر دەروێشی خۆتە
دەستو لاقی لە نێو کۆتــە

١٩٩٦/٣/١

## (ئەم مامرو کەڵەشێرە)([188])

ئەم مامرو کەڵەشـــــــێرە　　کووجی پێی دەڵێن لێرە
هۆگر بوونە لەگەڵمـــــان　　هەردەم لە دەورووبەرمان
مامر ڕەش و پێ کوڵکـــن　　دەگەڕێن خرپن خرپـــن
زۆر هێمن و لەسەرخـــۆ　　دێن و دەچن دەســتەمۆ
هێلکەی بچووك وەك گوێزە　　زۆر بەتام و بــــە هێزە
یەك هێلکەی بـــە دووانە　　هێشـــتا دەڵێن هـەرزانە
کەڵەشێرەکەش شــــێرە　　لە شـــــەڕا ئازاو نێرە
ڕەنگی تێکەڵ ڕەش و زەرد　　لابەری ئـــــازارو دەرد
پۆپنەی ســـوور و جوانە　　مل درێژ کلکی پـــانە
کاتێ کـــــە دەقوولێینێ　　مزگێنی شـــادی دێنێ
بە جووتە دێن و دەچـــن　　ڕاکێشن سـەرنجی مـــن

[188] - کووجی جۆرە مریشکیکە زۆر بچووك و پێ کولکن و دەستەمۆو نەرم و نۆڵ و ناسکن بەزۆری بۆ جوانی بەخێو دەکری ئەم جۆرە مریشکە دەڵێن تۆومکەی لە ولاتی چینەوە هاتووە – ۱۹۹۸/٦/۲۹

## (نامەیی شیعری )([189])

برای خۆشەویست کاك سالار     هەر شادبی وەك لالەی بوهار
هیچ خەمیٚ نەیێتە رێگات     دووربی لە بەلاّی رۆژگار
دوعاو سەلامم بۆ باوکت     لەگەلْ رێزێکی بیٚ شوومار
هەم بۆ براو خزم و دۆستان     ئەوەی دەکا لێمان پرسیار
گەرچی بەینێکە نەمدیوی     تەفرەی دواین چەرخی بەدکار
زۆر وەسفت دەکا ئەردەلان     دەلْییٚ زۆر مەردە و هۆشیار
بیستووم ئارەزووی شیعرەکەی     ئەم چەن دێرەم بۆ یادگار
بۆت دەنێرم بیخوێنەوە     تا یادمان بکەی جاروبار
ئیتر نامەو رێزی (هەوری)     پێشکەشە بۆ کاکە سالار

---

[189] - ئەم نامە شیعرییەم بۆ کاك سالاری مەلا عوسمان کە نیشتەجێی شارۆچکەی پردێیە لە ۱۹۹۸/۷/۲۲ی زاینی وتووە.

## (نامەیی شیعری)([١٩٠])

بۆ برای خۆشەویستی دوور   سلاوێکی بەبێ سنوور
لەگەڵ سروەی بای شەماڵە   پڕ لە عەترو بۆی گوڵاڵە
پێشکەشە بە تۆ کاك عومەر   برای دڵسۆزو بە جەوهەر
لە دووریت دڵ پڕ لە خوێنم   هەر وەك بولبول دەناڵێنم
پرسیاری ژیانت دەکەم   بە هیوام شادبی هەموودەم
کاکە نامەی جوانت گەیشت   زوو وەرمگرت وگرتمە مشت
خێرا خوێندمەوە یەك دووجار   تەواو گەشایەوە روخسار
ئەگەر پرسیاردەکەی کاکە   ئێمە ژیانمان زۆر چاکە
ساغو سەلامەتین هەموو   دەروون پڕ شەوق و ئارەزوو
لەگەڵ دۆست و خزم و یارە   هەموو کاتێ وەك بوهارە
لە سایەی حەمدی خوداوە   رووومان وەك خونچە گەشاوە
ئیتر بە هیوام کاکە گیان   نە ترەجێنێ جەوری زەمان
لە خوای گەورە داوا دەکەم   کە دوور بی لە ئازارو خەم
(هەوری) ئەگەر چی لێت دوورە   بەلام بەدڵ لە حزوورە

[١٩٠] - ئەم نامەیەم بۆ هاوڕێی خۆشەویستم کاك عومەر کاکەخانە لە دەرەوەی وڵات لە وەڵامی نامەیەکیدا لە ١٩٩٨/٨/١١ نووسیوە.

## (ئەم ژیانە ئاڵۆزاوە)([١٩١])

ئەم ژیانە ئاڵـــــــــــــۆزاوە ‌ ‌ ‌ دەردو خەم لە هــەزار لاوە
سەرانسەر تاڵیی ومەینەتـــــە ‌ ‌ ‌ شادی هەرگیز تیانە ماوە
لە هــــەر کەسی تۆ دەپرسی ‌ ‌ ‌ هەزار بەڵای لێی ئـــاڵاوە
ئەم خەڵکە رووت و هـــــەژارە ‌ ‌ ‌ هەموو گیرۆدەو دامـــاوە
دەناڵێنێ بە رۆژو شـــــــەو ‌ ‌ ‌ وەك مەلێکی باڵ شــکاوە
هەر چیت دەوێ دەسأناکەوێ ‌ ‌ ‌ نرخی بە دەقات هەستاوە
لەم دەوران و رۆژگـــــــــارە ‌ ‌ ‌ هەژار تەواوی فەوتـــاوە
لە بەیانێ وە دێ و دەچـــــــم ‌ ‌ ‌ بەم گەرمەو لەم خۆرەتاوە
ئەوەندە پەشێوو مانــــــدووم ‌ ‌ ‌ وزە و هێزم لێ بــــــڕاوە
دەورانی پرخـــــــەم و تەنگە ‌ ‌ ‌ هیوام لـــــەم ژینە نەماوە
(هەوری) جەوری ئەم رۆژگارە ‌ ‌ ‌ هەروەك مار لە پێت ئالاوە

[١٩١] - نفووسی ناحیەی شوان هەموو رەوانەی مووسڵ کرابوو منیش هەندێ نیشم هەبوو لەوێ. زۆر نازاریان دام بەو هۆیەوە ئەم شیعرەم لە مووسڵ لە ١٩٩٨/٩/٩ وتووە.

## (نامەیێکی شیعری)[١٩٢]

بەناوی کەسـێك خـاوەن جیهانە
هەم بەخشەندەیەو هـەم میهرەبانە

گەیشتە دەستم قوربـان نامەکەت
نامە جوانەکەی پڕ بەرامـەکەت

کاتێ کردمـەوە پێ گەشـامەوە
گەرچی ماندوو بوم پێی حەسامەوە

جا بۆ نامەکەت سـوپاس گوزارم
تا لە ژینا بم هەر خزمـەتکـارم

مامە شێخ (هەوری) وا نامەم نووسی
هەر هەموو باشین گەر تۆ دەپرسـی

لە کۆتاییدا سـلاو بێ پایان
بۆ خزمو دۆستو بۆ کاك ئەردەلان

هەر بەسەربەرزیو بەشـادی بژین
نزام وەرگـرێ خـودایە ئامین

مێژووی نامـەکەم پانزەی نۆڤەمبەر
لە رۆژی یەك شەم مانگی خەزەڵوەر

خزمەتکارێکم بۆ تۆ و نیشـتمان
لێرە ناسراوم بە سالار عوسـمان

---

[١٩٢] - ئەم نامە شیعرییە هی کاك سالار مەلا عوسمانە لە شارۆچکەی پردێوە گەیشت بە دەستم پێشەکی زۆر سوپاسی دەکەم ١٩٩٨/١١/١٥.

## (نامەیەکی شیعری)[١٩٣]

کاکە شێخ عوبێد ئەو نامەی ئەتـۆ
کەوا نووسیبووت بۆ منی رەنجەڕۆ
قەسەم بە خودا بۆنێکم بۆ هـــــات
خۆشتر لە نێرگز گەییم بە ئـــــاوات
پـڕ بوو لە نـووری زاتی رەبـانـــی
لــەجێی (لوتفی) تۆی دەبیٚ بــزانی
لە شەو هیمەتت گەیشــت بە گیانم
رۆژ بەرەکەتت رووحـــی رەوانـــم
ئەمانەی بۆ تۆ باسی کـــەم بە خـــوا
هەموو راستورێك هاتووە بەســەرما
سەلامم هەیە بۆ کـــــاك ئەردەلان
خوا سەرکەوتووی کا لەژین و ژیان
کاك مەلا هیواش خـوا دووری بکات
لەهاوڕێی نەزان لەگشت وەختوکات
وا کۆتایی هات هەڵبەســــــتەکانم
لەدووری ئێوە دڵ پــــــڕ گریانــم
(سابیر) بە راستی ئێوەی خۆشــەویٚ
لە یادتان ناکات بە رۆژ و شــــــەویٚ

---

١٩٣ - ئەم نامە شیعرییەم لەلایەن مەلا سابیر لە بەغداوە گەیشت بە دەستم ١٩٩٨/١٢/٢٧ی.زایینی.

## (وەڵامی نامەی مەلا سابیر)[١٩٤]

ئازیز نامەکەت گەیشــت بە دەســـتم
هاتەوە سەرخـۆ ئارام و هـــەســـتـم

خەیاڵ فڕیبــوو لــەلام نەمـــا بوو
نا هاتەوە لام لێــم تـــەوەللا بـــوو

هەواڵی تۆی بیســــــت خێرا گەڕاوە
دەرگاهی خۆشــــــی زوو لێ کـراوە

دڵ گەشایەوە وەك خونچەی بوهار
خۆی لێ شاردەوە مەینەتی رۆژگار

وامزانی دونیـــــا تـــەواو هی منە
ســـــارێژبوو زامی ئەم جەرگە کونە

زۆر رێزم هەیە هەم دوعـــاو سەلام
پرسیاری حاڵت دەکەم بـــەردەوام

بەهیوام دائیم هەر شــــــادومان بی
بە گەشی وەکـــــوو لالەی بەیان بـی

هەمیشە شـــادبی تۆ لەم ژیـــانە
خوا رزگارت کا هـــەر بەم زووانـە

کاکە گیان هەردەم زیکری یا لە تیف
بەدڵ و زووبان توونـد بگـرە زەریــف

[١٩٤] - لە وەڵامی نامەیەکی مەلا سابیردا کە حوکم درا بوو لەسەر مەسەلەی سەربازی لە گرتووخانەی (ئەبو غریب) لە بەغدا. ١٩٩٩/١/١٥ ریکەوتی ٢٨/ رەمەزانی ١٤١٩ی کۆچی.

رزگارت دەبێ بە عەونـــــی خـــودا
هەرخۆی دەلیلت بۆ دەکـــــا پەیدا
برای خۆشەویست گەرپرسیاردەکەی
زۆر چاکین سوپاس بۆ خالقی حـــەی
چاکی ئێوەشم هەمیشـــــــە دەوێ
داوامە رەحمی خواتان بـــەرکەوێ
برا هەر وایە رەفتــــــاری گەردوون
یەکێ بە شادی یەکـێکیش زەبوون
هەر کەسەو دەستی وا لە بن بەردێ
لەلای خۆیەتی دەوای گشت دەردێ
(هەوری)ش هەموودەم کزوخەمگینە
لە دووری یاران بەشی هەر شـینــە

## (نامەیەکی شیعری) ([١٩٥])

برای بەرێزم شـــێخ عوبێـــدالله
لە کەسایەتیت سەد بارەکـــەالله

سەد هەزار سلاو لە پـــــأیـــەداریت
لە یادم ناچێ قەت وەفــــــــاداریـت

گەیشتە دەستــم نامەی رەنگینت
دڵی شادکردم قســەی سەنگینت

یا خوا هەرخۆش بێ دەست وخامەکەت
هەستی ناســــــك و خۆش کەلامەت

بەراسـتی دەڵێم ئـــەو بـــیرو رایە
هەروەك بیروڕای مەولـــەوی واـــیە

تۆ لە مەیدانی شیعرو ســـەلیقـــــەت
(لوتفی) دووەمی زۆر بە حەقیـــــقەت

من حەددم نییــــــە وەك تۆ بتوانـم
ئاوها لە کانگای شــیعر بڕوانــــــم

بەلام بێکەســـــــــی دەردی گـــرانە
لەوەش خراپتر جەفــــــــای زیندانە

ئەم دووانە برا روو بکەنە هــەر کەس
ئەگەر کێویش بێ دەیکەن بەقەقنەس

---

[١٩٥] - ئەم نامە شیعرییەم لەلایەن کاك شەمسەدین شێخ نجم الدین بەرزنجی پێ گەیشت، کە لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی حوکمی هەتا هەتایی درا بوو بەسەریا و لە بەندیخانەی (ئەبوو غریب) بوو تێدا باسی چۆنیەتی ژیـان و دەردو ئـازاری خۆی کردووە لە ١٩٩٩/١/٢٠ی. زاینی بە دەستم گەیشت.

تووشی من بوونه بـــه حـــاڵی حازر
دەروون دەســـــووتێ وەك كورەی ئاگر
ئەوا سێ ســـــــاڵە خەڵوەت نشینم
تا ئیستا كەسێ نـــــــەپرسی ژینم
چی كەسم هەبوو لێم بوو تـــــــەوەللا
وەك دێوانەكـــــــەی دەشـــتی كەربەلا
پشتم چەماوە وەك كـــەممەی گۆچان
بوومە سۆفیەكەی بەرماڵ لەسەرشان
دوو شانم شل بـــوو لە ژێر باری خەم
بوهاری عومـــــرم هەر شـــین و ماتەم
ئاهو داخ لـــــە دەس پـــەژارە و ژان
بوون بەخۆراكم لە جێی ئـــــاوونان
ئەنجا بابەس بێ بـــــــرای نــازدارم
هەر خۆم دەزانم چـــــــەن دەردەدارم
حاشا لەگشت كەس مەلێ چ عەجەب
نەشیری حوشتر و نە دیـــدار عەرەب
لە كۆتاییدا دووعـــــاو ســـــــــەلاوم
بۆ ئەو كە سانەی دەهێـــــــنن ناوم
ئەگەر دەپرسی چـــــۆن دەژییم لێرە
تەنها پێویستم بە دوعـــای خێـــرە

## (چەن ساڵە)

چەن ســاڵە ئێــــمە وا خەو ئەبینین
کەی بێو ڕزگاربیـــــن دەورێ ببینین
دوای چەن ساڵ عەزاب شەق و تێهەڵدان
لەویش خراپتر کوشـــــــتن و زیندان
دێهات روخاندن مـــاڵ و ێران کردن
ناو دەریای زوڵم هەتـــــاکوو گەردن
زۆر جەوری بینی کـــــوردی خۆ ڕاگر
با نەی کردووە بـــــــە دەواری شــــڕ
باواز بهێنین لـــــەم بەرنـــــــامەیە
کۆتایی نایێ وەك شـــــانـــــامەیە
ئەمڕۆ کە گــــــوایە کورد ڕزگار بووە
لە جیهان ناوی تـــــــــەواو دەرچووە
چەن دەوڵەت هەیە دەگرن ژێر بـــاڵی
تا کەمێ خۆش بێ حاڵو ئەحواڵـــی
پێویســـتە هەموو بە هــــــــەڵبژاردن
یەکێ دا بنەن وەك مـەردێ مـــــــــەزن
باش رێکەوتووە بۆ کـــــورد فرسەتە
رۆژی خەبات و هەوڵ و هــــیمەتــە
لە ڕق و کینــــەی کۆن وازبهێنـــــــن
وەك تیغی دەبان جەوهەر بنوێنـــــــن

ئەنجا ڕاپەڕین هەمـــــــوو بەیەك دڵ
تادوژمنی کورد دەخنـــــــە ژێر گڵ
کەچی وا تـــــازە بوونە بە دوو بـــەش
بەرەو مەرگ دەبەن کوردی چـــارەڕەش
بێجگە لە چەن جۆر تاخمو دەســـتە
هەر یەکەو کاری خۆی لا مەبـــەستە
هەر کەسەو بۆ خۆی دەگــــەڕی لە هەل
هیچ ناڕوانێتە پاشـــــــــە ڕۆژی گەل
پێی دەڵێن سیاسەت گوایە ئەم بەزمە
بۆیە ئەم گەلــــە تیا چوو بەم نەزمە
من دەڵێم سیاســــــەت یانی درۆی زل
ماڵی میللـــــــەتی پێ دەبێ کـــاول
ئەگینا زەهر کوا شــــــیفای تیایە
مار بە خێوکردن کوانـــی ڕەوایـــــە
دووژمنی گیانی بکـــــــەی بە یاوە ر
لە تەکیا ڕۆژو شـــــــەو بەرێتە سەر
هـــەر کاتێ زانیـت پێتــــــەوە دەدا
ئـــــاگر لەدڵو جەرگـت بــــــەردەدا
ئەنجا بیســــــــــوودە قســەو گرفتارت
یەك پوولی ناکـــا گریـــــــان و زارت
(هـــەوری) واز بێنە چیت لـەم قسانە
دوایـی پێت دەگرن بەزم و مە هـــانە

## (یادی نەورۆز)([١٩٦])

ئەمڕۆ کە یادی جەژنی نـــەورۆزە
بۆ کورد ڕۆژێکی بەرزو پیـــرۆزە
ئەم ساڵیش وەکوو ساڵانی پێشـــوو
گیرۆدەین لە دەس ئەم گورگە بـــۆزە
ئەشـــکەنجەو ئازار هەر بەردەوامە
ناڵەی دەروونـمان گەلێ بە سۆزە
گەلێ لە جـــــاران پەریشان ترین
خۆشی نەماوە لــــــە ناو ئەم هۆزە
هەرچاوەڕوانـــی دەورانی شادین
روو بکاتە ناو ئـــەم گەلە دڵسۆزە
گەرچی ڕووناکە ئەمڕۆ ئاسۆی کورد
بەڵام لای ئێمە هێشـــتا ئاڵـــۆزە
(هەوری) چاوەڕێی ڕەحمی بارییە
لابا لەسەرمان ئەم تەپوو تـــۆزە

[١٩٦] - بەهۆی جەژنی نەورۆز و باروبۆخی ناو شاری کەرکوکەوە لە ١٩٩٩/٣/٢١ ی.زایینی وتراوە.

## (یادی بوهار) [١٩٧]

بوهار وا هـــــــاته کایەوە — چیمەن رەنگی گەشـــــایەوە
خونچە چـــــاوی هەڵهێناوە — نێرگز تاجی لەسەر نـــــاوە
دەشـــــــــت و چیا رازایەوە — بەفری کوێســـــتان توایەوە
هاژەی رووبــــــارو کانییە — پڕ لە سروشــــــتی جوانییە
بولبول بە ناڵەو شـــین و زار — دەخوێنێ نـــاو گوڵ و گوڵزار
جریوەی مـــەل و خوڕەی ئاو — ئـــــاوازی خۆشی و تێکەڵاو
پەپولەی جوانی رەنگاوڕەنگ — لەسەر گوڵان لەگەڵ مێشەنگ
ئاشق و شەیدای رووی گوڵن — هەمیشە وا لەســــــــەر چڵن
بۆنی وەنەوشـــــــــەو هەڵاڵە — لەو دەشت و ســاراو قەدپاڵە
سروەی شـــەماڵ کە دەیهێنێ — هەســـــــتی مرۆڤ دەجوڵێنێ
دەرمــــــانە بۆ دڵی (هەوری) — رادەماڵێ دەردو جـــــەوری

---

[١٩٧] - بە هۆی گەشتێکەوە بۆ دێی (قازان بلاخ) لە نیزیك شارۆچکەی لەیلان کە ئێستا وێران کراوە ناوچەیەکی دارستان و شاخاوییەو روبارێکی بچووکی بە تەنیشتدا تێدەپەڕێ و جێگایەکی زۆر خۆش و دلگیرە رۆژی هـەینی ١٩٩٩/٤/٢ی. زایـنی وتراوە.

## (نامەیەکی شیعری)([198])

کاک حەســــەن برای بەڕێزو ژیـرم
هەردەم وای لــــە ناو دەریای بیرم
قەت لە یاد ناچی بە ڕۆژو بە شـەو
تا ئیستیلای دڵ دەکا شاهی خـەو
گەرچی دەمێکە ونی لەبـــەر چـاو
یادت ئازیز وەك قەترەی خــــوناو
بە هیوام وەك گوڵ هەر گەشاوە بیّ
بە مەردی وەکوو (زاڵ) و کـاوە بـیّ
سێبەرت هەبیّ بـۆ چینی هــــەژار
کەسوودبەخش بی وەك داری بەردار
کاکە گیان ڕۆژگار وا چەوتـی هێنا
ئارەزووی ئێمەی لە ڕەگ دەرهـێنا
هەموو گیرۆدەین لــە ناو دەردو خەم
ڕۆژگاری روونمان وەك دەریای ماتەم
هیوامان وا بوو کــــە لاوەکانمان
پێبگەن خێرا بکەونــــە جـەولان
رزگارمان بکــــــەن لەم ژینە تـاڵە
بگەشێنەوە وەك گـــــوڵی ژاڵــە
کەچی سەدئەسەف هەرکەو بۆخۆیە
هەژار هەر لە ناو شین و رۆ رۆیــــە
(هەوری) ئەم ژینە هــەر دەبڕێتەوە
کەڵەشێر نەشبیّ رۆژ دەبــــێتەوە([199])

---

[198] - ئەم نامە شیعرییە بەهۆی سەردانی کاك حەسەنی کوری شێخ عەلی مامم کە لە ( سویسرە )وە گەڕاوەتەوە هەولێر ٢/٥/١٩٩٩ی.زاینی وتراوە

## (نامەیێکی شیعری)[٢٠٠]

بۆ کاك محەمەد برای رێزدارم
لاله گەشەکەی وەرزی بوهارم
رێزو سلاوی زۆرو بێ پایان
پێشکەشه به تۆو به ئەدەب دۆستان
پرسیاری ژینت دەکەم هەمووده‌م
به هیوام شادی دوور له دەردو خەم
کاکه ئەگەر تۆش دەپرسی له من
زۆر چاکم سوپاس بۆخودای مەزن
برام چەن شیعری بلاونەکراوە
هی (لوتفی) شاعیر لەلای من ماوە
وا بۆت دەنێرم دوو پارچه لەوان
بلاوی کەوە بۆمان برا گیان
لەبیست و سێ پێنج سالی هەشتاونۆ
(لوتفی) کۆچی کرد بوو بەشین و رۆ
یادی سالڕۆژی (لوتفی) شاعیرە
پێویسته رێزی ئەو پیاوە نەمرە
هەم یادی بکه وەك ژیان نامه
یا له گۆڤارێ یا له رۆژنامه

---

١- ئەم نیوە بەیتە، پەندێکی کوردییە.

٢- ئەم نامە شیعرییەو دوو پارچە شیعری بلاو نەکراوەی (لوتفی)و وێنەیەکی-م نارد بۆ برای بەرێز مامۆستا محەمەد عەبدورەحمان زەنگەنە لە هەولێر لە ٥/٥/١٩٩٩ ی.زاینی.

گەرچی ئەشعاریش رەواجی کەمـــە
بازاڕی کزە ئەمڕۆ لەم دەمـــــــــــە
ئەمڕۆکە تەنهـــا دەوری مادەیـــــە
ئەم خەڵکە زۆری بۆی گیرۆدەیـــــە
ئیتر هەر بژی بە خۆشی و ســـــەفا
دووربی لەخەمو لە دەردو جـەفـــــا
(هەوری) بێگومان سوپاس گوزارە
هەمیشە لە ئاست تو دا قـــــەرزارە

## (ئەو چاوە تەلیسماوییە)[٢٠١]

ئەوچاوە تەلەسماویە وەك شووعلەی نوورە
ئەو خەندەو نازە كە هەموو زەوق‌وسـروورە
ئەو كوولْمە چ شیرینە لە ژێر زولـــڤی سیادا
گولْزاری روخی لالەو نەســــرین و چنوورە
ئەبرۆی وەكو شمشێرە وەیا قەوسی كەوانە
لێوی وەكوو یاقووتەوە یا خونچەی سوورە
روخساری پەری شاگولْی ناو باخـی جـــوانان
وێنەی نییە ناو نەوعی بەشەر هەروەكو حوورە
ئەم دولبەرە زیبایە گەلێ شۆخ و قەشــەنگە
وەك ئاسكی بیابانە ئەوەن مەست و غـروورە
شیرین بەدەنە قامەتی وەك ســـەرووی رەوانـە
سەیری بكە ئەو سینەیە وەك تـــەختی بلوورە
ئەندامی هەموو ناســكە قەت ناكرێ وەسفی
كەی شایەنی ئەو وەسفەم ئەمن گیانە ببوورە
یەك تیری نیگای كافییە بۆ جـــەلبی دلْو گیان
بێچارەیێ وەك من كە هەمیشـــە لـــە حزوورە
سەوداســەرو دێوانە و ئالـــوودەیی دەردم
(هەوری) كە پەرێشانە لەبۆ وەسلْی زەروورە

---

[٢٠١] - جارێ چەند كەسێ لە شوێنی باسی شیعرو ئەدەبیات دەكرا یەكێ لەو دانیشتنەدا وتی لە شیعر دا نـان غـەزە ل زۆر گرنگەو هەموو كەس ناتوانێ غەزەل دانا منیش بەو هۆیەوە ئەو پارچە شیعرەم لە رۆژی یەكشەممە رێكـەوتی ١٩٩٩/٥/٩ ی.زایینی وتراوە.

## (نامەیەکی شیعری)[٢٠٢]

برای زۆر بەڕێز کاکە شەمســـەدین
هەمیشە شادبی قەت نەبێ خەمگین
بۆت رەوان دەکەم ســـڵاوی بۆندار
وەك چەپکە گوڵی نێرگزی بوهـــار
پرسیاری ژین و ژیانــت دەکـــــەم
نەکەی خەم بخۆی نـــەزۆرو نەکەم
چونکە لەشـــکری خـــەفەت بەتینە
دوژمنی گیـــان و خـــەندە و ژینـــە
گەرچی بەینێـــــکە بێ ئاگام لە تۆ
زەمان گـــــێژم دەدا وەکوو گـــــۆ
برا چی بڵێم رۆژگارێ تــــەنگـــــە
ئەم ژینە تاڵە وەك شـــــەوە زەنگە
بەڵام بـــە هیوام وەك داری بــــەڕوو
قەت نەت شوێنێ رەشەبای بەدخوو
هیچ دڵگیر نەبـــــی بەو ژینە تـــاڵە
مەڵێ ژیانم تاڵـــە وەك ژاڵــــــــــە
پیاوی جوامێـــرو چاك ژینی وایـــە
بێ کەڵك و نا مـــەرد وا لە سەفایە
من دەڵێم ئەوەی ژیـــانی تاڵــــــە
ئەوە لە لای من خـــاوەن کەمـــاڵە

---

[٢٠٢] - ئەم نامە شیعرییە بۆ کاك شەمسەدین شێخ نجم الدین بەرزنجی کە حوکمی هەتا هـەتایی درا بـوو بـە سـەریاو لـە بەغدا لە بەندیخانەی ( ابو غریب ) بوو لە ١٩٩٥/٥/٢٩ ی. زاینی وتراوە.

ئەگــەر بێ   بوایە زەمــــــانە وەفا
(ســەعدی) پێخاوس نابوو لەدونیا
تۆزێ بە دیقەت بڕوانە گـــەردوون
چەندی دەبینی بــێزارو زەبـــوون
بە زۆری هەموو شـــێواو ماندوو
وەرز لە ژینی ئێســـــتاو رابردوو
زۆر کەم دەبینی بێ دەردو ئـــازار
کاری لێ نەکـــا جەوری رۆژگـــار
مەر یەکێ تەواو کـاس و نەزان بێ([203])
یا مەستی بادەی دەســتی یاران بێ
ئەگینا ئەوتر گشــــتی سەرانسەر
هەموو گیرۆدەی نـاو گێژی خەتەر
تۆش دڵگیر مەبە لـــە دونیای فانــی
حەزرەتی یوسف چـــۆن بوو ژیانی
شەوگارچەن تاروتوش خۆیبنوێنێ
زەردەی لێوی کەل هەرسەردەردێنێ
خوشی و ناخۆشی هەر کۆتایی دێ
رێبواری ماندوو هەر دەگـــاتە جێ
تۆش ئەم زیندانەت لـەیـاد نامێنێ
جارجاروەك داستان خۆی دەنوێنێ
(هەوری) بەبێ تۆ زەوقی مەهجوورە([204])
بۆ دیداری رووت خـــەیلێ زەروورە

---

[203] - مەر- کورتکراوەی مەگەرە

[204] - مەهجوور – تەریك کەوتوو

## ( بۆ كاك بەختیار)[205]

هاوڕێی دوورم کاکە بەختیـــار
سڵاوی زۆرو بێ شـــــــومار
لەکانگای دڵێکی بێگـــــەرد
وەکوو گولێکی گـــەش و زەرد
پێشکەش بە برای دڵســـۆزم
هاتۆتە جۆش هەست و سۆزم
بەبای شەماڵدا دەینێـــــرم
بۆ وەڵامی چـــــاوە دێرم
پیرۆزبایشت لێ دەکـــــەم
بەبۆنەی هاوســـەرو هاودەم
ژیانێکی خۆش بەرنەســـــەر
دووربن لە خەم و دەردەســـەر
دایم پرسیار ژینت دەکـــــەم
بە هیوام شادبێ هەمـــوودەم
کاکە گەرتۆ پرســـیار دەکەی
زۆر سوپاس بۆ خـالقی حەی
چۆنت دی بوو وەکـــو جاران
هەمیشـــە ناو دۆست و یاران
هەر بە ســـوحبەت و پێکەنین
تەواو دەکەیـــن ژیان و ژین
گوێ نادەینە جەوری رۆژگـــار
رازیین بە ئەمری کـــــردگار
ئیتر پەنــــــا بە زاتی خوا
ئەو عومرەی کە ماوە لـــە دوا
بە شـــــادی تەواوی بکەین
هەتا بەخزمە تی دەگەیــــــن

---

[205] - ئەم نامەیە بۆکاک بەختیار عەبدوڵلا لە هەولێر بە بۆنەی ژن هێنانیەوە لە ١٩٩٩/٦/١ی.زاینی.

## (لەدووری ئەو دلارامە)

لـــــــە دووری ئەو دلارامە گەلێ خـــــــەمگین و بیمارم

هەمـــــــــوودەم گۆشەگیرم دوور لەسەیری باخ و گوڵزارم

دڵ بریندارو دووچارە هـــــــەر بە یەك تیری موژەی

بۆیە وەك دێوانە ئاسا لەسەحـــراو دەشت و كۆسارم

وەكوو شیرینی پەروێزە خەریكی بەزمی شــــــــــــاهانە([٢٠٦])

منیش فەرهادی بێچارە وەیا قەیسی خەفەتبـــــــــــــارم([٢٠٧])

بە رۆژو شەو لە یادی ئەو وەكـــــوو قومری دەناڵێـنم

زەمانەو دەوری پێشووم دێتـــەوە یاد چەنـدە بێزارم

لە چاوم خوێن دەبارێ هەروەكـــــــوو هەوری بوهار وایە

ژیانێكی شڕو شــــــــــێواو دووچــــاری دەردو ئازارم

بەمن چی خۆشی و شادی وەیا دیداری روی جوانان

لە ناو جەوری زەمانە هەر خەریكی شین و هـــاوارم

ئەگەرچی(هەوری)تووشی رەنجەڕۆیی و خەم گەلێ بوومە

لەگەڵ دۆســــــــــتان و یاری خۆم هەمیشە هەر وەفادارم

١٩٩٩/٦/٣

[٢٠٦] - شیرینی پەرویز: مەبەست لە شیرینی خێزانی خوسرەوی پەروێزە یەكێكە لە شاهەكانی ئێران سەردەمی كۆن

[٢٠٧] - فەرهاد- دڵداری شیرین بووە. قەیس عامری دڵداری لەیلا بووە. لەبەر شەیدا بوونی بەعیشقی لەیلا بە مەجنوون ناوی دەركردووە واتە شێت

## (بۆ ئەحمەد تاقانە)[٢٠٨]

برای بەڕێزم ئەحمەد تاقـــانــــــــە
بەهیوام زویر قەت نەبیٚ گیــــــانە
بۆت ڕەوانەکەم لێشـــــــــاوی سڵاو
خۆشەویستی دوور نوری هەردووچاو
زۆر ئارەزوومە پرســــــیاری حاڵت
هەر ئاوەدان بیٚ خـــانــــــەو ماڵت
دوور بی لە بەڵا و موســـیبەت و دەرد
پێویســـتیت نەبیٚ بە پیـــاوی نامەرد
هەمیشە گەش بی وەك لالەی بوهار
سەردانەوێنیٚ لـــــــە رووت رۆژگار
سڵاو و ڕێزم بۆ کــــاکە فـــــیکرەت
ژیانی دوور بیٚ لە ئێش و زیللــــــەت
لەو ساوە تۆ نیت ئەویـــش نەماوە
دیارە کـــــە منیش جێگـــەم گۆڕاوە
ئازیزم ئەگەر پرســـــیارمـــان دەکەی
زۆر چاکین سوپاس بۆ خاڵقـــی حەی
ئیتر هەر بژی ئـــەی نـــووری دیدەم
(هەوری) یادی تۆ دەکـــا هەموودەم

[٢٠٨] - ئەم نامە شیعرییەم بۆ مامۆستا ئەحمەد تاقانە بە هۆی ماڵ گواستنەوەی بۆ هەولێر لە ١٩٩٩/٦/٧ نووسیوە.

## (بۆ کاك تاریق کارێزی) ([٢٠٩])

براى ئازیـــزم تاریق کـــــــارێزی
بەڕاســـــتی ژیـــرو مـــەردو بەڕێزی
پێشکەشـــــت دەکەم لێشاوی سڵاو
سڵاوێ پڕی لـــــــــە عەترو گوڵاو
بەنەشئە وەکوو گوڵاڵـــەی کوێستان
شـــــادی بخاتە نـــاو دڵی دۆستان
پرسـیاری ژینت دەکـــەم کاکی خۆم
گەلێ ئارەزووی دیـــداری رووی تۆم
بە هیوام شادوو هــــەم بەختەوەر بی
دوور لە شـەپۆلی گـــێژی خەتەر بی
بەختت هەر یار بێ و دوژمنت زەلیل
هەردەم لـە ژێر پێت بناڵێ وەك دیل
رۆژگارت هەموو هەرخۆشی وسەیران
هەمیشە لەگـــــەڵ پەری رووخساران
قەت تووش خەم نەبێ هەتاکو ماوی
هەر بە رێبواریش نەبیسی نـــــاوی
کاکە ئەگەر تـــۆش دەپرسی حـــاڵم
لە جەوری رۆژگـــــار وەك نەی دەناڵم
بەرۆکم دەگرێ رۆژی هــــــەزار دەرد
بێزارم لە دەس ئینســــــــانی نامەرد

---

[٢٠٩] - ئەم نامە شیعرییە بۆ برای رۆژنامەنووس کاك تاریق کارێزی وتووە لە ١٩٩٩/٦/١١ی.زاینی

هەمیشە بەخـــــــەم دەروا ڕۆژگارم
گەلێ زەبوونە دڵـــەی بیمـــــــارم
سوپاس بۆ خـــودا پارەو ماڵە هەیە
بەڵام بێ کەڵکــــە دەوران وەك وەیە
لای هەنـــــــدێ ژیان سادەو ئاسانە
بەڵام من دەڵـــــێم نەخێر هەر ژانــە
تا قسەیێ خۆش دەژنەوی جـــــاری
سەد ئەوەندەی ئەوخەم بۆت دەباری
چارە زۆر کەمە و دەردیش هـــــەزارە
(هەوری) لەم ژینە ســەختە بـــێزارە

## (جارێکی چوومە)[٢١٠]

جارێکی چوومە لای دۆســتی ئازیز
بینیم شێواوە ڕەنگو ڕوخسار زیز[٢١١]

چاوی بە من کـەوت خێرا ڕاپەڕی
هەستایە سەرپێ و چاوی هەڵبڕی

پیشێ خواردەوە و ســــەری بادەدا
جارجار ناو لەپی لەیــــەك تر دەدا

وتم چ خێرە و چیــت لێ قەوماوە
بۆچی بەم جۆرە خــەم لێت ئالاوە

وتی مامە شـێخ فەرمــــوو دانیشە
سەرم سوڕماوە ئەمڕۆ لــــەم ئیشە

ئەمە چەن ڕۆژە مەکینەکەی مـــــن
وەستاوە منیش جەرگم بووە کـــون

یا قالب دەشــــکێ یــا بێ کارەبا
کردەوەو ڕەنجم گشــت دەچێ هەبا[٢١٢]

ئیش چۆن وا دەبێ ئەمە کـەی حاڵە
بەم جۆرە بڕوا ژیانمان تـــــاڵـە

مناڵ بەم جۆرە چۆن بەخێو دەکرێ
لەم بێ ئیشییە لـە برسا دەمـــرێ

---

٢١٠ - ئەم نامە شیعرییەم بۆ هاوڕێیەکی خۆم لە ١٩٩٩/٦/١٩ ی.زایینی نووسیوە

٢١١ - زیز- خەمبار

٢١٢ - هەبا - خۆڕایی

منیش پێکەنیم وتم کاکە گیان
ئێوە دوو کەسن گشت ماڵ و خێزان
کەچی بەم جۆرە گیرۆدەی دەردی
بەسە رەزیلی و هەناسە سەردی
هەردەم پێکەنە خەم مەگرە لە دڵ
دوای بە پەلە دەتبەن بۆ ژێر گڵ
ئەی من چی بکەم برکەیێ خێزان([213])
سەرەڕای ئەوەش هەمیشە میوان
هەروەك ئاو دەڕوا رۆژی چەن هەزار
بێجگە لە شتی وردەی ناو بازار
چەن پێویستی تر لەم لاولەولا
بەرۆکم دەگرێ رۆژی چەن بەڵا
بەڵام من هەرگیز پێی دڵ گران نیم
چونکە مەجبووری خۆشی ژیان نیم
تەقسیمی ئەزەل چۆن بێ هەروایە
هەڵپەو راکە راك هیچ بەکار نایە
(هەوری) ئەوەندەی ماوە لەمەولا
بەڕاستی رووکە دەرگاهی مەولا

---

[213] - برکەیی - کۆمەڵێ

## (دولبەرا)([٢١٤])

دولبـــــــەرا روحی رەوان و نووری دووچاوی منی
مایەی ژیـــــــن و حەیات و شوهرەت و ناوی منی

موبتەلاو دووچاری دەردم من لە دووریت خونچەڕوو
هۆی ئازارو کرووزەی جەرگی ســـــــووتاوی مـنی

جەرگی کون کردوم بەجاریٚ رۆژوشەو زوخاوی خەم
باعیسی ئازارو دەردو رووی شـــــــێواوی منی

من کە روی تۆم دەسکەویٚ بۆچیمە گوڵزاروچەمـــەن
بۆنی عەترو یاســـــــەمین و رووحی گوڵاوی منـــی

ئەم جیهانەم لا وەکوو زینـــــدانە بیٚ تـــۆ چـاوەکەم
تۆ روناکیو نەشـــــــئە بەخشی دڵی سووتاوی منی

شیرینی دونیام دەنیٚ بیٚ تامە لام وەك ئـــاوی رووت
شیرینی رووت کافییە هەم نوقڵ و شەكـــراوی منـــی

(هەوری) بیٚ حاڵە هەمیشە ئاهی سەردو رەنگی زەرد
مەرهەم و چارەی برین و دەردو زووخـــــــاوی منـــی

---

[٢١٤] - ئەم غەزەلە لەسەر شێوەی غەزەلی شاعیرە کۆنەکانی کورد لە ١٩٩٩/٦/٢١ ی.زایینی وتراوە

## (له ستایشی محەمەد د.خ) [٢١٥]

محـــــــەمەد شووعلەی نووری خودایە
محـــــــەمەد شافیعی رۆژی جەزایـــــە

محەمەد رابـەری دونیــــــــاو دیـــنە
محەمەد خـۆشەویستی زاتی خـــودایە

محـــــــەمەد گەورە و ســەرداری عالەم
محەمـــــــەد تاجی سەر گشت ئەولیایە

محەمەد نوری روی وەك مانگی ئەنوەر
محەمەد رەحمەتەو هـــــــەم پێشـەوایە

محــــــەمەد مایەی ئاشتی و سەعادەت
محــــــەمەد خونچەی باخی ســــەفایە

محەمەد زوڵـم و کوفری گشت لەناوبرد
محەمـەد ســـــــــەروەری هێنایە کایە

[٢١٥] - مەبەست لە زاتی پێغەمبەر محەمەد کوری عەبدوڵلا کوری عەبدول موتەلیبە لە هۆزی قورەیشە لە رۆژی دوو شەممە لە ١٢ ربیعی یەکەم بەرانبەر بە ٥٧١/٤/٢٢ی زاینی لە شاری مەکە لە دایك بوو لە تەمەنی چل ساڵی بووە بە پێغەمبەر و لە دوای تێکۆشانێکی زۆر لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا لە رۆژی دوو شەممە لە ١٢ی رەبیعی یەکەم لە ساڵی ١١ی کۆچی ، وەفاتی کردووە.. لە ٢٦ /١٩٩٩/٦ ی.زاینی وتراوە.

محـــــــەمەد دوژمنی پیاوی ستەمکار
محـــــــەمەد وەعزو گوفتـــاری رەوایە

محەمەد مانگی شــەق کرد بۆ نەزانان
محەمەد ســەد ئەوەنـــدەی دی لەلایە

محەمەد شاهی گشت دونیا لەئاست ئەو
هەموو دەســـتەو نەزەر چەشنی گەدایە

محەمەد نێرگزو نەســرین و شـــەوبۆ
لە رووی ئەو شـەرمەزارو بێ نەوایـــە

هەموو دەم (هـــەوری) داماو حـــەزینە
لەعەشقی نـــووری رووی ئەو موبتەلایە

## (بۆ کاک شەمسەدین)[٢١٦]

برای خۆشـــــەویست هەموو دەم لە یاد
کاکە شەمســـــەدین قەت نەبی ناشـــاد

بۆت رەوان دەکـــــــەم رێزو سڵاوم
یاری زۆر ئازیز بینایی چـــــــاوم

بە هیوام هەردەم کـــــە شـــادومان بی
دوور لەمەینەت وجــــــەوری ژیـــان بی

ئەگەر دەپرســـــی برا تۆش لــە من
چاکم زۆر سوپـــاس بۆ خودای مەزن

ئازیز قەت نەکەی خــــــەم بگری لە دڵ
هەموودەم گەشبە وەك خونچەی سەرچڵ

گەرچی بێزاری تۆ لــەم ئـــــەحواڵە
بە دایم ژینت زۆر ســــــەخت و تاڵە

باری سەر شـــــــــــانت گەلێ گرانە
تل دەدەی لە ناو جــــــــەوری زەمانە

بەڵام کاکی خۆم خـــەم سوودی نییە
لەراست ئەمری خوا دەسمان پەتییـە

کەواتە خۆشی و ناخـــــــــۆشی ژیان
هەموو وا لە لای قودرەتی یــــــــەزدان

ئیتر بێ کەڵکە هـــــــــــــاوارو ناڵە
هەر کەس مەربووتی چــارەو ئیقباڵە

[٢١٦] - ئەم نامەیە بۆ بەرێز کاك شەمسەدین شێخ نەجمەدین بەرزنجی کە حوکمی هـەتا هـەتایی درا بـوو لـە بەغـدا لـە گرتووخانەی (ئەبو غریب) بوو منیش وەڵامی نامەکانیم بە شیعر داوەتەوە لەسەر داوای خـۆی لـە ١٩٩٩/٧/١٤ی. زایـنی وتراوە.

هیچ خەفەت مەخۆ لـــــەم دەورو وەختە
زۆر کەس وەکـــــوو تۆ ژیانی سەختە
بەڵێ ئەم دونیـــــا کاری دەم دەمـە
بۆ هەندێ خۆشە بۆ هـــەندێ خەمـە
یەکێ خۆش حاڵــــــە یەکێ پەشێوە
یەکێ بە لەنجە دەڕوا بەڕێـــــــــوە
یەکێ دەوڵەمـــــــەند یەکێ هەژارە
یەکێ لەگیان و ژین خـــــۆی بێزارە
یەکێ ســــــــەخیــــیە یەکێ ڕەزیلە
یەکێ سەربەســــــــتە و یەکێ زەلیلە
یەکێ بێ هۆشـــــەو یەکێ هۆشیارە
یەکێ لەش ســــاغەو یەك دەردەدارە
یەکێ بۆکەس خۆی دەسووتێ وەك مۆم
یەکێ باوك خۆی دەر ناکـــە لە گـــۆم
یەکێ سفڵەیەو یــــــــەك بە وەفایە
یەك بە ناموســــــە و یەکێ ڕیسوایە
ئەم باســــــــــە هەرگیز کۆتایی نییە
هەزار ئەوەنـــــــــدە هەروەك کانییە
ئیتر پێی ناوێ لەمــــــــــــە زیاتر
تۆش دڵگیر مەبــــــە لە ڕۆژگار ئیتر
ســــــــــــەبر ئەگەرچی تاڵ و گرانە
بەڵام کلیلی دەرگــــــــــــای ژیانە
(هەوری)ش وەکوو تۆ هەناسە سەردە
ئەو بە جـــــۆرێ تر گیرۆدەی دەردە

## (بۆ کاك سەربەست عەبدولخالق)([٢١٧])

بۆ کاکە سەربەســـــت برای دوورم
من بـــۆ بینیت خەیلـــیٚ زەروورم
پێشکەشت دەکــــــــەم رێز سلاٌوم
برای زۆر ئازیز بینــــــایی چاوم
پرسیاری ژین و ژیـانـــــت دەکەم
ساغیت لە خودا بۆ داوا کــــــەدەم
هەر بەختەوەر بی نەتبینم خەمـگین
دووربی لەشەڕی ئینسانی کەم دین
هەمیشە گەش بی وەك لالەی بوهار
سەر دانەنوێنی لە ئاســتت رۆژگار
ئازیز ئەگەر تۆش دەپرســی لـــە من
زۆر چـاکم سوپاس بۆ خودای مەزن
دەمێکە ئاگــام نییە لە حاڵــــــت
نازانم چۆنە شەوق و کەماڵــــــت
ئایە وەك جاران بە نەشـئەو شەوقی
دەم بە پێکەنین دایم بـــــــە زەوقی
هەمیشــــە لەگەڵ کوڕی یارانـــــا
وای لەگەڕان و بەزمی سەیرانـــــا
یا تۆش وەکو من گــیرۆدەی دەردی
خەمناکی دەستی پیـــاوی نامەردی

[٢١٧] - ئەم نامەیە بۆ برای بەڕێزم کاك سەربەست شێخ عەبدولخالق شێخ سەعیدی قوتانی کە ئستا بە ماڵەوە لە سلێمانین لە ٢/٨/١٩٩٩ ی.ز. وتراوە

ز‌ۆر ئارەزوومە وەســــڵی دیدارت
وەکوو پەروانە لە دووی روخسارت
چی بکەم زەمانە کەلەپچەی کردووم
گەرچی لە ژینام بــەڵام وەك مردووم
بەڵام کاکە گیان تـــۆ بۆ نـــاپرسی
نە هاوڕێی کۆن و لە پیاوی بــرسی
تۆ کەمێ چاتر کــــــەی وەکوو منی
کەی وەك من گیری پەنجەی دوژمنی
کەی وەك من لە ناو دەردو عــەزابـــی
سینە بوریان و جگــــــەر کـەبــابی
کەی وەك من رۆژگار هەڵتــەپەڕێنێ
هەر تاو بۆ شوێنێ رات دەرفــیــێنێ
کەی وەك من تووشی عەزابی سەختی
کەی وەك من گیری بەڵای نـــاوەختی
کەی وەك من بادەی دەستت شکاوە
شەرابی خۆشیت لـــــە دەس رژاوە
کەی وەك من فەلـــەك داوییە لە باڵت
کەی وەك من چەوتە بەخت وئیقباڵت
کەی وەك من سینەت بۆتەکۆگایخەم
شادی تیا نییە مەگەر بە ئاســــتەم
کەی تۆ وەکوو من وەك نـەی دەنــاڵی
کەی بە وێنەی من مەست و عـەودالی
من وەها بەڵا چوار دەوری گرتـــووم
نایێتە یـــادم ژینی رابـــــــــردووم

جەوری رۆژگار جەرگی برژانـــــــــدم
شەرابی شادی لە دەس رژانـــــــدم
لالۆ من گەلێ دڵ بریـــــــــــــندارم
نەکەی دڵگیر بی تۆ لە گوفتــــــارم
زەمانە باری وای لێ بارکـــــــــردووم
لە تاوی گەلێ پەشێوو مانـــــــدووم
ئیتر ئـــــازیزم بە هیـــــــوای دیدار
ئەگەر مەیـــــلی بێ چەرخی رۆژگار
یارەبی دوور بی لە دەردو بـــــــــەلا
ئاگادارت بێ حەزرەتـــی مــــــــەولا
رۆژت بە شـــادی شەوگارت رووناك
دوژمنت زەلیــل بنالێ خەمــــــناك
(هەوری) ئەگەرچی ئەمڕۆ لێت دوورە
بڕوا کە جەنـــــــــاب دڵ لە حزوورە

## (ئەم کیژۆڵانە)

ئەم کیژۆڵانە جوانـــــــن
گولاڵەی ســــــەر کێوانن

وەك شـــــکۆفەی بوهارن
خوێن شـــــیرین و نازدارن

کاتێ کە دێن و دەچـــــن
بردویـــــــــانە هۆشی من

کوڵمیان چەشـنی گولاڵە
زۆر گەش و ســــوورو ئاڵە

گەردنیان مینای نـــایاب
وەك کەنیزەی ئەفــراسیاب([218])

چاویان وەك گـــــەلاوێژە
موژەیان تیر هـــــــاوێژە

بالاّ بەرزو شـــــل و مل
چاویان رەشـــــە بەبێ کل

هەموو جەســـتەیان نازە
نیگایان پر لـــــــــە رازە

وەك شاگوڵی ســــەرچڵن
مایەی فرووغی دڵـــــــن([219])

هەروەك شنەی کـازێوەن([220])
ناسك و پەری شـــــێوەن

وەك هەلاڵەی گۆی چەمن
بۆ (هەوری) مایەی خـــەمن

١٩٩٩/٩/٢٧

---

[218] - ئەفراسیاب کوڕی پەشەنگ شا پاشای توران بووە لەسەردەمی کەیانییەکاندا.

[219] - فروغ- رووناکی

[220] - کازێوە – بەرەبەیان.

## (نامەیەکی شیعری بۆ کاک سامی کاکەیی)

بۆ خزمەت بـرای ئازیز کاک سامی
دووربی لە جـەورو ئیش‌و ناکامی
پێشکەشت دەکـــــەم رێزو سلاوم
برای زۆر شریـــــن گلێنەی چـاوم
بە هیوام شادیی کاکە هەمـــوودەم
لەم ژینە هەرگیز توشت نەبێ خەم
کە نەفتت نەکــــا چەرخی رۆژگار
هەر گەشاوەبـــی وەك لالـەی بوهار
دوژمنت دایم دووچــــاری خەم بێ
دڵ و دەروونی پڕ لـــە مـــاتەم بێ
ئازیزم گەر تۆش دە پرســی لە مـن
زۆرچاکم سوپاس بۆخودای مـەزن
من لەهەولێر بـووم چەن رۆژو وەختە
بەلاَم دەورانی زۆر تـووش و سـەختە
لەبەر سـەرقاڵی و شـــپرزەیی خۆم
گەڵێ هەوڵمدا کەچی نەلـــوا بـــوٚم
بێمە ســــــەردانــــــت دەبێ ببووری
لەبەر پەشـــێوی کــــــاری زەرووری
پەنا بە خـودا لـــە داهاتــووی زوو
یەکتر دەبیـنین هەردوو زووبەزوو
ئیتر هاوڕیت بێ هەرخۆشی‌و شادی
تۆ لەلای (هـــەوری) هـەردەم لە یادی

هەولێر - ١٩٩٩/٩/٣

## (نامەییکی شیعری)([٢٢١])

کاك حەمەسەعید خۆشەویستی دور
ڕێزو سلاوی زۆرو بێ سـنوور

دەنێرم لەگەڵ سـروەی شەماڵە
پڕ بێ لە بۆن گوڵ و هـەلاڵـە

لەناو دڵەوە پێشـکەشی دەکـەم
ساغیت لە خودا بـۆ داوا دەکـەم

بەهیوام شـادوو هەر بەختەوەر بی
دوور لە گێژاوی دەریای خەتەر بی

هەموودەم گەش بی وەك لالەی بوهار
سەر دانەوێنێ لە ئاسـتت ڕۆژگار

دوژمنت کوێرو سەر کزو زەلیـل
لەژێر پێت هەردەم بناڵی وەك دیل

پێویستت بە کەس نەبێ لـە دونیا
بێجگە لە زاتی گـەورەی خـودا

ئازیزم گەر تۆش دەپـرسی لە مـن
زۆرچاکم سوپاس بۆخودای مـەزن

[٢٢١] - من و مەلا مەحموودی شاعیر ناسراو بە (کزەڵ) میوانی مەلا سەید ئەحمەدی فەیلەسووف بووین لە چەمچەماڵ یـەك دوو ڕۆژ بوو لە خزمەت ماموستا گەلێ قسەی خۆشی بۆمان کرد باس هاتە سەر کاك حەمە سەعید کە لە ئەمریکا بوو، وتم مەلا مەحمود با سەروو نامەی بۆ بنووسین بە شیعر وتی زۆر چاکە ئیتر من ئەم نامەیەم نووسی مەلا مەحموودی شـاعیریش هەر خەریك بوو نازانم چی کرد، لە ڕۆژی ١٩٩٩/٩/٩ی. زاینی وتراوە.

هەموو زۆر باشـــین بەبێ دەردوخەم

لە ناو خزم و کەس شادو خاترجەم

خزمەکان هەموو سڵاویان هەیـــە

گشت دەم بە دوعاو وتەی چاکەیە

تا بڵێی ژینمان پڕ لـــــە صەفایە

تەنها پێویستمان بە زاتی خوایـــە

کاکە ئەگەرچی(هەوری) لـێت دورە

بەڵام بڕواکە دڵ لـــــــە حزوورە

## (نامەیەکی بۆ سەید شوکری شاعیر)[222]

بۆ کاك سەید شـــوکر برای ڕێزدارم
لە گەشـــــەکەی وەرزی بوهـــارم
بۆت ڕەوان دەکەم کاروانی ســـــلاو
برای خۆشەویست بینای هەردووچاو
بە هیوام دایم هـــەر بەختـــەوەر بی
کانگای زانین و ڕێـــز وهـــونەربی
ڕۆژگارت بڕوا هەر بە گوشـــــادی
شەوگارت هەموو پڕ بێ لـە شـــادی
رجام وەهایە لـــە خزمەت بـــاری
قەت تووشـــت نەبێ خەم وبێزاری
ناحـــەزت هـەردەم کزو زەلیـــل بێ
بەدەس خەمـــەوە هەمیشـە دیل بێ
ناوتم بیســـت بوو ئەمن جاروبـــار
لەنـــاو مەجلیسی دۆستو ناسیار
تا بۆی باس کردم کاکە شـێخ نەهرۆ
کەوا شـــاعیری بە تـــوانا ودەس ڕۆ
تۆ کە سەیدی ئامـــۆزای منـــی
بۆ من قەڵغانی بەردەم دوژمـــنـــی
بۆیە ئەم نامـــەم بۆت نووسی کاکە
پێویســـتە یەکتر بناسین چاکـــە

---

[222] - ئەم نامەیەم بۆ کاك سەید شوکری شاعیر لە شارۆچکەی پردێ لە ١١/١١/١٩٩٩ی. زاینی وتراوەز

چەنێ دۆستت بێ هێشتا هەر کەمە
یەك ناحەزت بێ جێی داغ و خـــەمە
ئەنجا ئەگـــــەر تۆش دەپرسی لە من
زۆرچاکم سوپـــــاس بۆخودای مەزن
دونیا ڕێك نابێ بۆ هیچ کەس تەواو
جارجارە دەبێ پێی گیر بێ لـــە داو
گەر کەم و کوڕی هـــــەیە لەم نامـــە
کەمێکم خوێندوە نەکـــــوو عەللامە
دەبێ چاو پۆشی بفەرمووی گیـانە
هەستی شێواندووم چەرخی زەمانە
ئەوەندە قورسەباری ســـــەر شانم
هەندێ جار هەیە ناوخۆم نـــــازانم
ئیتر هەمیشە یادت لـــە لامـــــــە
(هـــــەوری) چاوەڕیی نامەو کەلامە

## (بۆ كۆچی دوای شێخ لەتیف )([٢٢٣])

دەنگی پەیدابوو پڕ گــــریان و شـین
ڕووی دونیای پۆشـــی هاوارو ناڵین
بۆ كۆچی دوایی جەناب شێخ لەتیف
دڵ و دەروونمان پڕ بـوو لە بــــــرین
تەشریفی دەرچوو لـە دونیای ڕۆشن
چوو بۆ لای باری بێزار بوو لــە ژین
ئارەزوو باخی بە هەشــــــتی دەكرد
ڕووحی بەپەلە زوو كەوتە فــــــڕین
ئێمەی بەجێهێشت بۆ ئاهوحەسرەت
هەتاكوو ماوین بڕ ژێـنین ئەســــــرین
ئەی خاك ئەم زاتە ئەمڕۆ میوانــــــــە
گەلیٚ ناسكە وەك لالەو نەســـــــرین
ئازاری نەدەی میـــــــوان داری كە
چونكە ئازاری زۆر بینی لـــــە ژین
گەلیٚ بەڕێزبوو زۆرخۆشــەویست بوو
جێگەی لە ناومان ون نابــیٚ یــــەقین
(هەوری) هەموودەم دەستەودوعایە
شاد بیٚ بە گوڵزار بەهەشتی بەرین

---

[٢٢٣] - ئەم پارچە شیعرە بە هۆی كۆچی دوایی جەنابی كاك شێخ لەتیف شێخ سادق هەشەزینی كە لە سلێمانی كۆچی دوایی كردووە ١٨/١١/١٩٩٩ی. زاینی وتراوە

## (نامەیەکی شیعری لەلایەن سەید شوکر)[٢٢٤]

شێخ عوبیدوڵلاّ قوربان نـــــــامەکەت
نامە جوانـــــەکەی پر بەرامەکـــــەت
گەیشتە دەستم دامنا لەســــــەر چاو
روناکی چاوم بە (هــــــەوری) ناسراو
بەناوی خودا خوێندمەوە کـــەم کـــەم
پیٚ شادومان بووم ئازاد بووم لــــە خەم
لەدوای خوێندنەوەش ماچم کرد سێجار
خودا یارت بیٚ بـــــرای بــــــەهرەدار
بیرو قەڵەمت هەردەم لـــــــــە کاربیٚ
بــــــاچقڵ و نێزەی چـــاوی زۆرداربیٚ
تەمەن درێژو دوور لــــــــــە جودایی
ببیە پێشرەوێك بـــــۆ نــــەوەی دوایی
خۆش بیٚ رۆژگارت هەر شادبیٚ شـەوت
هەرگیز نــــــەچڵەکی شـــیرینی خەوت
سوپاس و سڵاو بۆ کاکــــــــــە نەهرۆ
کە منی بەندەی وا ناســــــــاند بە تۆ

[٢٢٤] - ئەم نامە شیعرییەم لەلایەن کاك سەید شوکرەوە بەدەست گەیشت لە وەڵامی نامەیەکی من دا لە بەرواری ٩٩٩/١١/٢٤ لە شارۆژچکەی ( پردیٚ )وە

ئەو ئامۆزامەو زیادی گوتـــــــووه بۆم
ئەگینا قوربان كـــــەی مســتەوای تۆم

زۆر له زۆكەوه زیاتر له ســـــــــاڵه
چاوم لـــــه ڕێگەی نامـــــــەته خاڵه
داوام له یەزدان هەر شادبی تاســــــەر
خوایه ناخۆشـــــیت قەت نەییته بـــەر
لـــــــــه كۆتایشدا گەورەییت نـواند
كه ئەم شـــــادیەت له دڵمنــــدا چاند
قوربان بــــــه پەنجەو پێنووس و زارم
خەیلی مەمنوون و ســــــوپاس گوزارم

## (ستایشی شێخ محێدینی کەرکوك)[٢٢٥]

شێخی من دیارە لەدونیا شـــاهی خاوەنی هیمەتە
پەندو ئامۆژگاری بێشك لابەری ســــــەد عیللەتە
هەڵسە غافڵ ڕاپەرە زوو وەرگــرە ئیرشـــادی ئەو
بۆچی تۆ وەرناگری بۆخۆت بەشـــێ لەو رەحمەتە
پیاوێکی چاك و پیرۆز بوو نایەوی بەڵگە و سبووت
پێشرەوی سادات هەموو ئینکاری خەیلێ زەحمەتە
ئەم وڵاتەی گرتبوو بەحـــــــری فیـوزاتی تەواو
مورشیدێکی زۆر پیرۆز بوو خۆلەبۆ ئـەم ئوممەتە
بۆ موریدی خۆی هەموو دەم حـــــازرە روحیانەتی
چونکە زاتێکی کەرامەتـــــدار و خـــــاوەن هیمەتە
روحی پاکی ئاگەداری ئالـــــــو بەیتی خۆیـــەتی
بێگومان داوای قەبووڵە چونکە نەسلی حەزرەتـە
شێخێکی عالی مەقام بوو شاهیدە ئـــــاســـاری ئەو

---

٢٢٥ - شێخ محێدین کەرکووك کوڕی شێخ حەسەنی حافز گلەزەردیە ئەویش کوڕی شـێخ محەمـەدی نۆدێیـە سـاڵی ١٧٢٠ی. زاینی لە دێی گلەزەردە لە ناو خێزانێکی ئایین پەروەر دا لە دایك بووە پاشان لـە سـاڵی ١٧٥٨ی.ز. رووی کردۆتـە شـاری کەرکووك و لە گەڕەکی ئیمام قاسم جێگیر بووە هەموو ژیانی خۆی بە خواناسین و پەروەردەی ئاینی بەسەر بردووە نـاوبراو زانایەکی ئـایینی بەناوبانگ بووە لە سەردەمی خۆی شێخ حوسێنی بەسرانی کە رابەری رێبازی قادری بووە لـە دوای ئـەو شێخ محێدینی بووە بە رابەری ئەو رێبازە پیرۆزە. زاتێکی دەم و نفوس پاك بووە، یەکێ بووە لـە ئـەولیاکانی وەخـت لـە دوای کۆچی دوایی ئەویش شێخ عەبدو سەمەد گلەزەردی کراوە بە رابەری ئەو رێبازە. شـێخ محێـدین زمانـەکانی کـوردی، عەرەبی، فارسی و تورکی بەچاکی زانیوە. دەربارەی زانیاری ئاینی و شەرح و تەسەوف و پزیشکی هەندێ دانـراوی زۆر بـە نرخی لە دوا بەجێماوە لەوانە: ١- سیف القاطع، ٢- کشف الاعمال، ٣- مجمع الجواهر، ٤- اصلاح النفوس، ٥- صـنائع الاعمال، ٦- کشف الکروب و هەندێ دانراوی تری بە زمانەکانی تر هەیە ئەوەی شایانی باسە نـاوبراو تـا دوا هەناسـە ژیانی لە تەکیەو مزگەوتی خۆی لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە کەرکووك ئیرشادی موسڵمانان کـردووە تـا لـە سـاڵی ١٧٨١ی. زاینی ئەمری خودای کردووە لە گۆڕستانی ئیمام قاسم ئەسپەردەی خاك کراوە لەو رۆژەوە گۆڕسـتانەکە بـە نـاوی ئـەوەوە ناسراوە بە گۆڕستانی شێخ محێدینی کەرکووك لە ١٩٩٩/١٢/٢ی. زاینی وتراوە.

ئێستاکەش هەروەك چراییێکە لەناو ئــــەم میللەتە
لەوژیانەی خۆی هەموودەم خزمەتی دینی دەکرد
مەدحی کۆتایی نییە ئەوزاتە خاوەن شــەوکەتە
مەرقەدی پیرۆزی دەوری پڕ لە ئەحـــباب و مەلەك
(هەوری) بۆ ناچیتە زیارەت تابەکەی لـــەم غەفلەتە

## (هەستن لە خەو)[٢٢٦]

هەستن لە خـــــــەو منالّینە
ڕاپەڕن وا کـــــــــاتی ژینە
بەسەر چوو ڕۆژگاری تـــــالّی
شادی باسکی خۆی هەلّمالّی
دەشت و دەر جـــوان و ڕازاوە
لالەو نەسرین تێکـــــــەلاّوە
بولبول دەخوێنێ لەســــەر چڵ
دەڕژێنێتە دەر داخـــــی دڵ
هەستن هەمـــــــووتان پێکەوە
ڕاپەڕن لەم مەســـتــی خەوە
هەموو دەستی یەکتر بگـــــرن
هەروەکوو شورای ئاســـــن
ڕۆژو شەو گشت بەبێ وچـــان
خۆ بەخت کەن بۆ نیشتــمان
هەروەك زێرە خــــاکی ولاّت
پێویســـــتە بە هەوڵ خەبات
بەیەك دڵ و بەیـــــــەك زوبان
بلّێن هەر بژی کـــوردستان

١٩٩٩/١٢/٣٠

[٢٢٦] - ئەم شیعرە بۆ منالاّن وتراوە لە ١٩٩٩/١٢/٢١ ی. زایینی

## قەرنی بیستەم)

قەرنی بیســـتەم وا خەریـــــکە تێپەڕیٚ
خونچەی عومری بەجـــاری هــەڵوەریٚ
زۆر دەمێکە پێکـــەوە هــــــەردوو دەژین
ئەمـــڕۆ ئامادە بووە بـــــۆی دەرپـــەڕیٚ
تەنها چەن ڕۆژیٚ ژیـــانی مـــاوە بـەس
نازانیٚ بۆکوێ سەری خــۆی هەڵگـــریٚ
گەرچی کورد تۆزقاڵی خۆشی لیٚ نەدیی
غەیری ئازارو شەق و دەردە ســــــەریٚ
ڕۆژگاری گشــت بە ئاژاوە و خــــەفەت
کێی دەوێرا نـاوی ئازادی بـــــــەریٚ
بابزانین قەرنی تــازە چـــــــــۆن دەبیٚ
تۆ بڵێی وەك ئەمـــڕۆ ناحەق حەق بەریٚ
یا خۆ ئازادی جیهـــان دەگرێتـــــــەوە
کوردی ئێمەش مافی خۆی تیاوەرگریٚ

١٩٩٩/١٢/٣٠

## سالّی تازە([٢٢٧])

ســـــالّی تازە بەخێر بێ     هەموولا پۆشـــــتەو تێر بێ
بارانی خێر و رەحـــــمەت     ببارێتە ســـــــەر میللەت
نەهاتی لـــــە هیچ شوێنێ     مـــــــلی بشکێ و نەمێنێ
ئاشتی و خۆشی بە جــارێ     بۆ گشت لایی ببــــــارێ
نەمێنێ زولّـــــمی زۆردار     بـــــڕوا وەك بەفری بوهار
زۆر بێ ئیش و کاســــبی     هیچ کەس تووشی خەم نەبێ
دونیا وەك ماســـتی مەیوو     بۆ هەژار و بۆ هـــــەتیوو
بنوێنی خۆشی و شـــادی     بخرێتە چـــــــالّ بێدادی
داری ئاشــــــتی بەرگرێ     عەدل و راستی ســــەرگرێ
نەمێنێ پیاوی بـــــەد خوو     لە ناو بچێ زوو بـــــەزوو
دەســـــــــتی دزو درۆزن     خێرا ببڕن لـــــــــــەبن
خۆ هەڵکێش و چەنەبـــاز     قســـــــــە زل و بەد نیاز
هەم تەمەڵ و تـــــــەوەزل     جێی نەمێنی نــــاو کۆمەڵ
پیاوی چاك و بە جـــەوهەر     دڵســــــۆزو میللەت پەروەر
کارو فەرمـــــان وەرگرێ     زوڵم و زۆر خـــــۆی دەمرێ
جـــــەورو میحنە ت نەمێنێ     ولآت جـــــــوانی بنوێنێ
بوهار لالەی روونـــــاك بێ     ئاســـــــمان روون و پاك بێ
چەم و دارســــــتان هەموو     بگەشـــــــێتەوە زۆر زوو
رێك بخرێ چیاو دەشــــت     هەموو وەك بـــاخی بەهەشت
ســــــەرجەم ئەم نیشتمانە     ئەم خاکە پـــــــاك و جوانە

---

[٢٢٧] - ئەم شیعرە بەهۆی سەری سالّی تازەوە لە ٢٠٠٠/١/٤ ی.زاینی وتراوە

ئازاری تیـــــــا نەمێنێ
خەفەت مل خـــۆی بشکێنێ

ئیتر زەردایی دەم کـــــەل
موژدە دەهێـــــــنێ بۆ گەل

تـــــاریکی شەو لادەچێ
تیشکی رۆژ زوو دەردەچـــێ

تاماوە ئـــــــەم دونیایە
ئەم ئەرزە ژینی تیـــــایە

یاخوا هەر کامەران بـــــێ
جێگەی خۆشی ژیـــان بێ

هـــــەر ئاوەدان بێ تاسەر
هەتــــــا کۆتایی بەشەر

کوردســـــتان بەختەوەربێ
دوژمنی خــــاك بەسەر بێ

(هەوری) تۆش بەســـە ئیتر
شین و ڕۆمەکە چـــیـــتـــر

## (نامەییکی شیعری بۆ مامۆستا مارف)[٢٢٨]

بۆ کاك شێخ مارف برای ڕێــــزدارم
لاله گەشـەکەی وەرزی بـــــــوهارم
پێشکەشــت دەکـــــەم ڕێزو سـلاوم
برای زۆر ئـازیـــــز گلێنەی چـاوم
پرســــــــیاری ژین و ژیانت دەکـەم
بەهیوام هـەرگیز تووشت نەبێ خـەم
دوژمنت هـــــــەردەم کزو زەلیل بێ
لـەناودەریای خەم هەمیشە دیل بێ
زۆرم پێ خـۆشبوو هاتیەوە ناومـان
دەروون گەشاوە رووناك بوو چاومـان
گـەرچی لە زووەوە ونی لەبەر چاو
یـادت ئازیزە وەك قەترەی خونـاو
لە نـــاو بێگـانە ژیان کەی ژیـــــنە
بەرد لەجێگەی خۆی دیارەسەنگینە
یەك سەعات ژیان لـەم نیشـــتمانە
نایدەم بەسەد ساڵ لەسای بێـگانە
لە ناو کۆمەڵدا بە خۆشی و تاڵـــی
زۆر بە ختەوەرو خـــاوەن کەماڵـــی

---

[٢٢٨] -ئەم نامەیەم بۆ برای بەڕێز دکتور مارف عومەر گوڵ بەرزنجی بە هۆی گەڕانەوەی لە دەرەوەی وڵات بۆ سلێمانی لە ٢٠٠٠/١/١١ی. زاینی ناردووە.

زۆرم ڕێز هەیە بۆ هەمـــوو خـــێزان

لە بچووك ترین هەتا حەپســـە خان

نەهــــــاتوومە لات دەبـــێ ببووری

لەبەر سەرقاڵی و کـــاری زەرووری

ژیان لەم وەختە ئەومـندە تـاڵـــــــە

هەرکەسەولەشوێن سەد دەردعەوداڵە

کاکە ئەگەرتۆش پرسیارمان دەکەی

زۆرچاکین سوپاس بۆخاڵقی حـــەی

چاکی تۆش هەردەم ئاواتی منــــــە

خۆشەویستیـت وەك دەریای بێـبنە

ئومێدەوارم شـــــادبم بە دیـــــــدار

گەر ئارەزووی بـــێ زاتی کردگـــار

گەر کــــەمو کوڕی هەیـە لەم نامە

زانیاریـــــم کــەمە نەکوو عەللامە

دەبێ چاو پۆشی بفەرموون قـوربـان

هەستی شێواندوم چەپۆکـی دەوران

ئیتر هەرگەش بی وەك لالـەی بوهار

لە رووت نەنیشێ گـەردی رۆژگـــار

هەر چەندە(هەوری) ئەمڕۆ کە دوورە

بڕوا کـە جەنـــــاب دڵ لە حـزوورە

## (نامەیەکی شیعری)([٢٢٩])

بۆ کاك شێخ مەحموود برای رێزدارم

لالەو نێرگزی وەرزی بوهارم

پێشکەشت دەکەم رێزو سلاوم

یاری زۆر ئازیز گلێنەی چاوم

خزمی خۆشەویست برای هۆشیار

ئاگەدارت بێ هەردەم کردگار

بە هیوام دایم هەر کامەران بی

هەمیشە لە ناو خۆشی ژیان بی

پرسیاری ژین و ژیانت دەکەم

ئومێدەوارم تووشت نەبێ خەم

دایم سەربەست بی ناودۆستوئەغیار

سەر دانەوێنی لە ئاستت رۆژگار

ناحەزت دووچار کزو زەلیل بێ

لەژێر پێت هەردەم بەوێنەی دیل بێ

بە کامی دڵت بسوورێ رۆژگار

ئەستێرەت دایم گەشو پرشنگدار

جەناب پرسیاری من ئەگەر دەکەی

زۆر چاکم سوپاس بۆ خاڵقی حەی

[٢٢٩] - ئەم نامەیەم نووسیووە بۆ جەنابی شێخ مەحموودی شێخ کاوەی حەفید وەزیری کاروباری ئاینی لە هەرێمی کوردستان- هەولێر کە داوای کتێبی کەراماتی حەزرەتی کاك ئەحمەدی شێخ-ی کرد بوو قودسیە سیرە ٢٠٠٠/١/١٥ی زاینی، وتراوە

ئازیزم بـــۆ وەی بەڵێنـــــــــم دابوو
دەبێ ببووری کە نەگـــــــــەیی زوو
چونکە کتێبی شـــێخی باپـــیرەت
بڕژێ بەسەریا هـــــەزاران رەحمەت
لەلای شـــــێخ ســـــتار پارێزراوە
گەلێ بـــــــەنرخە وەك نووری چاوە
ئەویش دەمێکە چووە بـــۆ گـــەڕان
بۆ بەغدا بۆ لای شێخی کـــەسنەزان
منیش ناچارم چـــــاوەڕێی بکـــەم
هەتا کارەکەی خۆم ئـــــەنجام بدەم
بەڵام داخەکەم هەر لە بەغـــدایـــە
وا لەلای شێخە ئەوخاوەن پایـــــە
هیچ سوودی نەبوو گەلێ هـــەوڵمدا
ناو کتێبخانەی بۆم نەبوو پەیـــــدا
هەر گەڕایەوە یەك ســــەر زووبەزوو
مـن لێ وەردەگرم بەبێ ســـــێودوو
بۆت رەوان دەکەم بە عەونی بـــاری
بمێنێ لەلات بۆ یـــادگـــــــاری
ئەمەش کە وێنەی شێخی نەمـــــرە
دیارە پیرۆزە لـــــێمی وەرگـــــــرە
ئەوا دەینێرم قەبـــوولْ بفـــەرموو
بەڵکو ببێتە هۆی گـــوشادی تـــوو
ئیتر هەر بژی ئـــــەی مـــەردی مەزن
برای دڵسۆزتە (هـــــەوری) تامـردن

## (بۆ شایی کاك ئەردەلان)([٢٣٠])

ئەمڕۆکە شـــــایی کاك ئەردەلانە
خۆشیو هەڵپەرکیو ئاهەنگگێڕانە
ئازارو مەینەت نییە لــــەم ناوە
شادی و پێکەنین لە هەمــوولاوە
رۆژێکی گەلێ خۆش و گوشادە
لەشکری خەفەت ئەمڕۆ بەربـادە
هەرچی دەبینی دەم بە پێکەنین
منالی وردەو لاوی خوێن شرین
یاخوا بەخێربێ ئەم شاییوبەزمە
ئەم رۆژە بڕوا هـــەروا بەم نەزمە
شادی بباریٚ بۆ بـــووك و زاوا
لە هەموولاییٚ سەدجار ماڵ ئاوا
هەموو بەخێربێ دۆستوبرایان
مایەی دڵشادی ئێمەن بێگومان
سوپاس گوزارم هەتاکوو ماوم
چاکەی هەموولا وا لەبەر چاوم
پیرۆزبایی خۆم دەنێرم بـــۆتان
بۆ نەجوەخانو بۆکاك ئەردەلان

---

[٢٣٠] - ئەم پارچە شیعرەم بە هۆی ژن هێنانی ئەردەلانی کوڕم لە رۆژی ٢٠٠٠/٢/٢٢ ی. زاینی وتراوە.

## (هەستن)[٢٣١]

هەستن هەستن لاوەکـــان خێرا بکەونە جـــــەولان
رووبکەنە تیپی ئـــاری بۆ وەرزش و بۆ یـــــاری
ئاری تیپی خۆمانـــــــە خۆشەویستی هەمـــووانە
یاری چیەکانی شـــێرن هەموو مەردو دلێـــــرن
بۆ ئێمە جێی شانـــازین هەمووومان لێیان رازیـــن
یاری خۆشـــمان بۆ دەکەن وەکوو شێر هەڵمەت دەبەن
کوڕو کاڵ رەحـــــیماوە هەموو لێیان ئـــــالاوە
لەگەڵ ئاسۆ وەك بـــــرا نەکەونە قڕە و هـــــەرا
ئیتر هەربژی ئـــــاری تووشی نەبیٚ بێـــزاری

---

[٢٣١] - ئەم تیپی ئارییە لەگەڵ تیپی ئاسۆدا کە هەردووك لە لاوەکـانی رەحیمـاوا پێکهـاتبوون جاروبـار بەرانبـەر یـەکتر یاریان دەکرد دیار بوو هەندیٚ جا دەبوو بە هەرا لە نێوان یاریچییەکاندا لەسەر داوای یەکیٚ لەو یاریچیانەی تیپـی ئـاری ئەم چەند دێڕەم وەکو ( تشجیع ) بۆ تیپی ناوبراو لە بەرواری ٢/٣/٢٠٠٠ی. زاینی وتووە.

## (بۆ کۆچی دوایی شێخ جەماڵ)([٢٣٢])

ئاسمانی هەولێر خەم دەبــارێنـــێ

دیسان لێشاوی فرمێســـکە رژێنێ

شین و گریان و ڕۆ ڕۆ پەیـــــابوو

لە خانەوادەی بەرزنجە هـــــــەموو

ئەمڕۆ باری کرد شــادی و خۆشـیم

ڕووخسارم شـێوا لە ناو چووگەشیم

کاتێ کەبیسـتم مەرگی شێخ جەماڵ

کەوتمە ناو دەریای مەینەتوخەیاڵ

چونکە لە ناکاو لە دەسمان دەرچوو

داخی بە جەرگم هێشـــتاکە زووبوو

بەراستی ئێشێ ســـەخت و گـرانە

شینی خســـــتە ناو خزم و بێگانە

ڕووحی هەڵفری بۆ باخی بەهەشـــــت

لە خزمەت باری کەوتە سەیرو گەشت

ئێمەی بەجێهێشت بۆ جەوری ڕۆژگار

ئەسرین بڕژێنیـــن وەك لێزمەی بوهار

(هەوری) لە دوای ئەو شادی مەحاڵە

دونیای لەبەر چــــاو پووچ و بوتاڵە

---

[٢٣٢] - بە هۆی کۆچی دوایی جەماڵی خاڵە شێخ سەید گوڵ بەرزنجی لە هەولێر لە ٢٠٠٠/٢/١١ ی. زایینی وتراوە.

## (بۆ مەلاسەید عەبدورەحمان)([٢٣٣])

بۆ خزمەت مەلا سەید عەبدورەحمان
ئاگەدارت بێ حەزرەتی یـــــــەزدان
برای بەنرخ و زۆر خۆشەویســـــتم
یادت وا لە ناو کانگای هەســـــتم
جەژنی قوربـــانت پیرۆز بێ یاخوا
خۆت تەمەن درێژماڵیشـــت ئـــاوا
سەلاّوو رێزیّ زۆر وەکـوو لێشـــاو
بۆت رەوانەکەم ئـەی گلێنەی چـاو
پرسیاری ژین و ژیـــانت دەکـــەم
بە هیوام هەرگیز تـووشت نەبێ خـەم
هەموودەم ژینت سەربەرزو گوشاد
دوژمنت یاخوا عومــری بێ بەرباد
رێزو حورمەتم بۆ مـــــاڵ و خێزان
هەم بۆ ئەحباب و بۆ دۆســـت و یاران
بڕواکـــە قوربان هـــەر لە خـــەیاڵی
چونکە لەلای من خـــاوەن کەمـــاڵی
هەمیشـــە جێگەت وا لە ناو دڵــە
لە دووریت ناڵەم وەکوو بولـــبولە

---

[٢٣٣] - ئەم نامە شیعرییە بۆ برای بەڕێز مامۆستا مەلا سەید عەبدورڵرەحمانی مەلا سەید مەحموود بەرزنجی ئیمام و خوتبەخوێنی مزگەوتی ناحیەی بنەسلاّوە لە هەولێر بە هۆی جەژنی قوربانی پیرۆزە لە ٢٠٠٠/٣/١٧ی. زایینی وتراوە.

خاڵە ئەگەر تۆش پرسیارمان دەکەی
زۆر چاکین سوپاس بۆ خـالقی حەی

ـەرگای رەحمــــەتمان بۆ بکاتەوە
ئەم خەم و دەردە گشـــت بباتەوە

دونیا زۆر وشـــکە بەبێ بوهـارین
چاوەڕێی رەحمەت حەزرەتـی بارین

ئیتر هەر بژی ئەی نووری دیــدەم
(هەوری) یادی تۆ دەکا هەموو دەم

## (بۆ بەڕێز کاک سەید صاڵح)([٢٣٤])

بۆ کاک سەید صاڵح برای زۆر بەڕێز
دووربی لەفیتنەی پیاوی شەڕەنگێز
سڵاو و ڕێزیٚ زۆر و بیٚ شـوومـار
بۆتی دەنێرم ئەی برای هۆشـــیار
هەردەم پرســــــیاری ژیـان دەکەم
بە هیوام هەرگیز تووشـت نەبیٚ خەم
بە ڕۆژ بە شادی بە شەو بەختیار
سەردانەوێنیٚ لـە ئاسـتت ڕۆژگار
دوژمنت هەردەم کزو زەلیـــــل بیٚ
لەناو سوپای خەم هەمیشە دیـل بیٚ
ڕێزو حورمـەتم بۆ گشت خێزانت
تایبەت سـلاوم بۆ کورەکانـــــت
کاکە ئەگەر تـۆش دەپرســـی حاڵم
بە گشتی چاکـین خۆم و منـــــاڵم
هەم چاکە خزمو دۆستو ناسیار
دورن لـە جەورو مەینەتی ڕۆژگار
راسـپاردەیەکم وت بەسەی حەسـەن
ئەگەر لەلای تۆ جـوانە و پەســـەن

[٢٣٤] - ئەم نامە شیعرییە بۆ برای بەڕێز کاک سەید صالح سەید عەبدولرەحمان کەخەڵکی دێی ( خان گەشە )یە سەر بە ناحیەی قەرەهەنجیر و ئێستا لە کۆمەڵگای ( بنەسڵاوە ) یە لە هەولێر، لە ٢٠٠٠/٥/٢ ی. زاینی وتراوە.

هەوڵم بۆ بدە وەك خزمێكی چـاك
ئەجرت ون نابێ لای یەزدانی تاك
ئەم نامەم نووسی من بـە شێوەیـــە
ئارەزووی شـیعرت دەزانم هــــەیە
ئیتر هەر بژی و هەر بەختـەوەربـی
نزمی نەبینی هەردەم سـەروەربی
هەرچەندە (هەوری) ئەمڕۆ لێتدووره
بڕوا كە ئازیـز دڵ لـــــە حزووره

## (گیرۆدەی تەوقی)

گیرۆدەی تەوقی جەوری رۆژگـارم
رەهەندەی دەستی پیاوی بەدکارم

مەینەت و ئازار هەردەم هاودەمــــە
لە هەر چوار لاوە دەســـتە و یەخەمە

لەم ژینە کورتە زۆر ســـزام دیوە
زۆر رێگەی تووش و سەختم بڕیوە

زۆر جار بە ناحـــــەق دڵـم شکاوە
پشتم لەژێر بار خــــەفـەت چەماوە

گەلێ فرمێسکی حەســـرەتم ڕژان ٠
جەرگ و دڵ وەکو کەباب دەبـرژان

زۆرکەرەت لەدەس ئینـسانی نامەرد
دڵ و دەروونم پڕ دەبـوو لـــە دەرد

زۆر پەلم بۆ هات لـە نیزیکی خۆم
ئیستاش لە تـاوی زارو رەنجەڕۆم

زۆرجار بێهوودە ئـــارەزوو ویسـتم
رۆژگار فڕاندی خێرا لـــە دەســـتم

خۆشی دونـیاشم گەلێ بینیـــووە
لەم باخچـەی ژینە شادیم نۆشیوە

بەبێ دەردو خەم وەك مــــەلی باڵدار
دوور لە مەینەت و جـــەوری رۆژگار

بەلام بێگومان هــەردوو هەر دەروا
(هەوری)ئەوەی چـوونابیتەوەدوا

(پێنج خشتەکی کاک بەختیار ئەحمەد شوکری شاعیر)

## (لەسەر غەزەلێکی هەوری)([٢٣٥])

بۆ هەوڵ نادەن تاکـــــوو رزگار بن
بۆ هەموومانە نەمان و مـــــــــردن
بێ جیاوازییە بۆ پیـــــاوو بۆ ژن
زڕەی زنجیری کەلـــەبچەی دوژمن
یا ورشەی پەتی قەنارەی گـــەردن

یا خوود زۆرداری زوڵـــــم و نادادی
لە مۆخ دەرناکا گەلم قـــــــەت یادی
لە ناو دڵی من جێگیرە شـــــــادی
لام نادا لەســـــــــەر رێگەی ئازادی
یەك تۆزقاڵ تەئسیر ناکاتە ســەر من

ئەم کـــــــــردارانە ورەم بۆ دێـــنێ
کارم تێ ناکـــــاو من نـــــارووخێنێ
رۆژی هەزار کـــــەس بـــــا بخنکێنێ
دوژمن با دەســــــتی خۆی بوەشێنێ
خوێن برژێنێ وەك دەریــــای بێ بن

[٢٣٥] - ئەم پارچە شیعرەی (هەوری) لەلایەن مامۆستا بەختیار ئەحمەد شوکری کراوە بە پێنج خشتەکی لە ٢٠٠٠/٨/٢٤ کـە کاتی خۆی لە بەندیخانەی (معتقل)ی کەرکووك لە ساڵی ١٩٦٥ی. زاینی وتراوە.

ئەگەر دەتــەوێ ڕێگاکــــــە ببڕی
ترسی پێنـــاوێ دیارە هەر دەمـری
بە دوژمن بڵـێ ڕێگــــاکەش بگری
ناتوانی هەســـــتی ئازادی بسڕی
بەگوللە سینە گــەر بکەی کون کون

گەر بە واتەم کەی تـۆ خێرا هەستی
لە من تێ بگەی خـاوەنی هەســتی
زۆر بە ئاسانی دەگـاتە دەســـــتی
میللەت بیەوێ ژینـی سەربــەستی
بەردەمی ئاگری شـــــووڕای ئاسن

خۆتیش گەلێکی چوست و لـە باری
زۆر تێگەیشتووی گەلێ هۆشــیاری
زۆریشت دیوە زوڵــــم و زۆرداری
ئەو گەلەی گرتی ڕێگــــەی ڕزگاری
گەیشتە ئاوات وەك مەردی مـــــەزن

پێکەنە مەگری بەسیە لــووره لوور
بڕێژە سەر خاك خێرا خوێنی سوور
هەنگاو هەڵێنە نیزیك کە ڕێـی دوور
هەردەبێ بڕوا شــەوگاری دەیجوور
دەرچێ هەتاوی ڕۆژی ســـەرکەوتن

هاوارکە بڵێ گەلێ شـــــوێن گەرام
بۆچی سەربەستی لەمن بوو حـــەرام
بڵێ خاوەنی شەڕی بەر ســــــەرام
ئەم گەلەش رۆژێ دەگـــــا بەمەرام
کۆتایی هەر دێ زوڵم و خوێن رشتن

برا گوێ بگرە باسی دەکــــــەم بۆت
رۆژێ هەر دەبێ لاچێ دەردو ســـۆت
(بەختیار) ناترسی لە زنجیر وکـــۆت
(هەوری) تۆش لەگەڵ برایانی خـۆت
قەڵای زۆرداران وێران کەن لـــــە بن

## (بۆ تەکیەی شێخ لەتیف بەرزنجی)[٢٣٦]

ئیلاهی ئـاوەدان بیٚ ئەو مەقـــــامە
بە راستی تـەکیەی خۆش‌و تەمــامە
که جێگەی تاعەت و زکری خودایە
هەمیشە دیارە ئەجری بەردەوامــە
بەرەنجی ئەهلی خێربوو هاتــەکــایە
سوپاس بۆخوا بەجێهات ئـەومەرامە
هەموودەم یادی خوا دەکریٚ لەوێدا
چە قورئانە چە نوێژە چە قیامـــــە
مەلەك سەف سەف لەویٚ دایم بەنۆرە
کە (الا الله) یەقین ئاخر کەلامـــــــە
لە کاتی زیکرو تیغ بــــازی لەوێیە
جەنابی شێخ محێدین خۆی ئیمامە[٢٣٧]
خودایە بەر قــەرار بیٚ ئەم مەکانـــــە
منیش (هەوری)کەوا دەستەودوعامە

---

[٢٣٦] - ئەم شیعرە بە هۆی دروستکردنی تەکیەی شێخ لەتیف شێخ تـاهیر بەرزنجی نومەرە گـەدەیی لـە گـەڕەکی شـۆریجەی کەرکووك لە ٢٠٠٠/٩/٩ی.زاینی وتراوە.

[٢٣٧] - مەبەست لە جەنابی شێخ محێدینی (قوولەی) کەرکووك ١٧٢٠- ١٧٨١ی. ز.

## (دیسان رەهەندەی)([٢٣٨])

دیسان رەهــەندی دەستی نامەردم
گیرۆدەی جـەوری هــەزاران دەردم

هەر ساتێ خەمێ روو دەکاتە لام
زۆر بێ ئیقبال‌و نزیکە بــــــەلاّم

گوناهم چییـــە هەردەم دووچـــارم
هەر تاو بە دەردێ مـــن گرفتـــارم

بۆ کەس نەمبــووە یەك زەرە زیان
لەغەیری چاکـە بەدەست و زوبان

[٢٣٨] - جارێ لە نووسینگەی خۆم لەگەلٚ چەند هاورِییەکم دانیشتبووم لە ناکاوێ کابرایـەکی قەلـەوی ورگـن جانتایـەکی بچووکی بە دەستەوە بوو خۆی کرد بە ژووراو بە عەرەبی وتی کامەتان شێخ عوبێدە، منیش وتم فەرموو مـنم وتـی برایـنـە بچنە دەرەوە من ئیشم بەم برایە هەیە، لەو کاتەدا کاك ئەوزاد کوری وەستا حەسەن لەوێ بوو تووەمز دەیناسی کـە ئەمـە مفەومز ئەمنە دەس بەجێ وتی ئەبوو فلاّن من کەفالەتی ئەم پیاوە دەکەم هەر لە دیناری تــا بیــست ملیـۆن، وتــی کاکـە ئەوزاد تۆ حەقت ئەبێ ئەمە مەسەلەی پارە نییە و گوێ لە قسەکانی رانەگرت ئەویش ناچــار بــوو بــچێتە دەرەوە نــە نجا دەرگاکەی گرت و وتی چەند پرسیارێکت لێ دەکەم ئەگەر بەراستی وەلام بدەیتەوە ئــەوە خــۆت قــازانج دەکــەی وە گــەرنا تووشی زیان دەبی منیش وتم فەرموو، وتی تۆ جەماعەتی هەولێر دێنە لات تو زانیاریان دەربــارەی حکومــەت دەدەیــتێ و پەیوەندی راستەوخۆت لەگەلیان هەیە منیش وتم چ جۆرە زانیاری خۆ ئێستا ئەم خەلکە رۆژانە دەچنە هەولێرو سلێمانی و لەوێشەوە خەلك دێتە ئێرەو دەچێتە بەغداو هــەموو شــوێنێکی تــر ئەمــەو ســەرەرای ئــەوەش هــەموو شــتێ لــە رادیــۆ و تەلەفزیۆن بلاو دەکرێتەوە ئیتر من دەبێ چ زانیاری بنێرم بۆ ئەوان چەند پرسیارێکی تر کرد و بەلاّم بێسوود بوو نــە نجا وتی لەگەلٚ تۆدا فایدەی نییە ئەوە دوێنێ کابرایەکی وەك تۆمان گرت هیچی ئەوت ئەوەندەمان لێدا تامرد کابرایەکی تر چەند رۆژ لەمەوبەر بیست سالە حوکمی خوارد منیش وتم بەلێ ئێوە ئەمنتان پێ دەلێن پارێزگاری ولاّت دەکەن لــە پیــاو خراپ و ناژاوەچی واجیباتی خۆتانە کە خەلك دەگرن و بەری دەدەن ئیتر بۆ منی بۆ دەگێرِیەوە وتی لەگەلٚ تــۆ قــسەکردن بێ سوودە بەیانی لە دائیرە دەبێ بە شەق ئیعتیراف بکەی ئەمەی وت و رۆیشت، ئیتر منیش هاتمەوە بۆ مالٚ دەس بەجێ لــە مالەوە تەلەفۆنم بۆ حاکم شێخ یوسف کرد ئەویش بۆ ئێوارەکەی هات بۆ لام منیش مەسەلەکەم بۆ گێرِایەوە وتی خــۆت ون کە تا خۆم ئاگادارت دەکەمەوە، منیش چەن رۆژێ خۆم بزر کرد تا شێخ یوسف شتەکەی بۆم پینە کرد و جوابی نارد وتی بــا بگەرێتەوە سەر ئیشەکەی لە دوای لیکۆلینەوەیەکی زۆر بۆ مان روو بۆوە کە کابرایەکی بیانی بــە نــاو عــەدنان راپــۆرتی لەسەرم نووسیوە دواتر هاورِییەکی خۆی هاتە لام و وتی عەدنان راپۆرتی لەسەرت نووسیوەو بــە ئــەبو فــلان دا کــە هــەر شتێکت بۆ بدۆزنەوەو بتگرن. منیش ئەم پارچە شیعرە لە رۆژی ١٢/١٢/٢٠٠٠ ی.ز بەو هۆیەوە وتراوە.

کەچی تێناگەم بۆ پیـــاوی بەدکار
لەپێم ئالأوە هەروەکـــوو رەشمـار

عومرم لــە دەوروبەری شەستـایە
بێجگە لــە مەینەت نیمە سەرمایە

رۆژیَ دور نەبوم لەجەوری رۆژگار
دایم ئالوودەی نـاو دەردی ئـــازار

خەفەت هەموودەم دەس لەگەردنە
هەروەك شەپۆلی سوپای دوژمنــە

دەمێکە لە ژێـــــر باریَ گرانـــــم
لەگەڵ رۆژگاردا هـــــەر لە زۆرانـم

## (بۆ تەكیەی شێخ نورەدین بەرزنجی)[٢٢٩]

خودایە ئاوەدان بێ ئەم مەكـــانە
هەتا دەورانی ماوە ئەم زەمانـــــە

كە جێگەی زیكرو تەقوایی خــــودایە
مەلەك سەف سەف لەوێ دیارە عەیانە

هەموودەم یادی خوا دەكرێ لەوێدا
سەدای (الله اكبر) تا بـــــەیـــــان

بەڵێ جێگایێ زۆر پیــرۆزو خۆشـــە
لەلای ئەهلی (تەســـــەووف) تۆ بزانـە

دەمێ بوو چاوەڕوان بووین بێتەكایە
سوپاس بۆ خوا تــەواو بوو بەم زوانە

بەهەوڵ وكۆششی شێخ نورەدین بوو
لەگەڵ جەمعی براو مەحسووبەكانــە

وەرە (هەوری) لە مەودوا روو لە خواكە
لەوێدا گۆشەگیر دوور لەم ژیـــــانــە

---

[٢٢٩] - ئەم شیعرەم بە هۆی دروست كردنی تەكیەی شێخ نورەدین شێخ لەتیف بەرزنجی گلەزەردی لـە كۆمـەڵگای دارەتـووی هەولێر لە ٢٠٠١/٩/١٤ ی. زاینی وتراوە.

## (بۆ كاك شێخ لەتیف بەرزنجی)([٢٤٠])

شێخ لەتیف ئەی خانەدانی موحتەرەم
وەسفی چاكەی تۆ ئەبەد ناكرێ بەدەم
من لە جیاتی خۆم و گشت خزمێ دەڵـێم
سەدكەڕەت پیرۆزبێ لێت كورسی و قەڵەم
زۆر دەمێكە تۆ لەبۆ كورد هەوڵ ئەدەی
رەبی قەت تووشت نەبێ جەورو نـەدەم
دەوری خۆت بینیوە تۆ لـەم وەختـــەدا
قەت لە تۆ چەوتی نییە هـیچ زیادو كـەم
چەرخی گەردون هەر لەبـەر تۆدا نەوێ
پایەدار بی هەر بە وێنەی شاهی جـەم([٢٤١])
تۆ لە نەسڵی ئالی پاكی حــــــەیدەری ([٢٤٢])
دوژمنت دووچاربێ هەردەم دڵ بــــەخەم
روو لەلات دێم گەرخودا حەزكا جەناب
من لە بۆ لای غەیرە ناچـــم یەك قەدەم

---

[٢٤٠] - ئەم شیعرەم بۆ برای بەڕێز دكتۆر شێخ لەتیف بەرزنجی بە هۆی وەرگرتنی پلەی ئەندام پەرلەمانی لە حكومەتی هەرێمی كوردستان لە ٢/٩/٢٠٠١ی. زاینی وتووە

[٢٤١] - شاهی جەم- مەبەست لە جەمشید یەكێكە لە شاهە كۆنەكانی ئێران

[٢٤٢] - حەیدەری- كەواتە ئەوەی ئیمامی عەلی كوڕی ئەبوو تالیب كە لە ئازایەتی و زانیاری دا كەم وێنە بووە.

## (ئەم کەونە)

ئەم کەونە خەڵقی خـــودای ئەعزەمە
هێنایە وجوود گشـــت ئەم عالـــەمە

دروستی کردووە چەن جۆرە مەخلووق
هەمووی لە نەسڵی نەبی ئادەمـــــــە

ئەرزو ئاسمان و چیــــــاو دەریـــا
هەر خۆی خاوەنی هێـــزو کەرەمـــە

بەرنامەی ژینی داڕشـــتووە بۆمـــــان
ڕۆژ و مانگ و ساڵ بـــێ زیادوو کەمـــە

بەشەری خەلق کردوە بۆتاعەتکــردن
نەك هەر خەریك بێ بە گاڵتە گەمــــە

لە پاشـــان یەقین لێت دەپـــرســـنەوە
گـــەر وشیار نەبی جێت جەهەننەمـــە

عومرێکی کورتە خۆت روو زەردمەکە
ژیان چەن ڕۆژەو روو لە عەدەمـــــە

ئەم وەختە بۆ تـــۆ فرســەتە قوربـان
بە فیڕۆی نەدەی جـــومعە یا شەممـە

(هەوری) تۆ خەمی حاڵی خۆت بـخۆ
فرمێسکی دیدەت وەك سەیلی چەمـە

٢٠٠١/١٠/١٢

## ( ئەی کەوی جوان)

ئەی کـــەوی جوانی هەژار
ئێسك سووکی بەهرەدار
خۆزگا بمزانی بـــــــایە
کەچی لە دڵـــــــت دایە
کاتێ کــــە دەخوێنی توو
زۆر بە شەوق و ئارەزوو
لەقەد چیاو لەســــەر بەرد
لە ترسی راوچی نامـەرد
دووری لە ئاوەدانــــــــی
سەربەســـت و کامەرانی
بەڵام هەرهاوخوێنی خۆت
داوی حازر کردووەبـۆت
زۆر وریای توو ئاگـــادار
لە فێڵی پیــاوی بەدکار
دەخوێنی ئاوازی خــۆش
تۆش دڵت دێتە خرۆش
بۆ لای دەچی بە پەلـــــە
پێوە دەبی ئەو حــــەلە
ئیتر بێ یارو هــــاو دەس
دەتهاونە ناو قــــەفەس
ئەنجا ژینی ئەســــــیری
لەگەڵ خـــەم ئێخەگیری
ســـــوودی نییە دادو رۆ
زەحمەتە رزگـــــاری تۆ
بۆچ ئــــەوەندە کەم فامی
هەڵەشــــــەو بێ ئارامی
هەموو کات زۆر لەسەرخۆ
هەنگاو بـــە هەنگاو برۆ
سەر دەکـــــەوێ لە ژیان
قەت توو شت نابێ زیان
هەر بەلایێ کـــــــە هەیە
گشـــــتی کاری پەلەیە
گەر بێت و لەســـەرخۆبی
مەحــــــاڵە رەنجەرۆبی

٢٠٠١/١١/٢٧

## ( بۆ منالآن)

ئەی منالە خوێن گەرمەکـــان      ئەی لێو ئالە پڕ شەرمەکان
پێکەنن ئەمڕۆ شادییــــــــــە      وا رزگاری بوو کوردستـــان
کوڕو کچ خێرا بۆ مـــــەکتەب      بگەنە کاروانی ژیــــــــــان
دەس خەنە ناو دەستی یەکتر      هەموودەم لە هەوڵ وتەکـان
وەکو پەپوولەی رەنـگاوڕەنگ      کە دەگەڕێ لە دووی گـولآن
ئێوەش کە نـــەوەی دوا رۆژن      پێویستە زوو بچنە مەیـدان
ژیان تێکۆشـــــــــــانی دەوێ      دامەنیشن دەستەوەستـــان

## (كوردستان ناوت)

کوردستان ناوت شــــرینه لای من
چونکه وەك تیره بۆ جەرگی دوژمن
شاخت سەنـــگـەره رۆژی تەنگانه
تۆ دەپارێزی لـــــه رووی بێگانه
رووبارت چەشنی جۆگەی کەوسەره
خاکت ئیکسیره بــــەردی گەوهەره
کانگایێ نەوت و بەردو ئەڵمـــاسی
کەچی بەم جۆره کزو کەســــاسی
ناو دۆڵ و گویێ چەم هەموو دارستان
دەشتاییت جێگەی باخات و بێستان
برنج و نیســـك و نۆك و گەنم وجۆ
ماست و پەنیر و کەشك و کەرەو دۆ
خۆ میوەهاتت بــه هـــــەزار جـۆره
باسی ناکـــــــرێ ئەوەنــــده زۆره
هەنجیرو هەرمێ هەم ترێ و هــەنـار
هەڵووژەو ســێوو زەردەلوی بـوهار
بەلام چە فایـــــــده میللەتی خۆ خۆر
هەرکەس بۆ لای خۆی دەیکێشی بەزۆر
پیاوی دڵسۆزو نیشــتمان پــەروەر
زۆر کەمە لە ناو کوردی قوڕ بـەسەر

کەس کـــوردایەتی لە یاد نـــــەماوە
هەمـــــوو بۆ پارە جەرگی ســووتاوە
چونکە بێگانەی بەدخـــوو کەوتەناو
دین و رەوشتی لێ ســـەندین تەواو
ئەگـــــەر وا بڕوا دووا رۆژمـــان تارە
ئەمڕۆ کار بەدەســـــت پیاوی بەدکارە
ئەوەی دەســـدارە هەر هەڵمەت دەبا
هەژاریش رەنـــجـــی چووە بە هەبا
دوژمن وەك گورگ دەوری لـــێ دوایـن
ئێمەش هێشـــتا هەر بێ تین و خاوین
گەر دەســـتی دزو جەردە زوو نەبڕن
پیاوی خوێنخۆرو خائین سەر نەبڕن
بێگومان حاڵمـــــان خـــــراپتر دەبێ
زەحمەت کـــــاروانمان زوو بگاتەجێ

٢٠٠٢/٧/٢

## ( بۆ كۆچی دوایی جەناب خاڵە شێخ كاكە) ([٢٤٣])

هەولێر سەرانســـەر كزو خەمناكە
بۆ كۆچی دوایی خاڵە شێـخ كاكــە
دەرۆێشی هەژاردڵ تەنگ‌وخەمگین
سەیری گریانی شێخ و مەلاكـــــە
تەكیەو مزگەوتەی بێدەنگ‌و خامۆش
خزمان‌و مەحسوب گشت سـینەچاكە
وەك چرا وابوو بۆ دینی ئیـــسلام
لەناو ساداتی بـــەرزنجە تاكـــــە
ئێمەی بەجێهێشت ناو شین و زاری
ئێستا لە خزمەت شاهی لەولاكـــە
رووح و وجوودی وا لە ئاســـــمان
ئەگەرچی جەستەی وا لە ژێـرخاكە
شۆڕە سوارەكەی دەشتەكەی قەراج
گەیشتە مەنزل ماندوو و هیلاكـــە
مەلەك سەفبەسەف وەستا لەحزوور
هەموو لە خزمەت ئەو زاتــە پاكـــە
(هەوری) لەدوای ئەو بۆ چیتە ژیان
وەرە تۆ ش ئیتر تەركی دونیاكـــە

---

[٢٤٣] - بە بۆنەی كۆچی دوایی خوالێخۆش بوو جەنابی خاڵە شێخ كاكەی شێخ عەبدولكەریمی دارەخورمای سەر بە هەولێرە ٢٧/١٢/٢٠٠٢ی.زاینی وتراوە.

## (کەرکووك)

کەرکووك ئەی قیبلەگاهی کورد
چاوی لێتە درشـــــت و ورد

ئەی شـــــاری دێرینی جوان
خۆتی نۆ بووکی کوردستـــان

ناوی تۆ هەردەم لە یــــــادە
تۆ نەبی ژیـنمان بەربـــــادە

خاوەن گلێپـــــەی باوەگوڕگوڕ
رووباری خاسەت سەرومـــــڕ

چەند ساڵـــــە تۆ هەر ئەسیری
لە ژێر چنگی دوژمن گیـــری

هەزاران قوربــــــانیت داوە
زۆر خوێنی گەشــــت رژاوە

چەندین تێکۆشەرانـــــی مەرد
شەهید بوون بەگوللەی نامەرد

ئێمەش لەسەر ئەو رێبـــــازە
لانادەین بۆ ئـــــــــەم مرازە

ناوت پیرۆزە لە مێـــــــــژوو
مەڵبەندی کوردانی ئەتـــوو

جاریٚ باوە گەورەی پێشـــوو
وتەیی زۆر جوانی فەرمـــوو

هەتا ئەمڕۆ لە زارمـــــــانە
کەرکووك دڵی کوردستانـــە

٢٠٠٣/٣/٤

## (هێزی پۆلیسی)[٢٤٤]

بژی ئەفسەرو هەم هێزی پۆلیس
چەکوشی سەری پیاوانی دڵپیس
مایەی رووناکی دوا رۆژی کوردن
هەموو چالاك و دلێرو مەردن
ئێوەن پارێزگار نیشتمان و گەل
لە خۆ فرۆش و پیاوی تەوەزەل
مەزڵوومو هەژار پیاوی سەرشکاو
ئەوانەی کەوا ماڵ و ماف خوراو
چاوەڕێی دەست و مەقامی ئێوەن
مافیان وەرگرن دڵیان شاد بکەن
ئێوە بەڕاستی بەرپرسیارن
لە راست میللەت و یاسا دیارن
دەبێ هەروەکو شێر هەڵمەت بەرن
دزو خائینان گشت لە ناو بەرن
نەبنە پشتیوان بۆ پیاوی نامەرد
لەراست حەق نەکەن بترسن بەقەرد
بەم کارە دەبنە کەسێکی رێزدار
گەشاوەدەبن وەك خونچەی بوهار
ئەگینا لای خواو یاسا مەسئوولن
لە رۆژی حیساب کزو مەلوولن
(هەوری) تۆ زۆر جا مافت خوراوە
هیچ کەسێ بۆ تۆ هەوڵی نەداوە

---

[٢٤٤] - ئەم شیعرە لە سەر داوای ئەفسەرێ بۆ کۆلیژی پۆلیسی هەولێر وتراوە لەوێش خوێندراوەتەوە لە ٢٠٠٢/٨/٢٨ ی. ز.

## (ژیان هەر خەم و خەیاڵ)

ژیان هەر خەم و خەیـــاڵ
رۆژو هەفتەو مانگ و ساڵ

ئیشی قەت رێك ناکـــەوێ
وەکوو کورتانی دەجـــاڵ

بەزمی دونیا زۆر سەیـــرە
گاهـ شرینە گاهێ تـــــاڵ

کردەوەی هەموو عەکســـە
بۆ پیاوی خاوەن کەمـــاڵ

گێژێ دەکا بە ئەمــــــیر
شاهێ دەکا بە حەممـــاڵ

کوێرێ دەکا بە رابـــــەر
چاوساغێ دەخاتە چـــاڵ

وشك و بێ ئاوە لالــــــە
پاراو دەکـــــا درك و داڵ

بولبول ئەسیری قەفـــەس
بێ خەمە ســـــەرگەڕ داڵ

بێ نازو برسی کـــەوتوون
چەن نازداری روو بــەخاڵ

دونیایەکی هـــیچ و پووچ
وەکوو خانووچکەی مناڵ

(هەوری) خـەمی لێ مەخۆ
دەڕوا سابە هەر ئەحـــواڵ

٢٠٠٣/٩/٢

## (ئەم ئالاّ جوانە)([٢٤٥])

ئەم ئالاّ جوانە دەشـــــــەكێتەوە
دڵی پیرو لاو دەگەشـــــــێتــەوە
هەر چەن دەیبینم مــن لەوئاسمانە
کەفەخــرو سـیمای قەومی کوردانە
لەچەن جۆرە رەنگ کـە پێکهاتووە
ئەم ئالاّ جوانەی لیّ پـــەیدا بـووە
رەنگی سووریانی خوێنی شەهیدان
کە گیانی بەخشی لەرێی نیشتمـان
سپی نیشـــــانەی ئاشتی ولاّتـــە
هەم تێکۆشـــــان و هەولّوخەباتە
سەوزەکـەی یانی ئەم خاکە جوانە
جێی بـەروبووم و خەلەو خەرمانـە
زەردەکەی مانای رزگـــــاری گەلە
خۆرِی هەلاّتووی ئاسۆی دەم کەلە
پێویسـتە هەمـوو بەدلّ و بە گیان
بــی پارێزین وەك بیلبیلەی چاوان
نەهێڵین دوژمن دەســـتی بۆ بێنیّ
شێوی شیرینی تێـــك بشـــێوێنیّ

---

[٢٤٥] - بە هۆی بەرزکردنەوەی ئالاّی کوردستان لە چەند شوێنیّ لە شاری کەرکووك لە ٢٠٠٢/١٠/١١ی.زاینی وتراوە.

## (بۆ رۆژی یەکی شوبات)[٢٤٦]

شارە شیرینەکـــــەی قەڵاو مـــنارە
ئەمڕۆ کە گەلێ پەســـت و خەمبارە
پەڵـــە هەورێکی زۆر رەش و چڵکن
شـــادی و گوشـادی دەرهێنا لەبــن
دەستێکی رەشـــی پیسی قین لە دڵ
پچڕاندی چەندین خونچەی سەرچڵ
شـــاری هەولێری کرد بە کـــــەربەلا
لە هـــەموو لاوە شـــــین و واوەیـــلا
ئەم گەردەلوولـــەی ئەمڕۆ هەڵیـکرد
شەوق و زینەتی کـــوردی لەناوبرد
جەژنی قوربـــانی گۆڕی بە گـــــریان
خەفەت دایپـــۆشی هەمووکوردستان
چەندین ئینســـانی مەردوتێکۆشەر
ئەمڕۆ کە خوێنیـــان رژا بە هـــەدەر
نامەردان دەستی گڵاویـــــان وەشـــان
ناوخۆیان رەشکرد لەمێژووی جیهان
هەتـــاکوو رۆژگــــــار دەوری بمێنێ
کورد وەکوو باوەگـــــوڕگوڕ ئەمێنێ

---

[٢٤٦] - لە شاری هەولێر لە رۆژی یەکی شوبات ساڵی ٢٠٠٤ ی. زاینی لە بارەگاکانی حیزبە کوردیەکاندا چەند بەرپرسێکی حیزبی و حکومی بەبۆنەی جەژنە پیرۆزە کۆ بوو بوونەوە لەو کاتەدا خۆکوژێکی عەرەب لە ناویان خۆی تەقاندەوە بە هۆی ئەم کارە نامەردانەیەوە چەند سەرکردەیەکی ناوداری کورد تێدا شەهید بوو لەوانە کاك سامی عەبدولڕەحمان و کاك شەوکەت شێخ یەزدین و کاك سەعد عەبدوڵلا و چەند هاووڵاتی بی تاوان. کاروانی رزگاریخوازی کورد بەم جۆرە کردەوانە دوا ناکەوێ تەنها روو رەشی بۆ شۆڤینەیەکان دەمێنێتەوە ٢/٢/٢٠٠٤ی ز. وتراوە

نە ئەنفال کردن نـــــە کیمیا بــاران

تۆزقاڵێ گەلێ کوردی نـــەترســـــان

زیندان و کوشتن گۆڕی بە کۆمـــــەڵ

بەئێمە زیاتر دەبەخشێ ئەمـــــــەل

تیرۆریستی بەد نا مەردی ترســـــنۆك

دەبێ هەر کاڵەك بشـــــکێنێ بـــەچۆك[٢٤٧]

گەلی کورد گەلێ شــــــەهیدی داوە

ڕێگەی ڕزگاری قـــــەت بەرنـــەداوە

شەوە زەنگ ڕۆیی دەمــــــــەو بەیانە

کزی و ڕوو ڕەشی بـــــــۆ دوژمنانـــە

چرای ئـــــــاواتی زۆر جار کز بووە

بەڵام ئیرادەی هـــــــەردەم زیندووە

[٢٤٧] - ئەم نیوە دێڕە لە پەندێکی کوردی وەرگیراوە

## (یادی جەژنی نەورۆز)[٢٤٨]

نەورۆزی ئەمساڵ خۆش و گوشادە
دوژمنی کوردان عومری بەر بـــادە
بلێسەی ئاگری گەلـــیٚ بە تاوە
جەرگی ناحەزی پیٚ داخ کـراوە
بـوهاری نویٚ مان هــاتە کایـــەوە
دەرگــای شــادی مان لـیٚ کرایـــەوە
ئەمڕۆ ئازادە وڵات ســـەرانسەر
لالەو وەنەوشە لەخاك هــاتەدەر

گـــوڵاڵەی زەردو سوور تێـــکەڵاوە
بـــەخوێنی لاوی کـــورد ئـاو دراوە
ئێستاکە شادە رووحی شەهیدان
دەبینیٚ رزگار بووە کوردســـتان
کـــوردە فرسەتە ئـــەمڕۆ یەك گرن
لـــە پێناو بستیٚ لـــەم خاکە بمرن
ئەو گەلەی ئازاد نـەبیٚ مـــردووە
تەنها هەرجەستەی دەڕوا زیندووە
ئەگەر سالاری سەر رووی زەمینی
بەبیٚ ئازادی تـــۆ هەر خەمگینـــی
کەواتە ئەمـــــڕۆ دەوری ئێمەیە
سەروەری و خۆشی لەم هەرێمەیە
ئـــیتر هەر بژی کوردو کوردستان
هـــەتاکوو دونیا تیاماوە ژیـــان

---

[٢٤٨] - بەهۆی جەژنی نەورۆزەوە ٢٠/٣/٢٠٠٤ ی. زاینی وتراوە

## (كە دێتە یادم)

کە دێتە یادم بەســــەرهاتی خــۆم
لە تاوی گەلێ زارو رەنجـــــــەڕۆم
لەگەڵ ئەم ژینە هەر لە زۆران بــووم
هەمیشە دووچار باری گران بــووم
هەر تاوێ دەردێ رووی دەکـردەلام
شادی تەوەللا خەم بوو بە ئاشـنام
ماوەیەکی زۆر هــەردەم بێوچـــان
وەستام لە دژی جــەوری دوژمــنان
لە شەستەکان بوو ســـاڵێ بەندکرام
پاشان ماوەیــی لــەناوشـۆڕش مــام
گەیمە ئێران ماوەی یەك دوو ســاڵ
لە ئـــــــاوارەیی ژیانێ زۆر تــاڵ
تــالآن کــراوە دوو کـــەرت مـــــاڵم
زۆرجــار شێـواوە حاڵ و ئـــەحواڵم
هەر لەبەر ئەوەی نۆکـــەریم نـــەکرد
کارگەی کاشیم حکومەت زەوتی کرد
زۆر بەڵگە نامەو کتێبی دەس خەت
لە رۆژگاری تاڵ سووتانی بەرکەوت
ئێستاش هەر ئاخی بۆ هەڵدەکێشم
لە تاوی هەردەم دڵ پڕ لـــــە ئێشم

زۆرم بیست قسەی ئینسـانی نامەرد
لای من پاداشتی هەرهەناسەی سەرد
چەن جارێ گیرام لەم مـاوە زۆرە
راکە راکم بوو هەردەم بە نـــۆرە
دوواجار لە ساڵی دوو هەزارو یەك
دیسان ناوی دام پیاوی بـەدنمەك
گەر شێخ یوسفی دادوەر نەبـوایە
مەعلوم تووش دەبوم من بەوبەڵایە
لەدوای ئەم هەموو جەورورەنجدانە
شتێکم نەدی من لەم گـــــۆڕانە
ئێسـتاش ئەم دەورە لێدە و بڕۆیە
بیگۆمان هەرکەس دزی گای خۆیە
رۆژگاریش تاسەر بۆهیچ کەس نابێ
با موڵکی قاروون لەژێر دەسـتیا بێ
ئەم عومرە کورتەش کۆتایی هەردێ
رۆژی دێ ئەجەل دامێنی دەگـــرێ
کرداری چاکە هەر چـاك دەنوێنــێ
کردەوەی ناشرین نـــاو دەزڕێنێ
(هەوری) تۆ کەی وا مەجبوری دنیای
بۆچی بەم جۆرە لە وشکە ریـــــایی
کەرکووک ٢٠٠٤

## (جوانی بوهار)

وا هاتەوە وەرزی بوهار　　دەشت و سارا بوو بە گوڵزار
دارو دەوەن ژیاوەوە　　کەوتە رێی کانی و جۆبار

زۆر بە شەوقە لالەو گوڵ　　پەیدا بوو خونچەی سەرچڵ
سەرماو سۆڵە وا باری کرد　　دەخوێنێ قومری و بولبول

تینی تیا نەماوە ساردی　　مەینەت بەجارێ بابردی
ئەو خەڵکە دەچن بۆ سەیران　　لە گشت لا ئاهەنگ و شادی

نێرگزی رووگەش و بێگەرد　　لەسەری ناوە تاجی زەرد
نەسرین و شەوبۆو لالەی سور　　داپۆشیوە نسارو هەرد

زۆر جوانە ئەم شاخ و دەشتە　　ئەم خاکە هەر وەك بەهەشتە
روو لە هەر شوێنێکی دەکەی　　هەموو جێی سەیران و گەشتە

لە هەرلا هەر خورەی ئاوە　　خووناو لەسەر گوڵ رژاوە
نەغمەو ئاوازی پەلەوەر　　دەژنەوی لە هەموو لاوە

(هەوری) روو کە دەشت و کۆسار　　دەوایە بۆ دڵەی بیمار
ئیتر واهات دەوری شادی　　بەس بکە شیوەن و هاوار

## (نامەیەکی شیعری)([٢٤٩])

برای زۆر ئازیـــــــز مولازم فوئاد
چاکەو پیاوەتیت قەت ناچێ لەیاد

پیاوی جوامێرو دڵسۆزی وەتـەن
رەوشت مەردانە و خاوەنی نەژاد

من داواکارم لـــــــە خزمەت باری
دووربی لە فیتنەی پیاوی بەدنیهاد

رەنج و کۆشـــــشی ژین و ژیانت
بەزایە نەچێ وەك رەنجی فەرهـاد

رێزو حورمەتی زۆر و بێ پایــان
بۆتی دەنێرم ئەی ســەروی ئازاد

برای ئازیزم ئەگەر دەپــــــرسی
سوپاس بۆخودا چاکم دڵگوشاد

پیرۆبایی پڕ ســــــــۆز و گەرم
لەتۆو لەژیان خانی وەك شمشاد([٢٥٠])

ژیانتان پڕبێ لە خۆشی وشادی
نەیێتە ڕێتان جەورو خەمو داد

بە هیوام هەردوو هەر بەختەوەربن
ناحەزتان هەردەم کـــــزو نامۆراد

---

[٢٤٩] - ئەم نامەیە شیعرییە بۆ کاك موزلام فوئاد لە هەولێر، بە هۆی ژن هێنانییەو لە ٢٠٠٤/٤/٢ ی. زایینی وتراوە.

[٢٥٠] - شمشاد – جۆرە دارێکی راست و بێ گرێیە بە زۆری شانە لەو دارە دروست دەکرێ.

## (نامەیکی شیعری)[٢٥١]

بۆ خزمەت بەڕێز خاڵە شێخ جەماڵ
پیری نوورانی ئەی خاوەن کـــەماڵ
زۆرڕێزم هەیەو دەستت ماچ دەکەم
بە هیوام توووشـــت نەبێ ژینی تاڵ
یاخوا هەموو دەم هەر بەختەوەر بێ
دوژمنت دایم شپرزەو عـــــەوداڵ
دووربی لە شـەڕی پیاوی ناڕەسەن
بڕژێ بە ســـــەرتا لوتفی زولجەلال
ئازیز ئەگەر تۆش پرسیارمان دەکەی
چاکین هەموولا گشـــــت ماڵ و مناڵ
داواکارییەکەت بەســـەر دوو چاوم
وابۆت دەنێرم هەر بـە بای شەماڵ
لەوەیە ســــــوودی لێ وەرگری تۆ
مێشك‌و هەستی پێدەبێ خۆشحاڵ
نامیلکەیێ زۆر پیرۆز و چـــاکـە
مرۆۋ دەخاتە ناو دەریای خەیـاڵ
خاڵە ببوورە گەر درەنگ گەیشـــت
(هەوری) هەمیشە پەشێوو سەرقاڵ

---

[٢٥١] - ئەم نامە شیعرییە بۆ خاڵە شێخ جەماڵی شێخ ئەحمەد بەرزنجی لە هەولێر کە داوای کتێبی (السادات البرزنجیـە)ی کرد بوو دانراوی شێخ عەبدولقادر بەرزنجی چاپی ١٩٥٦ کە باسی نەسەبی سەیدە کانی بەرزنجە دەکا بـەو هۆیـەوە لـە بەرواری ٢٠/٤/٢٠٠٤ ی. زاینی وتراوە.

## (بۆ كۆچی دوایی حەلاوەخان)([252])

کرێوە و تۆفان دیـــــسان پەیدا بوو
شاگوڵی تری لیٚ رفـــاندیــــــن زوو
تەم و مــژی چڕ رووی ئاســـمانی گرد
نامەی گوشــادی دڕی دەســــت و برد
حەلاوەخان روحی شادبو بەبەهەشت
لەخزمەت باری کەوتە سەیروگەشـت
ئێمەی بەجێهێشت گشت ماتومەلوول
نەوەی فاتیمەی زەهرای بــــــە توول
خزم و کــەس وکار ئەمڕۆ خەمبــارە
فرمێسکی چـــاومان هەروەك جۆبارە
بەڵیٚ لەم دونیـــا پووچە ئــەو دەرچوو
گەیشـــــــــتە خــزمەت باپیرانــی زوو
ئافرەتی وابوو قەت وەســـفی ناکریٚ
بەڵام هەمـــوو کەس هەر دەبیٚ بمریٚ
زۆر رەوشت بەرزو بەدیـن و چـــاك بوو
بەوێنەی ئاوی شەو روون و پـــاك بوو
ئەو بە ســەربەرزی گەیشتە لای خوا
ئێمە لـــە دوای ئەو کــــزو بیٚ نەوا
تۆ پشـــوو بدە میوانی مـــــــاندوو
تاکوو کـــاروانمان دەگــــاتە لای توو
(هەوری) کە ســاڵی وەفاتی پــرسی
ئەو دوو هەزارو چـــواری بۆ نووسی

---

[252] - ئەم پارچە شیعرە بە هۆی کۆچی دوایی حەلاوە خانی کچی خالە شێخ سەید گوڵ بەرزنجی لە هەولێر لە ٢٠٠٤/٦/١٦ی. زاینی وتراوە.

## (نامەیەکی شیعری)([٢٥٣])

بۆ هەردوو ئەحمەد فەتحوڵڵاو خەڵەف
ئاگـــــەدارتان بێ شاهەکەی نەجەف
قوربان سێ فۆرمم نـاردە خزمـــەتتان
کەچی وەڵامم نەدی سەد ئەســـــەف

هەر لە مانگی شەش ساڵی رابردوو
ئەمن بێ وچان دەکەم هات و چوو
هەر ئەمڕۆ و سبەی هەتاکوو ئێستا
لە جیاتی پاداشت ئابڕوشـــم چوو

پیاوی بێ کەلـــــك و کـــۆنە ناو زڕاو
ئەو دەورو بـــەرەی گرتـــــووە تەواو
ئیشیان جێبـــەجێ دەکرێ ئـــەوانە
هەندێ بە درۆو هــــەندێ بەماســـتاو

پیـــاوی وەك منیش هـــەر بناڵێنی
ناســـیاوێکی چاك لە کـوێ بهێنێ
با ئیتر ســـەری خۆم لەبەرد بـــدەم
بۆ من وەك یـــەکە ئەمڕۆ و دوێـنێ

[٢٥٣] - ئەم نامە شیعرییە ناراستەی دوو برای بەڕێز کراوە کە ئەو دوو جەنابەش بەرپرسی دەزگای ئـەیلولن کـاك ئەحمـەد فەتحوڵڵاو کاك ئەحمەد خەلەفن، دیارە چەند جارێ فۆرمم پڕ دەکردوو دەمناردە خزمەتیان گەلێ هاتو چۆم کـرد چـونکە کەسم لەوێ نەدەناسی سوودی نەبوو لە ٢٠٠٤/٨/٢٩ی. زاینی وتراوە.

گەڵی شەقم خوارد لەسەرکێشەی کورد
لە بەندیخانە زۆرم بەســـــــەر برد
زۆر قسەی ساردی دوژمنانم بیســـت
پەنام بۆ دەرگای نامــــــەردیٚ نەبرد

گەییمە ئێران لــە پەنـــای دوژمن
ساڵی حەفتاو پێــنج گـەرامەوە من
هەزاران دەردو پەتــپەتیٚ دیکـەش
پەنا هەردەبەم بۆ خـــــودای مەزن

گەر کەلەشـــێریش نـــــەبیٚ برادەر([٢٥٤])
رۆژ لە گەل ســـــەری هەردێنێتــە دەر
(هەوری)ئەم عومــــرە پێنج و دووڕۆژە
لەم ژینە هەموو هـــەر دەکەین گـوزەر

---

[٢٥٤] - ئەم نیوە دێڕە لە پەندێکی کوردی وەرگیراوە.

## (نامەیەکی شیعری)([255])

مامۆستای بەرێز خاڵە کەریم گیان
ڕێزو ســــــلاوێ زۆر و بێ پایان
دەنێرم لـــەگەڵ نەســـــــیمی شەماڵ
بۆ حـــزووری تۆ ئەی خـــــاوەن کەماڵ
بەهیوام مەینـــەت قەت نییێتە ڕێت
ناحەزت زەلیـــل دایم لە ژێـــر پێت
هەمیشە سەربەســـت ناودۆست وئەغیار
هەر گەشـــــــاوە بی وەك لالەی بوهـــار
ئـەنجا بابێنە سەر باســی مەبەست
بــە کورتی بڵێم نــەك درێژو خەست
هەنـــدێ چوارینـــەم بــە دەســـــتەوەیە
بـــۆ کـــوورتە بـــاســـێ پێویستی هەیــە
مەعلووم ئەو ئەرکە جێگەی سوپاسە
بۆ هەموو شتێ تاریف ئەســــــــاسە
کەسێ شك نابەم لــــــــــە تۆ بەولاوە
نان بۆ نانەوا راســــــــــــــتە وتراوە([256])
ئیتر هەمیشـــــــە سوپاس گوزارم
ڕەحمەت دەنێرم بــــــــەدڵ و زارم
گەر کەم و کـــــــــوری هەیە لـــەم نامە
کەمێکـــــم خوێنـــــدەوە نەکوو عەلامە
پێشـــــەکی قوربان دەبێ ببووری
(هەوری) شـــــێواوە قافیە و بیری

---

[255] - ئەم نامە شیعرییە بۆ بەرێز مامۆستا کەریم شارەزا لە ٢٠٠٥/١/٢ ی.زایینی وتراوە.

[256] - ئەم نیوە بەیتە لە پەندی کوردی وەرگیراوە

## (بۆ هەڵبژاردن)

کەرکووک موژدە بێ لاوت هۆشـیارە
بۆ هەڵبژاردن گشت دەس بەکـــارە

هەلێکەو ئەمڕۆ هـــاتووە بۆمـــان
دووا ڕۆژی ڕوونە دیـارە بێگومان

پێویستە لەدەس خۆی نەدەین کاکە
ئەوەی دڵسۆزە و دەروونی پاکـــە

بەرەو سەندوقی دەنگدان بە جارێ
لەهەر کوێی هەن لەدەشت یاشارێ

بەبێ ڕاوەستان ژن و پیاو هـــەموو
لـــە تۆڵەی ڕۆژی ڕەشی رابـــردوو

جیاوازی نەکەن نێـــوان ئەم و ئەو
بەسە با ئیتر ڕاپەڕیـــن لـــە خەو

بۆ بەرژەوەندی قەومـــی کوردزوبان
کەمتەرخەم مەبن دەســــتم بە داماں

٢٠٠٥/١/٢٨

## (نامەیی شیعری بۆ مەلا شاخەوان)[٢٥٧]

برای زۆر بەرێز مەلا شاخەوان
هەمودەم گەشبی وەك خونچەی بەیان
ڕێزو سلاوێ جوان و بێ شومار
دەنێرمە حزوور وەك لالەی بەیان
ئومێدەوارم هەر بەختەوەر بی
هەمیشە دووری بەلاّی ناگەهان
تەمەنت پڕ بێ لە خۆشی و شادی
قەت تووشی مەینەت نەبی لە ژیان
ئەنجا با بینە سەر باسی مەبەست
دیوانی (لوتفی) لاتە بێ گومان
نازانم بۆچی بەم جۆرە دواکەوت
هۆی چییە بەرێز بۆم بکە بەیان
وەك کوردێ دلسۆز هەم هاورێی چاك
ئەم ئیشە ئەنجام بدە برا گیان
دیارە هەمیشە سوپاس گوزارم
قەت بزر نابێ چاکەی جەنابتان
هەم برادەران دەزگای شەفەق
ڕێزو سوپاسم بۆ هەر هەموویان

---

[٢٥٧] - ئەم نامە شیعرییە بۆ کاك مەلا شاخەوان سەرنووسەری رۆژنامەی باسەرە لە دەزگای شەفەق لە کەرکووك نووسراوە دەربارەی چاپ کردنی دیوانی لوتفی لە ٢٠٠٦/١١/١ی.زایینی

## (سەرۆکی مەزن)([٢٥٨])

سـەرۆکی مـەزن وا هـاتم بۆ لات
دەروونم پڕە لـە هەزار ئاوات
زەمـانێ زۆرە من چـاوەڕوانم
پەککـەوتەو نامۆ ڕێگە نـەزانم
چی بکەم ئاشنای چاکم دەس نەکەوت
دەستم بگری بەبێ هەشـت و حەوت
بۆ لای جەنـابت خێـرا بمهێنێ
بەڵکوو پـەژارەو خەمـم نەمێنێ
پێت ڕاگـەیێنم مـوژدەی ئازادی
کە دەوری نـەما جـەورو بێدادی
لەگەڵ چەپکی گـوڵی گەشـی زەرد
پێشکەشی تۆبێ ئەی شێری نەبەرد
بڵێم کوردسـتان وا ڕزگـاری بوو
ئەگەر چی دەرد و زامـی کـاری بوو
ئەو دارەی کەوا تۆ ناشـتت بۆ کورد
قوربان ئەمڕۆکە بۆ مـان بەری گـرد
بە خـوێنی گەشی شـەهیدی وەتەن
وڵات ڕازاوە گشـت باغ و چەمـەن

---

[٢٥٨] - ئەم شیعرە لە بەرواری ٢٠٠٥/٤/١٦ی. ز. لەدێی بارزان لەسەر گۆڕی خوا لێ خۆش بوو پێشەوانی کورد بارزانی وتراوە.

کوردیش ئەمڕۆکـــــە چـاوی کراوە
چاوەڕێی شەوق و تیشـکی هەتـاوە
کوردستان کە مەڵبـــــەندی شـێرانە
وەك بەهەشـــــتە ئەو کـــەژ و کێوانە
خەفەت‌ومەینەت گشت بەسەرچووە
برین و خەمی کۆن ســــــارێژ بووە
ئیتر تۆش بەبێ خـــەم بۆ خـۆت بنوو
ئەی شاسوارەکەی ڕێـــی دووری ماندو
ڕۆڵەی نەبەزو بە ئەمـــــــەکی تـوو
لەسەر ڕێبازی تـــۆ دەڕۆن هـەموو

## (بۆ كۆچی دوایی مەلا سەید ئەحمەد)[٢٥٩]

رۆژگار وا دیســـــان خەم دەبارێنیٚ
رووحی زاتێكی مــــــەرد دەڕفێنیٚ

ڕووی ئاســـــمان ئەمڕۆ و تەواوی تەمە
لە دەوروبەرمان بــــــــــارانی خەمە

كڕێوە و تۆفان ســــەر هەولێری گرد
خۆشی و گوشادی هەموو لە ناو برد

هەواڵێكی زۆر تـــــــــاڵ و دڵتـەزێن
گەیشتە خزم و دۆست لە هەموو شـوێن

دەڵێن كۆچیكرد مەلا سـەید ئەحمەد
ئێمەی بە جێهێشت ئیتـر تا ئـەبەد

روحی گەیشــتە مەنزڵــــــگای باری
رزگار بوو لە نــــاو دونیـــای بێزاری

زاتێكی گەلیٚ مــــەردو هۆشــیار بوو
لە دین و دونیـــا زۆر ئاگـــەدار بوو

لە هــــەر بابەتیٚ ئەگــــــــەر بدوایە
كەس نەبوو لە راســـت ئـەو بێتە كایە

---

٢٥٩ - ئەم شیعرە بە هۆی كۆچی دوایی خوالێخۆش بوو جەنابی مەلا سەید ئەحمەد سەید محەمەد ئەمین (باینجووی) كە بە مەلا سەید ئەحمەدی فەیلەسوف بەناوبانگ بوو لە ٢٠٠٥/٥/١٠ ی. زاینی وتراوە.

لەناو زاناکان کـــوردســـــتان هەموو

ئەو بە فیلەســـووف ناوبانگی هەبوو

وەك شـــــاگوڵێ بوو لـە نـــاو ئەم دینە

خۆشی و جـــــوانی دەدا بەم ژیــــنە

هەر شتێ کـــەوا گیرو عاســــــی بوو

مەسەلەی شـــەرعی بۆلای ئەودەچوو

قوربان لێی بنوو بۆ خــــــۆت دڵنـــــیا

ئێمە لـــــە دوای تۆ موبتــــــەلای دونیا

(هەوری) دەنێـــری هەزاران ســـــڵاو

بۆ گیانی پاکــت وەك بۆنی گــــوڵاو

## (نامەیەکی شیعری)([٢٦٠])

برای بەڕێزم کـــاکە شێخ ڕەزا
ئومێدەوارم دووربی لــــە قەزا
هەمیشـــە ڕۆژگار لەگەڵ تۆ دابێ
ناحەزت هەردەم ڕووت و گە دابێ
هەر بەختەوەر بی تۆ لـــەم ژیانە
قەت توشت نەبێ جەوری زەمانە
ڕێزمان لەخزمەت تۆبێ هەموودەم
تۆ هەر لەیادی ئەی نووری دیدەم
هاوڕێی خۆشەویست نازانم ئاخۆ
بۆوەی پێتم وت چیت کردوە ئەتۆ
تا ئامادەی کـــــەم هۆنراوەکانم
بینێرم لەگــــــەڵ کورتەی ژیانم
گەر ڕاپەڕێنی بۆمان ئەم ئیشـــە
دیارە سوپاست دەکەین هەمیشـە
ئاگادارم کە تۆ لــــــە ئەنجامی
منیش ئامـــادەم زوو بۆ وەڵامی
لای (هەوری) دیارە جێگەی سوپاسە
بۆ دین و دونیا کاریَ زۆر خاســــــە

[٢٦٠] - ئەم نامەیە بۆ شێخ ڕەزای خاڵە شێخ سەید گوڵ بەرزنجی لە هەولێر لە ڕۆژی٢٢ /٦/٢٠٠٥ی. زایینی وتراوە.

## (مۆژده)

مۆژده بۆ ئـــەی لاوانی کورد
ئازادی هات جـــــەوری لابرد

بە خوێنی گەشی شـــەهیدان
شکاندی کەلـــــەبچە و زیندان

ئەمڕۆ کە کورد هەموو یـــەکە
خاوەن هێزو سوپـــــاو چەکە

بە هەوڵی پێشمەرگەی مـــەرد
بە خەباتی پـــــاك و بێگەرد

بە کرووزەی دڵ ســـووتاوان
بە فرمێسکی چـــــاوی ژنان

بەشەونخوونی و خوێن رشـان
هێزی دوژمن وەدەر نــــران

ئەمڕۆ کە وەك شێری مـــەزن
سەر بەرزە ناو دۆست و دوژمن

تکایە دەســــــتم بە دامان
هەلێکەو هاتـــــووه بۆمان

بە فێرۆ لە دەســـتی مەدەن
بە فێڵی دوژمنی بۆگـــــەن

تا دەتوانن یەکتر بگـــــرن
بەڵکوو دەبنە مـــــەردی مەزن

(هەوری) با دوژمنی نـــامەرد
ئەوسا ســــــەری بدا لە بەرد

٢٠٠٥/٧/١١

## (ئای کە ئەمڕۆکە)

ئای کە ئەمڕۆکە من زۆر نەخۆشـــم
مانەندی گێژو مەست و سەرخۆشم
دونیا لەبەر چاو من وەکوو تەمە
هەمیشە دڵم پڕ دەردو خـــــەمە
هەرچەند دەکـوۆشم هیچ چارم نییە
کەس فریای ناڵـــەو هـاوارم نییە
هەموو دەم کارم هەر لای دکتۆرە
بۆ لایان دەچم هـــەر ڕۆژ بە نۆرە
چەن جۆرە حـەب و دەرزیم لـــەلایە
ئەم ژیانەی مـــن هەروەك بـــەڵایە
مردن بە ئیمان دیارە زۆر خۆشە
بێگومان دڵم بۆی بە پـــــەرۆشە
دەمێکە لە ناو دەردا دەنـــــاڵم
ئەی پەروەردگار ڕەحمێ بەحاڵم
ئەو بارەی کەوا لەسەر شان منە
هەڵگرتنی وەك بـــــرای مردنە
تەنها هەر بە خۆت دەواو تەبیبی
ڕێی نیشاندەر و پەنای غەریبـی
ڕەحمێ بە حاڵم بکە بە قوربـــان
ژیانم هەموو لێ بۆتــــە زیندان

ڕۆژی سەدئاهی سەردهەڵدەکێشم

لەم ڕێگە دوورە بێ زاد و توویشم

قەت دەسگیرێکم بۆ پەیدا نەبوو

تۆزی تیمارکا زامـــم زوو بەزوو

ئەگەر ڕەحمی تۆنەبێ ئەی جەناب

دیارە گیرۆدەم بە دەردو عـــــەزاب

(هەوری)دڵ شادەبەوگفتەی ئەتوو

کە مژدەت داوە بەلا تـــــەقنەتوو

٢٠٠٥/١١/٢

## (له یادی لەیلا قاسم)[٢٦١]

لەیلا قاســـــــمی بەغیرەت
بۆ کورد ملی گەیـــاندە پەت

کرنـــۆشی بۆ دوژمن نەبرد
هەتاکوو ئەو کاتەی کە مرد

روحی قەدەم خێرو خانــزاد
بێگومان ئەمرۆ بووە شـــاد

تا رۆژگـــــار دەوری بمێنێ
ناوی هەر زینــدوو دەمێنێ

خوێنی پاکی رژا ســەرخاك
تۆقاندی دوژمـــــنی ناپاك

رێگەی تاریکی رووناك کرد
مژدەی رزگاری بۆ کورد برد

خۆی گەیاندە لای نەمــران
لەلایان زوو بوو بە میـــوان

میوانێکی زۆر ئازیـــــز بوو
لە ژیـــــــانی ئێرە زیز بوو

هەموو گەیشــتنە پێشوازی
وتیان ئیتر ســـــــەرفرازی

ناوت مەشـــخەڵی رێی ژیان
تاریکی برد بەرەو نەمـــــان

بەخوێنی تۆو ئێمەو هی تر
گەل رزگــــــاری دەبێ ئیتر

---

٢٦١ – لەیلا قاسم کچێکی قوتابی بوو لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە یەکیەتی قوتابیانی کوردستانەوە بوو لەگەڵ چەند هاورێیەکی تریدا لە بەرەبەیانی رۆژی ١٣/٥/١٩٧٤ی.ز لە بەغدا لەلایەن رژێمی دیکتاتۆرەوە لە سێدارە دران، منیش بە هۆی ٣٠هەمینساڵیادیەوە ئەم شیعرەم لە ١٣/٥/٢٠٠٦ وتووە.

## (نامەیەکی شیعری بۆ کاك هۆشەنگ)

برای شـــیرینم بەرێز کاك هۆشەنگ
هەر لە شادی بی قەت نەبی دڵتەنگ
بە هیوام هەردەم تۆ کـــــامەران بی
لەوپەری خۆشی و شـــادی ژیان بی

لە کـــاروانی ژین هەر بەختەوەر بی
دوور لەبەڵاو شـەڕ فیتنەی خەتەربی
ئەگەرلە(هەوری) تۆش پرسیاردەکەی
زۆرچاکم سوپاس بۆ خالقی حــــەی
ئازیز کاتی خۆی تۆ وتت بەمـــــن
گەر جیٚ گۆڕت کرد ئاگەدار کە مـن
بردمە (بانە رۆژ) چــــــــوارینەکانم
کەچی زۆر دواکەوت داخـــــی گرانم
ناچار بوم چومە چاپخانەی ئاسیا
کە مەدحیان بکەم دوورە لە ریـــا
بە راستی پیاوی چاك‌و بە ســـوودن
چەن کەسیٚ کەوا لەویٚ مەوجــوودن
ئیتر بە شادی بژی کــاك هۆشــەنگ
ژیانت رووناك نەکـوو شەوەزەنـگ

٢٠٠٦/١٢/٢٩

## (پێنج خشتەکی ( هەوری ) لەسەر شیعریکی صابیری)(١)

دڵ مائیلی ســـــەیرانە لە ناو ئەو چەم و باغە
بەینێکە دووچاری خەمە شـــــێواوە نەساغە
وەك بولبولی بێچارە لـــــــە نێوان قەل و زاغە
ئــەو دولبەرە قەد عەرعەرە ئەو روو گوڵە باغە
ئارامی دڵ و جان و فەرەح بەخشی دەمـــاغە

شادی نییە هەر لەحزە خـەمو مەینەت دەبارێ
جان و دڵە سووتاوە نەما ســـــــەبرو قەرارێ
ئەی یاری ئەزیز ســـا وەرە تۆ بۆم بکە چارێ
هەروەختە دەرییێن دیدەو دڵ هەردوو بە جارێ
بۆ رووی گوڵ و زەنجی وەکوو سێوی مەراغە

ئازارم هەتاکەی بە مەسەل هەروەکوو زیـــوم[٢٦٢]
من ئاشقی رووی تۆم و لەناو عەشـــقت رزیوم
پـــــابەندی نیگای بوومە وەکوو تفلی هەتیوم
هاوارە بە شــمشـــێری برۆی جەرگی بریوم
چاوی بە ئیشـــــــــــارە دڵی هێنا لە بیناغە

---

٢٦٢ - بە مەسەل- بە چەشنی.

راحەت نییە لـــــــەم ئەرزە برا لێرەوە تا شام
ئالوودەی خەم بوینە بە جارێ هەموو ئەنـــدام
ژینێکی گەلێ پووچە ســـەراسەر خەم و ئالام
ئەم ماتـــــــەم و گریانەکە بۆتە مەزرەعە عام
تێ فکرە هەموو قور بە ســـــەرە سینە بە داغە

بۆ غیرەت و شەوکەت کە عەیانە وەکوو شاهی
بۆ پیاوی گـــــەدا دیارە کەوا پشت و پەناهی
لەم ژینە لەسەر رێگەی حـــەق دووری لەناهی
یارەب لـــــــــــــە ئافاتی بیارێزی بە جاهی
ئەو زاتە کە سوڵتانە لەســـــەر تەختی بەلاغە

بارخانەی خەم بڕوا لـــــە هیچ شوێنی نەمێنێ
هەردەم لە کنت بادی ســــــەبا شادی بچێنێ
ئەم مەینەتی رۆژگارە لە رووت سەر دانەوێنێ
تا دێری زەمان جەنتەتی رووخســـارت بمێنێ
سەد ناوی خودا چەن بە ســرووررو بە دەماغە

دێوانە سیفەت بەندە لـــــە نێو بەحری خەیاڵە
گیرۆدەی سەد دەردە ژیانی گـــــــــەلێ تاڵە
دووچارە دڵی (هەوری) برا بەو خـــەت و خاڵە
(صابیر)لەدەس ئەوشەو دزە دەرچونی مەحاڵە
شـــــــــەوخانە بڕو تەردەس خاوانی چراغە

## پێنج خشتەکی ( هەوری ) لە سەر شیعریکی( لوتفی)

کارم هەمـــــــــوودەم گریان و شینە
جەستەم سەرانســــــەر زامو برینە
عەقڵی لیٚ ساندووم ئــەو ماه جەبینە
خەیاڵم لەسەر کێوی ســــــــەفینە
گەر باوەڕ ناکەی وەرە بم بینـــــــە

لـــــە دووریت دەکەم هەر دادو فریاد
دڵـــــــم کەرە تیٚ قەت نەبوو گوشاد
هەمیشـــــــــە کەوتووم کزو ناموراد
فکرو ئـــــــارەزووم هەروەکو فەرهاد
بەرۆژو بەشـــــــــەو خاڵی شیرینە

بوهار پەیدا بوو دەشت دەر رەنگـــین
وا رزگارم بوو من لـــــــــە زارو شین
مەینەت باری کرد ناو دڵـــی خەمگین
ئیمرۆ لە شادیم دەم بـــــە پیٚـکەنین
وام لە نـــــــاو باخی گوڵو نەسرینە

گولاڵەی دەشـــــــت و دەر لە یەك ئالاٚ
خۆشی دەباریٚ ئەمــــــــرۆ لە هەرلا
کچ گەل لە ســــــارا سینگو مل والاٚ
وێردی زمـــــــــــانم چیرۆکی لەیلا
لە دڵ من وایــــــــــە ئاوێنەی ژینە

گەنجینەی دونیا گشـــت بە من بدریٚ
هەزار روو بە خالٚ گـــەر دەورم بگریٚ
سەد باخ و بێستان بۆ من بــــەرگریٚ
گەر بێت و چاوم لـــــــــە تۆ ببڕیٚ
بەشـــــــــم هەر مەینەت زارو گرینە

دەمێکە مەســــــتم بەو جووتە چاوە
شوعلەی رووی وەکو تیشـکی هەتاوە
لە ناکاو بینیم دلٚ پێی کـــــــــراوە
خەم لام باری کرد شــــــادیم گەشاوە
باخچەی گولاٚلـــــەی دەورم پەرژینە

بێگـــــــــومان ژینی مرۆڤ چەند تاوە
هەر لـــــــــە ناکاویٚ بینیت تەواوە
بۆچی وا (هەوری) باوشـــت لێی داوە
(لـــوتـــفـــی) بزانە زۆرت نەماوە
ئیمڕۆکەت وەکوو رۆژی پێشـــــینە

٢٠٠٧/٩/١٥

## (پێنج خشته کی ( هەوری ) له سەر شیعریکی( لوتفی) )

هۆشی بردووم ئەو دەمـــەی وا ســـینەی والاّ ئەبیٚ
هەر کەسیٚ تر بیٚ له جـێی من بێگومان شـەیدا ئەبیٚ
جوانی لەم جۆرە بە تەنهـا هەر له کاری خـوا ئەبیٚ
گەردنی نەقشی بلووره ســـەنعەتی حەق وا ئەبی
هەر له گۆشت خوێنی ئینسـان شەوچرا پەیدا ئەبیٚ

تا بڵێی زۆر شۆخ و شـــەنگ و دولبەرو شیرین لەبە
قامەتی هەروەك سەروو روخســـاری ماهو کەوکەبە
جەرگی دەبڕیٚ زوو بەنیگای هەرکەســی لای مەتڵەبە
گەرچی مەوسووق عەقڵ مەشهووری عیلـم و ئەدەبە
یەك نەزەر بەسیە له بۆ عاشق له ژین ریســوا ئەدبیٚ

چی بڵێم ئەی خونچەروو دڵ زۆر دەمێکە وا لـــەلات
تۆ کە مایەی زیندەگیمی هەروەکو ئاوی حەیـــات
کەوتمە نێو زیندانی حەسرەت من له بۆ خاڵی گۆنات
تۆ بزانە پێت بڵێم گەریەك ئیشــــارەت بۆ بکات
تووشی عیللەت سارییەو دەردێکــی بیٚ هەمتا ئەبیٚ

یەك نیگاهێکی منی واکردە دێوانــــــە و ئەسیر
هەڵدەکێشم ئاهی حەسرەت دڵ برینــــدارو زویر
خەم هەمیشە ئاشنامە رۆژو شەو هەر گۆشــــەگیر
چاوەکانی هەڵێناوە وەك شـــــەهێنی دوای نێچیر
دڵ وەکوو دووراجی مەسکینە لـــــە ترسا وا ئەبیٚ

بادەی عەشقم زوو نۆشی تازە نـــــــاوم دێتە ناو
گیرۆدەی تیری جوانێکم بڕی جـــــــەرگ و هەناو
ڕۆژی ڕوونم وەك شەوە حاڵم پەشـــــێواوە تەواو
من لە دەستی خۆم نییە دڵ تەیرە وا کـــەوتۆتە داو
هەر کەسێ تر بێ ئەویش وەك من لەرێ سەودا ئەبێ

مەیلەکەت بۆچی لەگەڵمان ســاردە هەردەم ماهجەبین
ڕووبەڕووی ئەغیار هەمیشــــە تۆ بە خەندەو پێکەنین
فیتنەی جوانیت بە جارێ عاشقانی خستە شـــــین
ڕوو لە هەر شوێنێ بکەی وەك شیرینی ئەرمەنشــین
عالەمی وردو درشت پڕ شۆڕش و غەوغـــــا ئەبێ

جاهی خەم هەردەم لە شانم خەســتە حاڵ و بێ نەوا
من لە کوێ دەرمانی دەردی دڵ بکـــــەم پەیدا کوا
(هەوری) بەڵکو بایی ڕەحمەت بێتو گـەردی دڵ بشوا
چارەی دەردی دڵت ناکرێ بە من (لوتفی) بەخـــــوا
ڕۆژی ئەوەڵ بەختەکەت چۆن بووە ئێستاش وا ئەبێ

٢٠٠٧/٩/١٧

## (بۆ یادی چللەی عەقید قادر گلی)([٢٦٣])

ئاسمان وا دیســــــان خەم دەبارێنێ
نازداریێ ترمــان لێ دەرفێـــــــــنێ

ئەمڕۆ لـە ناکاو کاك قــــــادری مەرد
ئەو نـــەونەمامە خرایە ژێر عـــــــەرد

شۆڕە سواریێ بوو مەردو قـــــارەمان
رووحی هەڵفڕی بۆ بــاخی جینـــــان

پێشمەرگەی دوێنێو خەمخۆری ئەمڕۆ
لە مەیدانی شــەڕ وەك بازو هەڵــــــۆ

بەڕاستی ژیرو مـــــــــــەردو ئازا بوو
دوژمن لە ئاســتی پشتی شکـــا بوو

تێکۆشەرێکی رێگەی خەبــــــات بوو
رزگاری کوردی لــەلا ئـــــــاوات بوو

لە ناکاو فڕی وەك تەیری نامــــــــۆ
لە چاو بزر بوو روو لـــە شـــاخ و کۆ

بەخوێنی گەشی ئێوە بوو قوربــــــان
قەڵای زۆرداران لـــــــــە بن هەڵتەکان

بێگومان خوێنتان بەفیڕۆ نــــــــاچێ
ئەم دەســـتە رەشـــە رۆژێ هەر لاچێ

رزگاری دەبێ تەواو کوردســـــــــتان
ئەوسا روح ئێوەش دەفڕێ بۆ ئاســمان

برای ئــــــــــــازیزم بەبێ خەم بنوو
زۆر جـــەورت بینی رێبواری مـــاندوو

ئێمەش وا لــــە رێ هەموو دێین بۆلات
چاوەڕوانــــــمان بە برای هــاوخەبات

---

[٢٦٢] - بەهۆی یادی چللەی شەهید قادر محەمەد ئەمین گلی بەڕێوەبەری میرە پۆلیسی کەرکووك لە ٢٠٠٧/١٢/١١ ی.ز. وتراوە

## (ئەو زاتە)[٢٦٤]

ئەو زاتە ناوی کە پێشـــــــــەوایە
بەڵام بێگومان هەردەم لە دوایـــــــە
هەمیشـــە دەبەنگ وەکوو تریاك خۆرە
بێ ئاگای دین و کـاری دونیـــــــایە
هەر کەس بۆ کاری روو بکاتـــە لای
وای دەرەتێنێ تا هێزی تیــــأیــە
هیچ گوێ ناداتە حەق و ناحـــــــەقی
تەقەی سەری دێ لای وەکوو بــــــایە
بێ وەعدو پەیمان هەر ئەمڕۆو سبەی
راستی لەلای ئەو وەکوو عەنقایـــە[٢٦٥]
خەیاڵی هەروەك شـــــــەپۆلی دەریا
پابەندی کردووە هــــــــەم موبتەلایە
ئەوەندە دەڵێم ئینســــــانی وەك ئەو
زۆر دوورە بگات بە پلەو پــــــــایە

---

[٢٦٤] - ئەم پارچە شیعرە دەربارەی رەوشتی زاتێکی ناسیاری خۆم لە ٢٠٠٧/٥/١٦ی. زایینی وتراوە

[٢٦٥] - عەنقا: باڵندەیەکی خەیاڵی بووە

## (گوێم لێ بگرن)([٢٦٦])

گوێم لێ بگرن ئەی دوژمـنان     کەمێ بێنەوە ســـــەر خۆتان
یەك دوو قسەتان بۆ بکـــەم     پێتان بڵێم راســـــت و رەوان

دەمێکە چەوســــاوەو وێڵم     ئەم خاکە بەجێ ناهــــــێڵم
ئەم جـــارە دەستم بۆ بێنن     بە گولله سینگتان دەکێڵــــــم

من کوردم مێژووم روونــاکە     هی باپیرانمە ئەم خاکــــــــە
هەمـــوو جیهان چاك دەزانێ     کێشەکەم زۆر رەواو پاکــــــە

کـەرکووك شاری کوردستانە     لەرووی دوژمن وەك بورکــــانە
بێهوودە خۆتان گێل مەکـــەن     ئەم شتە روون و عەیـــــــانە

پەلامــــار کوردتان زۆر داوە     لووتان هەر لە بـــــەردی داوە
جارێ ســـەرکەوتنتان نەدی     هێشتا وازتان نەهێنـــــــاوە

چەنجا ئەم خاکەتان سووتان     هەزارانتان کوشت بێ تــــاوان
مێژووش لێتـــان بێزار بووە     پێشتر لە دەوری جەنگیزخـــان

---

[٢٦٦] - لە یادی چلەی شەهیدانی خۆپیشانەکەی شاری کەرکووك لە ٢٨ی تەمووزی ٢٠٠٨ی. زاینی وتراوە.

گەر ئێوە هۆشـــیارو ژیرن کەمێ خاوەن هۆش و بیـــرن
ئاوڕێ لـــــە رابردوو بدەن نەك وەك سەگی نیهان گیـــرن

کـــورد گەلێ شەهیدی داوە لە دوژمن قەت نەترســـــاوە
نەك ئەمجـــارە هەزاران جار خوێنی بە ناحـــــــەق رژاوە

لە یادتـــان چوو لە هندرێن سەدانتان چوو بێ سەرو شوێن
چۆن بوون بـە پەندی زەمانە ئێستاش برینتان لێ دی خوێن

ئەم جارە کـورد گەر راپەڕێ دەورێکی بێو ســـــەر هەڵبڕێ
بەپێی پەتـــی دەبێ راکەن هەتاکوو جەرگتان دەبـــــڕێ

تۆڵەی ئەمڕۆکە و هی دوێنێ لە گازی پشتتان دەردێـــــنێ
زۆرجا تۆبە تـــۆبەتان کرد ئەم جارە رەحم نانوێنـــــــێ

## (لە یادەوەری بارزانیدا)[٢٦٧]

ئەرێ بارزانی کێیە | کوانی هێمای لە کوێیە
یاران پێمی نیشاندەن | کوری مەیدان و گۆ بەن
بۆچی دەنگی بزر بوو | کوێ بگەڕێم لە دووی زوو
ئەو نەڕەشێرە کوردە | ئەوکەڵە پیاوە مەردە
ئەو هەڵۆ داڵ بەرزێنە | لەم رۆژگارەکەم وێنە
ئەوپێشە وا زۆر مەزنە | تانەی چاوی دوژمنە
لوتکەی قەندیل و هەڵگورد | جێی شانازی گەلێی کورد
رابەری کوردایەتی | کەم وێنە بۆ پیاوەتی
داڵدەی هەژار و مەزڵووم | لە رۆژ گاری رەش وشووم
گەلێ شەبەیخوونی کرد | دوژمنی تەواو قڕ کرد
هەزاران وەك گیقارە | لە ئاست ئەو کۆڵەوارە
یاخۆ کاستڕۆی توندرەو | حەدی کوا بگاتە ئەو
یا مارشاڵی وەك تیتۆ | دوژمنی کرد رەنجەڕۆ
ئەو پشتی هەبوو تەواو | کەی وەك ئەم بێ نانو ئاو
دەرگای ستالینی گرد | حاڵی کوردی بەیان کرد
قۆناخێ گەورەی بڕی | کورد سەری تیا هەڵبڕی
کە گەراوە کوردستان | بۆ خەبات وتێکۆشان
لە یادمە هەر ئەو شێرە | کەڕەتێ هاتە ئێرە

---

[٢٦٧] - ئەم پارچە شیعرە لە یادی ١٠٥ ساڵەی بارزانی دا لە ٢٠٠٨/٣/١ وتراوە و لە رۆژنامەی پەیامی کەرکووك ژمارە ( ٥٩ )دا بڵاوکراوەتەوە.

و تاری جوانـــی فـــەرمـــوو
وتی یەك بگرن هەمـــــــــوو

شۆڕش ئەیلوول بەرپـــابوو
هەر بەخۆی پێشەوا بـــــوو

کارێـــکی بـــە دوژمـــن کـــرد
با بە دەواری نەکـــــــــرد

زۆرجـــا لە میـــدانی شـــەڕ
کۆڵی دا دوژمنی گـــــــــەڕ

لە زۆر شوێن وەك هنـــدرێن
جەرگی دوژمن بوو بەخـــوێن

ئەمـــڕۆ کـــەش یادی ئـــەوە
بەسە ئیتر ئەم خـــــــــەوە

ئەگـــەرچـــی ئـــەو نـــەمـــاوە
ڕێبازی پارێـــــــــــز راوە

## (نامەیێکی شیعری)([٢٦٨])

بۆ خزمـــــــەت برای ئازیـــزو ڕێزدار
مامۆستا عوسمان بە موفتی نــــاودار

پێشەکی سلاویەکـــــــەم لــــە ڕێوە
بەر لە هەمووشـــــــت بۆ خزمەت ئێوە

بە هیوام هـــەردەم دووربی لە تـــــاڵـی
یاخوا هەر شادبـــــــی تۆ قەت نەناڵی

هەر گەشاوەبی وەك لالـــەی بوهـــــار
سەردانەوێنیٚ لە ئاســــــــتت ئەغیار

هەردەم لـــە خۆشی و سەیری گوڵزاربی
دوور لەچـــــەپۆکی جەوری ڕۆژگار بی

قوربان ئەگەر تۆش دەپرسی لـــە مـــن
زۆرچاکم ســـــوپاس بۆ خودای مەزن

ئەنجا بابێمە ســـەر باســـــــێکی تـر
چەن پارچە شیـــعری جاهیدی شاعیر

وا لەلای منە ئەمـــە چەن ســــــاڵە
چاوەڕێی هەڵیٚ من دەکەم خـــــــاڵە

بەڵکوو چاپی کەم بۆ ئەدەب دۆســـتان
تا ڕزگاری بیٚ لە چەنــــــــگی نەمان

---

[٢٦٨] - ئەم نامەیە بۆ بەڕێز کاك عوسمان موفتی دەربارەی چاپکردنی کۆمەڵیٚ شیعری بلاونەکراوەی ( جاهید ) ی شاعیر کـە لە کاتی خۆی ئامادەم کردبوو بۆ چاپ. کەرکووك ٢٠٠٨/١٢/٢١.

بەڵام بڵێم چی ڕۆژگـــــاری بەدخـــوو
قەت جاری بۆ من فرســــــــەتی نەبوو
ئێستاش جەنابت کــــە گوفتـــــت داوە
نازانم ئاخـــــــــــــــۆ لەیادت ماوە
ئەوا دەینێرەمە خزمـــەتتـــان قوربان
باکە مێ شادبـــــێ رووحی کاك بورهان()
ئـــــــەوەی کەماوە لەبەر هەمی ئـــەو
من نایگۆڕمەوە بە گەنجی خوســـــرەو
چونکە لەلای من خەیلی بەتـــــامـــن
لابەری خەم و ئازاری زامــــــــــــــن
بە هیوام لە ڕۆژگاری داهـــــــــــاتوو
بەهەوڵ و کۆشش پیاو چاکی وەك تـوو
گشــــــــت شیعرەکانی کۆبکرێتـــەوە
بە شێوازی جوان بنوو سرێتــــــــەوە
وەکوو شاگوڵی ناو باخچـــەی ئـــەدەب
بدرەوشێتەوە وەك ماهو و کـەوکــــەب
لە کۆتاییدا ڕێـــــــــــزم دووبـــارە
(هەوری) هەمیشە سوپاس گــــــوزارە

# بەشی چوارینەکان

((١))

دڵ بـــەدونیا خـــــۆش مـــەکە غـــافڵ هەتا ماوە ژیان
چـــــونکە تۆ میوانـــی تێدا ئاگاداربـــــە ماڵ وێـــران
پێنـــج ودوو رۆژێکە دونیا میسلــــــی خەون وسێبەرە
لــــــەم گوزەرگاهـــە کەسێ رزگـــاری نابـــێ بێگومـان

((٢))

ئەرێ ئەی شۆخی چاومەست تۆ هەتا کەی جیلوە بازیتە
سووتانت جەرگ و دڵ دیارە نیشانەی بەد نیازیتـــــــە
ئەگەرچی رووت وەکوو ماهە لە بۆ من تارو پەنهــــــانی
لە بۆ غەیرەش هەموودەم روو بە خەندە و سیـــنە وازیتە

((٣))

بەشەو دووچاری سەددەرد گۆشەگیری کونجی ئەحزانم
بەرۆژ وەك تـــەیرێکی نـــامۆ پـــەراگـــەندەی بیابانم
لە ناو ئەم عومرە چەن رۆژە هەزاران خۆزگە پەنهانـــە
منیش لەم بەحرە بێ حەدە لە ناو گێژی پەرێشـــــانم

((٤))

ئـــــەم عەشقە هەوای رووی تۆوە وا داوییە لـە کەللەم
رووحـــــم بە فیدات سەروەرم ئەی ســــەیدی عالــــەم
گـــــوڵ مل کەچ و بـــێ شەوقە لە راست نوری جەماڵت
جـــێی فـەخری لـــە دونیاو لـــە عوقبا بە هـــەموو دەم

١٩٩٦/١٠/٣

((٥))

شـــــوكر بۆ خوا لەبەرچـاوم کـە دونيـا پوولێ ناهێنێ
دەزانـــــم ســـەروەتی بۆ کەس هەتا ســەر نەبوە نامێنێ
مـــــنەت باری کەســــێ نیمە لـــە دونیا حـوڕو سەربەستم
ئـــەگەرچی گێژەلۆکەی رۆژگار ئـــــازارو خـــــەم دێـنێ

((٦))

گـــــەلێ دڵـــگیرە ئەمڕۆکە عەجەب ئەم شاری کەرکووکە
دەبینـــم بـــەفرە باریوە ســـەراپا ســــــــپیە وەك بووکە
بـــوهارو پایـــزو زستان هەمـــوو وەرزێـــکی زۆر خـــۆشە
وڵاتـــیکی ســـەفا بەخـــش و جەفا ریســـــواو مەهتووکە

((٧))

بـــاوەگوڕگوڕ گڵپـــە دەکا و جەرگی دوژمن دەسووتێنێ
لاوی مـــەردی راپـــەڕیوە خوێنی گەشــــــی دەڕژێنــێ
دارو بـــەردی ئــەم خـــــاکە وا گـــڕێکی گرتـــووە ئەمڕۆ
تیشـــکی ئازادی وا هـــەڵات دوژمنی گــەوج دەتـــۆقێنێ

کەرکووك – ١٩٩١

((٨))

رەونـــــەقی چـــاوی هەمـــوو ساداتە ئەو کاك ئەحمەدە
هیمـــەتـــی دەفـعی بەڵاو ئـــافاتە ئـەو کــاك ئـەحـــمەدە
جێـــگەی شـــــانازییـــە بـــۆ میللەتی ئیـــسلامی کـورد
ســــــەروەرە تـــاجی ســــەرە ئـــەو زاتە ئەو کاك ئەحمەدە

((٩))

کورد وەکوو شێری نەڕە هەر کاتێ بێتوو ڕاپەڕێ
دوژمنی خوێڕی مەحاڵە خۆی لە پێشی ڕاگرێ
ڕۆژگار زۆرجا گیرۆدەی کرد لە ناو گێژاوی خۆی
ڕۆژێ دێ تەوقی دەس و پیێ خۆی بەجارێ لابەرێ

((١٠))

بڕوانە لارو لەنجەی پەری ڕوخساری لادێی
دەڵێی کارمامزی دەشتە کاتێ لەسەردا کەدێی
بێ سوورمە چاوەکانی گەلێ گەش و جوانە
بینیدنی بەبێ گوومان دەوایە بۆ گشت دەردیێ

((١١))

چی هەیە لەم ژینە تاڵە غەیری ئازار و خەفەت
ڕۆژو شەو تێپەر دەبن عومریش دەچێ بۆ ئاخیرەت
قەت لە بۆ سامانی دونیا خۆت مەخە گێژاوی خەم
ڕزقی تۆ دیاری کراوە بۆی مەبە قەت ناڕەحەت

((١٢))

لە ئێوارەی بوهارانە چریسکەی خۆر گەلێ جوانە
وەکوو زیوی سپی وایە کە قەترەی ئاوی بارانە
لەلایێ کۆڵکە زێڕینە لەلایێ ئاسمانی شین
لەگەردنیا دەڵێ ملوانکەی یاقووت و مەرجان

((١٣))

یـــار بە لەنـــجە تێپەڕی جەرگی ســـووتاندم وەك تەننوور
شـــۆخ و شـــەنگ و نازەنینە گـــەردنی چەشـــنی بلوور
وەســـفی جـــوانی زۆر مـــەحاڵە سەد وەکو (ناڵی) دەوێ
پـــرچی زەردو کوڵـــمی ئاڵ و لێـــوی وەك گوڵناری سوور

((١٤))

لـــەحزەیێ بێ خـــەم نەبووم لە ژینـــە قەت نەمدی نەجاح
موبتەلام هەردەم بە وێنەی شەرکەرێـــکی بـــێ ســـیلاح
گـــەردەلوولی ڕۆژگـــار گێژم دەدا بێ ویســـــتی خـــۆم
مـــن لـــەتاو دەردی دەروون کەوتوومەتە تـــاڵەو سیـــاح

((١٥))

کـــــــەی بێ لێمان دەرکـــــەوێ هـــەتاوێ پڕ ئازادی
ســـــاڕێژ بـــێ ئێشـــــی ســـــەختی بـــرینی نـــامرادی
خـــۆشـــی و شـــادی بـــەجـــاری ئـــــەم خاکە بـــگرێتەوە
بـــــرواو مـــــلی بشـــــکێنێ ئیـــتر دەوری بێـــدادی

((١٦))

هـــــاتە وە یـــارم لە ســـە ردا دەم بە خە ندە و پی کە نین
نێـــرگزی شـــــە هلا لە ئاستی کـــە وتووە مات و حە زین
ئـــــە و لە ئە و جـــی شادوما نی و خوشیا دێـــت و دەجی
بـــێ خە بە ر لە حالی من هە ردەم لە نـــاو گـــریان و شـــین

((١٧))

شـــــاگولی ناو میرگ و باخـی یاگـولاله ی گوی رووبـــار
گردنـت مێنای ســـــافه بـــه ژن و بــــالآت وەك چنـــار
پــەر چەم وتیری نیگات وا تووشــــی ســـەودای کــــردووم
رۆژو شــە و دوو چـاری دەردم لام نه مـــــا سەبرو قــەرار

((١٨))

مەســـــــت و بێهۆش بووم زەمانێ کەوتمه ناو گێژی فەنا
چابوو هۆشـــــیار بوومەوه لەو حالەته تیاچــــــووم دەنا
له خەوی غەفلەت که هەلسـســـــام، چاوەکــــــانم کردەوه
روو لەدەرگای زاتی حەق کەم، هەر ئەوه پشـــــــتو پەنا

((١٩))

وا به فیتــی پیاوی نامەرد بەســـــــــتراوه دەستو پێم
من له تـــــــاو ئازاری رۆژگــــــار نازانــم بۆ کوێ هەلێم
چاوەڕوانی قه وەو خوێشو دۆســـــــــتو ئەحبــابم نیه
نامه وێ هاوکــاری هیچ کەس روو له دەرگای حەق دەنێم

(( ٢٠ ))

ئاسکیــی سەحــرا ی چیینی یـا گــوڵاڵـەی بــاخ و چه م
زور درێـــژه باســـــی جوانیت وەك شه وی یــه ڵداو خه م
بۆ چی لیمْ دووری ئه زیزم ئاگـــرت جه رگی ســـــــووتان
تا بــه که ی من هـــه ر بکێشم ئاهو حه سرەت خونچه دەم

<u>مولازمی یه کی پۆلیس ئەردەلان شێخ عوبێد بەرزنجی</u>



کێ دەڵێ ئەو ئەردەلانە شێرە ئەمڕۆ مردووە
نووری دیدەی شێخ لەتیف تەنها لە دونیا دەرچووە
والە گەشتیە ئەزیزان ئەولە خزمەت زاتی حەق
خۆ بەنەصی ئایەتی باری شەهید هەر زیندووە

ئەم چوارینەیە بەبۆنەی شەهید کردنی مولازمی یەکی پۆلیس ئەردەلانی کوڕم ووتراوە ،کە لەلایەن دەستێکی چەپەڵێ تیرۆرستانەوە لە ڕۆژی ٢٠١١/٥/١٩ لە شاری کەرکووک بەر تەقینەو کەوت وەلە ٢٠ ی ئەومانگ لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی ڕۆژئاوا لە هەولێر گیانی لەدەست داو گەیی بەکاروانی شه هیدانی کوردستان هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی بێت.

باوەگورگورِ گڵپـــە دەکاو جەرگی دوژمن دەسووتێنێ
لاوی مـــەردی راپـەڕیوە خـوێنی گـەشی دەڕژێـنێ

دارو بـــەردی ئەم خاکـە وا گڕێکـی گرتـووە ئـەمڕۆ
تیشکی ئازادیَ وا هەڵات دوژمنی گەوج دەتـۆقێنێ

٣٠٠٠ دینار

چاپخانەی رۆشنبیری